# بەهاری ڕەوانبێژی

## واتاناسی - ڕوونبێژی - جوانكاری

دانانی
موحسین ئەحمەد مصطفی گەردی







نـــــــاوی کتێــــــب: بەهاری ڕەوانبێژی
(واتاناسی– ڕوونبێژی– جوانکاری)
دانـــــــــــــــانی: موحسین ئەحمەد مصطفی گەردی
نەخشەســــــازی ناوەوە: کۆمپیوتەر (کامران رفیق)
ســــــــالّی چـــــاپ: یەکەم ٢٠١٣ز
ژمـــــارەی سپــــــاردن: (٢٧٣)ی سالّی (٢٠١٣)ی پێدراوە.

# سوپاس و پێزانین

پڕ بەدڵ سوپاس بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی یارمەتیان دام  لە هەڵەچنی و لەڕێنمایی خوا سەرکەوتوویان بکات لە هەردوو دنیا .

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ ٱلرَّحْمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ ﴿٣﴾ عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ ﴿٤﴾ ﴾ الرحمن: ١ - ٤

## بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان

سوپاس و ستایشی زۆری لەبن نەهاتوو بە ئەندازەی دەریای ڕەوانبێژی قورئان، گوتراو بە زمانی کە سانی لە تۆنزیك بە دڵ و گیان،نووسراو بەخامەی شاعیرو ڕۆشنبیرانی دڵ پر لەئیمان،وشە ناسك و شێواز جوان،بۆ تۆ ئەی خودای بەخشندەی ڕێگای ڕوونبێژی و،ڕاست بێژی و جوانکاری بۆ هەردوو جیهان، خوایە دروودی زۆری بێ پایان، بڕژێ بەسەر ئەو پێغەمبەرەی کەئیعجاز و ڕەوانی قورئانی بۆ ببوو بە پشتیوان، توانی بە واتای بەرزو بەواژەی پاراو و جوان.بەهاری ئیسلام بکات بەدیاری برایەتیی و تەبایی و نەمانی تاوان. خوایە هەمان ئەم درووده بباریێ بەسەر هەموو ئەو پێغەمبەرانەی کەگیان بەخشانە ڕووناکی ئیمانیان دانا لەجێگای تاریکی بڕوای پووچەڵی کەسانی نەزان. خوایە دروودی زۆرت بباریێ بەسەر ئەو یارویاوەرانەی بۆ گەیاندنی تیشکی ئیسلام بۆ دوور ترین شوێن بە پشتیوانی خوای تاك و تەنهای میهرەبان. یەك لەو شوێنانەش کە ئەم تیشکەی بەرکەوت کوردستان بوو نیشتمانی خۆشەویستمان،خوایە ڕزگاری بکەی لە پارچە پارچەیی و دەست بە سەری و، لەخۆپەرست و گیرفان پەروەران،خوایەبمانکەی بەگەلێکی سەربەخۆ و زانست پەروەر و یەکترگرو پێشکەوتوو بۆ ڕاستی و برایەتی و خۆشەویستی قەلەم و کوردستان.

# پێشەکی

ئێمە لە کاتێك کەبەوردی لە هونەری ڕەوانبێژی دەڕوانین، دەبینین ئەم هونەرە تایبەت نییە تەنیا بە ئەدەبی گەلێك،بەڵکو هونەرێکە هەموو زمانێك تیایدا هاوبەشن،کوردیش وەك هەر گەل و نەتەوەیەك جێگای خۆی لە نێو ئەم هونەرە دا کردووتەوە بە پێی ئەم تایبەتمەندییەی کە لەو زماندا بە کارهاتووە،بۆ ئەمەش دەتوانین ئاماژە بە ئەدەبی فۆلکلۆر و بەشەکانی و قسەی نەستەق و چیرۆك و شیعرو ئەفسانەو زۆری تریکەین، بەتایبەتی ئەدیب و شاعیرە مەزنەکانمان توانیویانە زۆر بە لێهاتوویی شیعرەکانیان پێ برازێننەوە، بێگومان ئەم جۆرە داهێنانەش لەروخساری زمانی کوردی کارێکی ئاسان و سادەنەبووە، بەڵکو بە تواناو ماندوبوونی قوتابخانەی کەسانی شارەزاو لێهاتوو دروست بووە، شاعیرە مەزنەکانی وەك خانیێ و جزیری و مەولەوی و نالی و سالم و مەحوی و زۆرانی تر، دەوری بالآیان لەم بوارەدا هەبووە، ئەم شاعیرانە لەگەڵ ئەوەی کە مەلاو زانای چاك بوونە، شارەزایی تەواویشیان لە زمانی فارسی و شیعری شاعیرانی ناوداری فارس و، عەرەبدا هەبووە، ئەمە بوو وای کرد کاریگەری زۆریان هەبێ لەپێگەیاندنی هونەری رەوانبێژی.دەرکەوتنی ئەم هونەرەش بەچڕو پڕی لە ئەدبی کوردیدا کارێکی ئاسان نییە،بەڵکو پێویستی بە هەوڵدانێکی زۆر بووە، ئەوەی لێرە هەژی گوتنەو پێویستە ئاماژەی بۆ بکەین، ئەم پرسیارانەن: بنەماو یاسای ئەم هونەرە لەکوێ سەر هەڵئەداو چۆن بەرجەستەبوو؟ وەك زانست چۆن بەسەر دەقە هونەریەکان جێبەجێ دەکرێ؟ دەبێ هەمان زانستی ڕەوانبێژی عەرەبی وەرگیراوو وەرگێڕدراوبێ، کورد بەسەر ئەدەبەکەی خۆی جێبەجێی بکات؟یان زانستێکە بوونی خۆی هەر لە کۆنەوە هەبووە بەوەرگرتنی لە ئەدەبەکەی

خۆی؟ بۆ وەلاّمی ئەم پرسیارانەو پرسیاری هاوشێوە((گەلێ قانون و پێڕەوی گشتی هەیە دەکرێ بەبالآی هەموو ئەدەبێك ببڕێ. مەجاز،کینایە،تەشبیە،ئیستعارەو هونەرەکانی بەدیع و گەلێکی تر لەبابەتەکانی بەلاغە، لەهەموو زمانێکدا هەن و بەکار ئەهێرێن.. ئەوەندە هەیە ئەبێ وریای ئەوەبین بە جۆرێکی وا بەسەر بابەتی زمانی خۆمانیاندا پراکتیکە بکەین خاسیەتەکانی ئەدەبەکەمانمان لەیاد نەچێتەوە، نموونەیان لەناو جەرگەی ئەدەبەکەی خۆمانەوە بۆ بهێنینەوە، ئەم زانستەبەلاغە عەرەبییەی کەئێستا لە قوتابخانەکاندا ئەخوێنرێ پێشانیش لەحوجرەکانی مەلاو فەقێیاندا باوبووە گەلێ قانوونی گشتی وای تیایە ئەکرێ بۆ شی کردنەوەی تیکستی ئەدەبی لە هەر زمانێکی تردا بەکار بهێنرێ))[1]

زانایانی ڕەوانبێژی عەرەبی زانستی ڕەوانبێژیان لە خودی دەقە هونەرەکانیان بەرجەستە کردووە، لە دوای ماندو بوون و بەدوادا چوونێکی زۆر، ئێمەی کوردیش هەمان ئەم زانستە لەدەقە هونەریەکانی خۆمان دەبینین دەتوانین وەك ئەوان بەرجەستەی بکەین و سوودیش لە هەولّەکانی ئەوان وەربگرین، هەروەك ئەم زانستە ڕەوابێژیانەی کە لە لایان چەند ئەدیب و زانای کورد بەرهەم هاتووە، سەرچاوەی دەستکەوتی زانستی ڕەوانبێژی ئێمەش،فۆلّکلۆرو شیعری شاعیرانی لێهاتووە، هەروا ئەو شاعیرانەی کەسۆفی بوون و پەیوەندییان بە شاعیرە سۆفیەکانی میللەتانی دراوسێوە هەبووە، زۆر لە هێماو ڕەمزەکانی ئەوانیان بە شارەزایی بەکار هێناوە، هەروا ئەم زانستە چۆن لە دەقە ئەدەبییەکان وەردەگیرێ لەو

---

[1] لەڕێگای ئەدەب و لە پێناو نالی دا(محمد) ی مەلا عبدالکریمی مدرس ل٣٣٥

هێماو وێنەو تابلۆیانەش وەردەگیرێ كەبۆچەند مەبەستێكی تایبەت ئامادە دەكرێن، وەك بۆ ڕێكلام و بە هێزی و بێ هێزی و چاكی و خراپی و جوانی و خێرایی و زۆری تر.ئەمانەی كەباسمان كردن هەموویان بابەتی ڕەوانبێژین،كەسانی شارەزا دەتوانن ئەم زانستە لەم جۆرانە بەرجەستەبكەن و بیكەن بەپێڕەوو یاسا بۆ كەسانی تر، بۆ ئەوەی فێری بن و، بتوانن بەسەر دەقـەكـان جێبەجێی بكەن، كە وابێ ڕەوانبێژی دەبێ بە زانست لەو كاتەی لە شێوازی تیۆر (نظر)ی دابێ، دەبێ بە هونەر لەو كاتە لەشێوەی كارو پراكتیك دابێ، رەوانبێـژی كەبەم شێـوەیە گرنگ بێت، گرنگییەكەی بۆ چـوونە نـاو بازنەی بەرفرەوانی ئەدەبە،بۆ گەیشتن بەو تام و چێژەیە كە لەدەقە ئەدەبیەكاندا هەیە، بێگومان ئەمەش كارێكی ئاسان نییە، زۆر جار وادەبێ كەسێك زانایە بەم زانسـتە، بەلاّم بێ بەشە لەلایەنە هونەریەكەی وەك كار و پراكتیك،بۆیە كە

خۆمان فێری یاساو رێساكانی دەكەین دەبێ ئەم یاساو رێسایانە لەسەر دەقە ئەدەبیەكان جێبەجێ بكەین بەكارو كردەوە،ئەمەش هەرچەندە زۆر زەحمەتەو ماندوو بوونمان بۆ دروست دەكات، بەلاّم گەیشتن بە هەنگوین بێ چزوی هەنگ نابێ .

پێش ئەوەی بچینەنێو بابەتەكانی ڕەوانبێژی - واتاناسی، ڕوونبێژی،جوانكاری - دەبێ بزانین ڕەوانبێژی گۆڕەپانی كاری ئەم هەرسێ بابەتەیە بۆ یەكخستن وڕێكخستنی دەربڕین بەشێوازێكی جوان و گونجاو لەگەڵ باری پێویستی گوێگرو خوێنەر، دەركەوتنی ئەم شێوازەش دەبی بە بوونی هەماهەنگی ئەم هەرسێ بابەتەبێ، ئەگەر هەماهەنگی لە نێوانیاندا نەبوو گوزارشت و دەربـڕیـن هەموو لایەنەكی جوانی و لەباری بەدەستەوە نادات، گەیشتنیش بەبنەماكانی ڕەوانبێژی بەستراوەتەوە بەخوێندن و

خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوەو بەدوادا چوون، بۆ ئاشکراکردن و ڕوونکردنەوەی جوانی و لەباری گوزارشت و دەربڕاوەکان،بێگومان گەیشتنیش بەرێگای ڕاست و ڕازاوە بۆ هەر دەقێکی هونەری ڕێگایەکی تری ڕۆشنبیری ڕەخنەگرو کەسانی ئەدیبە.

ئەوەی ماوە ئاماژەی پێ بکەم بۆ ئەم نووسراوەم پشتم بە چەند سەرچاوە یەکی گرینگی ڕەوانبێژی عەرەبی بەستووە هەوڵی ئەوەشم داوە کەیاسا گشتییەکانی بگونجێنم لەگەڵ نموونەی دەقەکانی هەندێك لە شیعری شاعیرە ناودارەکانمان لە هەمان کاتیشدا سوودم لە چەند سەرچاوەیەکی ڕەوانبێژی کوردیش وەرگرتووە، ئەنجامدانی ئەم کارەشم، تەنیا بۆ ئەوەبوو کەمێك شارەزایی لە دەریای ئەم هونەرە پەیدا بکەم،بتوانم لەدەرگای ئەم زانستە بگەم بەگوڵزارو روخساری هونەری ئەو ئەدیب و شاعیرانەی کە بە هزرو بیرو دەستە ڕەنگینەکانیان توانیویانە زۆر سەرکەوتووانە وشەکانیان بکەن بەگوڵ بەگریان بەئاگر.

ئیتر داوا لەخوای تاك و تەنیا دەکەم ماندوبوونم بێ ئەنجام نەبێ و، سوودی بۆ کەسانی تریش هەبێ و،کەلێنێکیش لەکتێبخانەی کوردی پربکاتەوە.

محسن احمد مصطفى

بەحرکە

٢٠١٢/٧/٢٠

# ڕەوانبێژی

ڕەوانبێژی: دەربڕینی ماناو مەبەستە بە وشـەی ڕەوان و گونجاو لەگەڵ باری پێویستی کەسی بۆ وتراو. [1]

پێناسەی ڕەوانبێژی بەم شێوەیە، چەمکی ئامۆژگاری ئەو کوردەیە کە بۆ قسە ڕەوانی کوڕەکەی دەڵێ:((قسەبگێژە بیبێژە بیوێژە)) [2] واتە:ئەگەر ویستت قسە بکەیت دەبێ قسەکەت وەکو چۆن گەنم لە پێشدا لە سەرەندو لە دوایی لە بێژینگ دەدەی بۆ ئەوەی گەنمە کە پاك و پوخت بێ، بۆ لە ئاشکردن و کردنی بە ئارد، بە هەمان شێوە دەبێ قسە لە پێش دەربڕین و دەرچوونی لە دەم، پاك و پوخت بکرێ بۆ ئەوەی شایستەو جوان و گونجاوو لە باربێ،کە قسەکردن لای کورد بەم جۆرەبێ دەبێ کورد قسەی ڕەوانی هەر لە کۆنەوە لا مەبەست بێ،کە وابێ سەرچاوەی ڕەوانبێژی لای کورد لە ئەدەبی فۆلکلۆری خۆی بەرجەستە دەبێ، ئەم ئەدەبە فۆلکلۆریەشی ئەدەبێکی خاوەن بەهاو بە پیت وکاریگەرە.باسیل نیکیتین لەم بارەوە دەڵێ:((ئەدەبی کوردی لەپلەی یەکەمدا فۆلکلۆری کوردیە ))[3].

ئەوەی لێرە شایانی باسە و لەم پێناسەیەدا بۆمان دەردەکەوێ هەر گوزارشت و دەربڕینێك بە شێوەی ڕەوانبێژی بێ دەبێ داڕشتنەکەی بە وشەی پاراوو ڕون و ئاشکرابێ،لەسەر زمان خۆش بێ و ئالۆزی تێدا نەبێ و، پاك بێ لە هەڵەی ڕێزمانی، وشەکانی زیندووبن، لەو وشانە بن کەخەلك

---

[1] علم المعاني (د. بیسیوني عبد الفتاح فیود) /٣٩

[2] دەقەکانی ئەدەبی کوردی ( علاء الدین سجادی) /١٥٩

[3] هونەری ڕوانبێژی لە شیعری نالی دا ( عبد السلام سالار ) /٢٧

پێیان ئاشنایە،لەهەمان کاتیشدا دەبێ لەگەڵ باری پێویست و کەسی گوێگرو خوێنەر بگونجێ،چونکە گەیاندنی مانا بە شێوەیەکی جوان و ڕوون و کاریگەرو گونجاو لەگەڵ شوێن و کەسانی گوێگر خۆی لە ڕەوانبیژی دەبینێتەوە،کەوابێ کەسانی ڕەوانبێژ پێویستیان بەو واژەو شێوازانەیە کە گوێی بۆ ڕابگیری و کاریگەرو پەیوەندیان بە بەباتەکەوە هەبێ، ئەمەش واتەکەسی ڕەوانبێژ وەك نیگارکێش وایە هەر چەندە کەرستەکانیان جیاوازی هەیە. نیگارکێش لەو کاتە کە بەبیری دادێ وێنەیەك بکێشی بیر لە ڕەنگی گونجاو دەکاتەوە،چۆن ڕەنگەکان لەگەڵ یەکتر بگونجێنی و ببێتەجێگای سەر سورمان و لێ ڕوانین و ویژدان جولاندن.کەسی ڕەوان بێژیش لەو کاتە دەیەوێ گوزارشت لەبابەتێك بکاتەوە بیر لە ناوەرۆك و بەشەکانی دەکاتەوە،جوانترین وشە بۆ مانا ئامادە دەکات،کە سەرنج ڕاکێش و کاریگەرو جوولێنەری هەست و سۆز بن،بەم شێوەیە دەبینین ڕەگەزەکانی ڕوانبێژی واژەو ماناو لێکدانی وشەکانە بە شێوەیەکی گونجاوو کاریگەرو ڕێك و ڕوان و پڕ لە وردەکاری، ڕەوانبێژ بە هەڵبژاردنی وشەکان ئەو شێوازە پێکدێنی کە بەپێی پێویستی شوێنی دەربڕین و باری گوێگر بێ، بەشێوەیەك بێ بەسەر هەست و دڵ و درووندا زاڵبێ، چونکە زۆر وشە هەیە لەشوێنێك جوانەو شایستەیە، بەڵام بەکارهێنانی لە شوێنێکی تر بەناشرین و ناڕوا دادەنرێ و دەبێتە نیشانەی تیر لێوەگرتنی ڕخنەگران،بۆیە هەر دەربڕین و گوزارشتێك بەم شێوەیە نەبوو لەواژەو واتاکانی کەم و کوڕی هەبوو،یان لەشوێنی خۆی بەکار نەهات وەسفی بە ڕەوانبێژی ناکرێ، کەوابێ هەموو دەق و دەربڕاوێك بۆ ئەوەی وەسفی بە رەوانبێژی بکرێ پێویستە:

١- ((لە لایەنی وشەو ڕوخسار بێ کەم و کوڕی بێ، ئەگەر وشەکانی پچڕ پچڕبوون و لە سەر زمان ناخۆش و ئاڵۆزبوون، ئەوە لە زەوقی ئەدەبی بە دوور دەبێ و هیچ جوانی نابێ .

٢- دەبێ واتاکانی جوان و سەرنج ڕاکێش بێ، ئەگەر ناوەڕۆکەکەی ناشیرین و پوچەڵ بوون و پەیوەستەکانی شاراوەبن، بایەخی شێوازی ئەدەبی لەدەست دەداو لە ناو دڵدا جێگای نابێتەوە .

٣- دەبێ دەربراوەکە لەگەڵ باری پێویست و کەسی گوێگر گونجاو بێ، چونکە شوێنەکانی گوزارشت و دەربڕین هەموویان وەکو یەك نین، شوێن تاشوێن جیاوازی هەیە...بۆ هەر وشەیەك لەگەڵ خاوەنەکەی شوێنێك هەیە، پلەی بەرزی دەربڕین ئەوەیە گونجاوو بە پێی پێویست بێ[1] ئێمە لەوەسفی پێناسەی ڕەوانبێژی وتمان دەبێ وشەکانی پاراوبێ ((پاراوی تەنیا وەسفە بۆ وشە،بەلاَم ڕوانبێژی وەسفە بۆ وشەو بۆ واتا هەروا ڕەوانی دەبێ بەوەسف بۆ وشەو بۆ ڕستە بەلاَم، ڕەوانبێژی نابێ بە وەسف بۆ وشە،بەڵکو تەنیا دەبێتە وەسف بۆ ڕستە کە وابێ پاراوی ڕستە مەرجە لە ڕەوانبێژی.بۆ ئەمەش دەتوانین بڵێین: هەموو ڕستەیەك ڕەوانبێژی لێوە هەبێ ڕەوانە،بەلاَم ناتوانین بڵێین هەموو ڕەوانێك ڕەوانبێژیە.))[2]

---

[1] علم المعانی بیسیونی عبدالفتاح فیود (د) ل ٣١-٣٣

[2] جواهر البلاغة (أحمد الهاشمی) ل٤٠

## پوختەی سوودەکانی ڕە وانبێژی

١- ڕەوانبێژی بۆ خۆ پاراستنە لەو هەڵانەی ڕوو لە مانا دەکەن .

٢- بۆ جیاوازی وشەی پاراوە لەوشەکانی تر.

٣- زانستی ڕەوانبێژی بەدووادا چوونی ئەو ڕستە تایبەتانەن کە سوود بەخش و جوانیان پێوە دیارە، بۆ ئەوەی بتوانین خۆمان بپارێزین لەو هەڵانەی کەدەبنە ڕێگر لە دەربڕینی مانا بەپێی پێویست.

ئەوەی ماوە لێرە ئاماژەی پێ بکەم: ئێمە لەوکاتە لە دەقە هونەریەکان دەڕوانین دەبینین، هونەری ڕەوانبێژی وەك زانست لەسێ بەش دەردەکەوێ هەر بەشێکیش بابەتی تایبەتی خۆی هەیە،ئەم بەشانەش ئەمانەن: یەکەم : واتاناسی، دووەم : ڕوونبێژی،سێیەم: جوانکاری.

# واتاناسی

**بەشەکانی واتاناسی:**

١- پێناسەی واتاناسی .

٢- گرینگی زانستی واتاناسی .

٣- جۆرەکانی گوزارشتکردن و دەربڕین .

یەکەم : هەواڵ :

أ- مەبەست لە ڕاگەیاندنی هەواڵ.(خبر)

ب - چونیەتی ڕاگەیاندنی هەواڵ .

ج- دەرچوونی هەواڵ لەمانای دروست و بنەڕەتی خۆی بۆ مەبەستی تر.

**دووەم : داڕشتن :**

جۆرەکانی داڕشتن :

فەرمان- نەهێشتن - پرسیار- بانگکردن- خۆزی.

٤-بنچینەکانی ڕستە لە زانستی واتاناسی .

٥- چۆنیەتی شێوازی دەربڕی.

تایبەتکردن، یەکسانی، کورتبڕی، درێژبڕی، پێکەوەنان، دابڕین.

# واتـاناسی

واتاناسی: زانستێکه دامەزراوه لەسەر چەند بنەمایەك بۆ ناسینی قسەو گوزارشت لە بارەی ڕەوانی و دەربڕین بەپێی پێویستی شوێن و ئاستی کەسی بۆ دەربڕاو .[1]

ئێمە گەر بەوردی لەم پێناسەیە بڕوانین، دەبینین هەمان ئەم دوو چەمکەیە کە لە پەندی پێشینان هاتووه((قسە تانەی بێژی نەی ڕێژی))[2] ((قسە بگێژە، بیبێژە، بیوێژە))[3]

ئەوەی ئەم دوو پەندە ئاماژەی پێ دەکەن، دەبێ دەربڕین و گوزارشت بە پێی باری پێوستی شوێن و گوێگر بێ، بە وشەی ڕەوان و پاراوبێ ، مانای بەشێوەیەکی جوان و لە باربێ و لەبوتەی وشەکانی توابێتەوە،دەربڕینیش کە بەم شێوەیە بوو سیفەتی هونەری ڕەوانبێژی لێ دەردەکەوێ و شیاوی ئەوەیە وەسفی بەڕوون و ڕەوان بکرێ،بە پێی ئامازەی ئەم دوو پەندە،کورد هەر لە کۆنەوە قسەو دەربڕینی جوانی مەبەست بووەو هەوڵی بۆ داوە، ئەم دوو پەندەش سەر چاوەیەکی گرینگی بنەمای ڕەوانبێژی و واتاناسی یە.

ئەوەی لێرە بە پێویستی دەزانم ئامازەی پێبکەم ڕێزمان سەر پەرشتیاری ئەندام و جەستەی وشەو ڕستەی دەربڕاوە، زانستی واتاناسی گیانی هەست پێکردنی واتا کەیەتی لەڕووی شیاوی و نەشیاوی و گونجانی لەگەڵ بارو ئاستی کەسی بۆ دەربڕاو. ئەگەر ڕێزمان لەوشە سازی ئامازە

---

[1] جواهر البلاغة ( أحمد الهاشمي ) ل٤٦

[2] گوڵبژێرێك لە پەندی کوردی هۆشیارنوری لەك ل٧٨

[3] دەقەکانی ئەدەبی کوردی ( علاء الد ين سجادی ⁄١٥٩

بۆ وشەکانی ئاخاوتن دەکات و لەڕستە سازیش باس لە جورەکانی ڕستەو کەرستەکانی دەکات، ئەوا زانستی واتانسی باس لەلێکۆلینەوەی واتا دەکات لەبارەی کورتبڕی و درێژبڕی و پاش و پێش خستن و شوێنی پێکوەلکان و شوینەکانی جەخت و زۆری تر. هەموو ئەمانەش بۆ ئەوەیە کەسی رەوانبێژ لێکۆڵینەوە لە هەموو ئەو نەهێنیانە بکات کە لەسەبەتەی وشەو ڕستەکاندا هەیە بۆ ئەوەی قسە بە پێی پێویست بێ.

# ئامانجەکانی واتاناسی

١– زانستی واتاناسی گرینگی بەڕستەدەدات ،گرنگی دانیش بەڕستەلەجیاوازی شێوازەکەی دەردەکەوێ.

٢–مەبەست لە زانستی واتاناسی بەدوادا چوونی گوزارەو ڕستەیە،بۆ بەدەست هێنانی مانا بەشێوەیەکی ڕێك و جوان.

٣– مەبەست لەم زانستە گەیشتنە بەو بنەمایانە کە دەبنە پێوەر بۆ ئەوەی گوزارشت کردن بە پێی پێویستی باری شوێن و دوورکەوتنەوە بێ لە دەربڕینی بە هەڵە.[١]

## جۆرەکانی دەر بڕین و گوزار شتکردن

گوزارشتکردن و دەربڕین بەزمانی کوردی و زمانەکانی تر دوو جۆری هەیە :–

**یەکەم هەواڵ:( خبر )**

هەواڵ: ئەو قسە یان ئەو دەربڕینەیە لایانی ڕاست و درۆی هەبێ بتوانی بڵێی ڕاستە یان بڵێی درۆیە .

داننان بەڕاستی قسەو ناڕاستی بە بەراوردکردن بەبوون و نەبوون و ڕوودان‌و قەومانی دەردەکەوێ، نابێ تەماشای نییەت و بیرو بڕوای خاوەنەکەی بکەین، چونکە، وتراو لە ڕوانگەی نییەت و بیروبڕوا زۆرجار وا دەبێ هیچ بنەمایەکی لە ڕاستیدا نییە، کەوابێ دەبێ وتراوەکە بەراورد

---

١ منهج البحث اللغوی ( علی زوین.د) ل١٥٦

بکەین بەدەرەوەی خۆی، ئەگەر لە دەرەوە ڕویدابوو دەبێ بە ڕاست ئەگەر لەگەڵ دەرەوەی خۆشی یەکی نەدەگرتەوە واتە ناڕاست و درۆ.[1]

## مەبەست لە ڕاگەیاندنی هەواڵ

ڕاگەیاندنی هەواڵ لە بەر یەك لەم دووانەی خوارەوە دەبێ :

١- دەربڕینی هەواڵ بۆ ئەوەی گوێگر یان خوێنەر پێی بزانی،وەك ئەوەی پێی بڵێی: دوێنێ لەگەشتەکەم گەڕامەوە.ئەم جۆرە هەواڵە بەسوود بەخش ناو دەبرێ.

٢-دەربڕینی هەواڵ بۆ ئەوەبێ بەگوێگر ڕابگەیێنی منیش دەزانم و پێی ئاگادارم، وەك بە کەسێکی زیرەك بڵێی تۆ زیرەکی، مەبەست لەم هەواڵە بۆ ئەوە نییە گوێگر پێی بزانی، چونکەخۆی دەیزانی،بەڵکو مەبەست ئەوەیە منیش دەزانم تۆ زیرەکی، بەم جۆرە هەوالەش دەڵێن: پەیوەستە هەواڵ.([2])

## چۆنیەتی ڕاگەیاندنی هەواڵ

شێوەی دەربڕینی هەواڵ دەبێ بە پێی پێویستی باری گوێگر بێ،باری تێگەیشتنی گوێگر بزانرێ لە چ ئاستێك دایە لەوەرگرتنی هەواڵ، پێویست بەجەخت و دوو پاتکردنەوە دەکات یان ناکات؟ نکوڵی دەکات لەبارەی ڕاستی و ناڕاستی یان ناکات؟ لەبەر ئەم هۆیانە دەبینین ڕاگەیاندنی هەواڵ

---

[1] بلاغة العرب ( علی سلوم.د ) ل ١٠٤

[2] علم المعانی (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ل٤٤-٤٥

جیاوازی دەبێ بە پێی پێویستی باری گوێگر. جیاواز یەکانیش بەم شێوەیە دەبێ:–

١– ئەوەیە گوێگر دڵنیابێ لەراستی هەواڵەکەو هیچ نکوڵی لێ نەکات، ئەمەیان پێویست بەجەخت و بەدووپاتکردنەوە ناکات.[١]

خادیم دەڵێ :

سـەفەر بەلگ کـرا ئیعلان لەعالەم
سـەقەڕ بوو بۆ عەذابی جوملە عالەم([٢])

(خادیم) هەواڵی سەفەر بەلگی ١٣٣٣ك ڕاگەیاندووە لەبەر ئەوەی زانیویە نکوڵی لەم هەواڵەی ناکرێ بەپێویستی نەزانیوە جەخت (تأکید)ی لەسەر بکاتەوە .

٢ : ئەوەیە دوودڵی لەڕاستی هەواڵەکەدا هەبێ بۆیە ئەمەیان پێویست بەجەخت لەسەر کردنی دەبی بەهەر شێوەیەك لەشێوەکانی جەختکردنەوە وەك ئەوەی سوێند لە هەواڵەکەیدا بە کاربێنێ.[٣]

وەفایی دەڵێ :

ســا ئەو دەمە وا بێنە ئەتۆ بێ و سەری کوڵمت
غەیـری ئەوە (باللە) نییە لـەو لێوە تەمەنـنـام([٤])

---

[١] بلاغة العرب (علی سلوم.د) ل١٠٧

[٢] دیوانی خادیم لێکۆڵینەوەی جمال محمد محمد أمین ل ٥٦

[٣] بلاغة العرب ل ( علی سلوم د .) ل١٠٧

[٤] دیوانی وەفایی لێکولینەوەی/محمدعلی قەرەداغی ل٤٧

وەفایی لەدێڕی دووەم هەواڵی تەمەنناى خۆی بەیار دەگەیێنی بۆ ئەوەی گومانیش لە ڕاستی هەواڵە کەی نەکات سوێندی بە(باللە) بۆ دەخوات.

٣- سێیەم: ئەوەیە گوێگر نکوڵی لەڕاستی هەواڵە بکات،بۆ ئەمەش دەبێ زیاتر لە جارێك جەختی لەسەر بکاتەوە بۆ ئەوەی هیچ نکوڵی نەمینێ[١]

مەحوی دەڵێ :

به خودا قەســـەم لەگەڵ دڵی خاڵی لە ســـۆزی عیشق
تەکراری حەرفە بەس دەمی پـــڕ لە یاخودا خودا([٢])

مەحوی دەڵێ: ئەگەر ناو هێنانی خوا پڕ لە سۆزی خۆشەویستی نەبێ ، هەرچەندە ناوی بێنی لەوەت زیاتر نە کردووە کە ئەلف و بێی دوو بارە کردووتەوە مەبەست لە ئەلف و بێ ئەو پیتانەیە کەناوی خوایان لێ پێکهاتووە .

مەحوی بۆ ئەوەی نکوڵی لەڕاستی ئەم هەواڵەی نەکرێ زیاتر لەجارێك جەختی لە سەر کردووتەوە لەنیوەی دێڕی یەکەم سوێندی بەکار هێناوە،لە نیوەی دێڕی دووەمیش وشەی(بەس)ی بەکار هێناوە بۆ بێگومانی هەواڵەکەی.

---

[١] بلاغە العرب ( علی سلوم د).

[٢] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ل ٣

## دەرچوونی هەواڵ لە مانای دروست و بنەڕەت

هەواڵی دروست و بنەڕەت: ئەو دەربڕاوەیە تەنها بۆ مەبەستی سوود گەیاندنی هەواڵ بە کاربێ. بەڵام زۆر جار بۆ مەبەستی تر بە کاردێ کەڕەوت و بەڵگەی ڕستە ئاماژەی پێ دەکات، هەندێك لەزانایانی ڕەوانبێژی: ئەو هەواڵانەی کەبۆ مەبەستی تر بەکاردێن بە درکە(کنایە)یان دادەنێن،لەبەر ئەوەی مانای یەکەمیان ڕێگر نییە لەمانای دووەم چینێکی تریش بەخوازەی بەربلاوی ئاوێتە(ألمجازالمرکب المرسل)ی ناو دەبەن دەڵێین: ئەم جۆرە شێوازە مانای دووەمی مەبەستە کە لەیەکەمەوە بۆی گوێزراوەتەوە لەبەر ئەو پەیوەندییەی لەنێوانیاندا هەیە. هەندێکی تریش دەڵێن: ئەم مانایانە لەڕەوت و بەڵگەکان وەردەگیرێن بۆیە پێویست ناکات بەدرکە یان بەخوازە ناویان ببەین و بەدوادا چوونیان بۆبکەین، لەکاتێکدا ئەم مانایانە هەرهەن.[1]

منیش لێرە لەبەر پەسندی ڕای سێیەم بەلامەوە،بەپێویستم نەزانی بەیەکێ لەم دوو ڕایەی دابنێم. ئەم ئاماژانەش کە لەڕێگای ڕستەی هەواڵی وەردەگیرێن وەك ئەمانەی خوارەوەن :-

**١- بۆ شانازی :**

مەحوی دەڵێ :

لە هەر شیعرێ لەدیوانت دەجۆشێ نەشئەیی((مەحوی))
صەدایێکی لەیەکتر جوێ دەدا هەر تاری قانوونت([2])

---

[1] علم المعاني (د. بیسیوني عبدالفتاح فیود) ل ٤٧

[2] مەحوی دیوان لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٧٥

مەحوی لەم دێڕە شیعرەیدا لەڕێگای هەواڵ شانازی بەشیعرەکانی خۆی دەکات کەبە شێوەیەکی وای دارشتووە وەك مۆسیقا وایە لەگوێدا، هەر ژێیەکی لەژێکانی دەنگێکی جیاو سەر بەخۆی هەیە .

**٢- بۆ دەربڕینی بێ هێزی :**

ئاوڕەحمان بەگی بابان دەڵێ :

گەیشتمە عومـــری پـیری ئێستە دیلی مـــاڵ و منداڵم
ژنـی کـــافـــر شـــەڕنگێـزە ئـەزانـی پـــیرو کـەم حـاڵـم
شـــریخەی دەنـگی وەك ئـــاگر ئەسووتێنێ پـەڕو بـاڵم!
لەچەخماخەو بروسکەو نەعرەتەی بێ هۆش و بەدحاڵم! ([1])

شاعیر لەم دوو دێڕە شیعرەیدا ئاماژە بەبێ هێزی خۆی دەکات لە ڕێگای ڕەوتە هەواڵ.

**٣- بۆ دەرخستنی خۆشی:**

نالی دەڵێ:

کە تۆ هاتی لەنەومێدی نەمـــا باس
لە هیجرو(انتظار) ئیدی نەما باس([2])

نالی لەم دێڕە شیعرەیدا ئاماژە بە وەدەکات کەیار هات، خۆشی و شادی بەرقەرار بوو، نائومێدی نەما، مەبەست لە ڕاگەیاندنی ئەم هەواڵە نیشاندانی خۆشی یە .

---

[1] دیوانی ئاورەحمان بەگی بابان ئامادە کردنی محمو د أحمد محمد) ل٧١
[2] دیوانی نالی لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٢٣٠

**٤- بۆ دەرخستنی ناخۆشی :**

نالی دەڵێ

((نالی))وا دائیم کەمەشغولی فوغان و ناڵەیە
باعیثی هیجرانی یارە دڵ شەڕارەی گرتووە([1])

نالی لەم دێڕە شیعرەیدا ناخۆشی حاڵی خۆی دەربڕیوە،کە خەریکی نالەیەو دڵیشی لەبەر دووری یار گڕی گرتووە.مەبەست لەدەربڕینی ئەم هەواڵە خستنە ڕووی ناخۆشیی یە.

**٥- بۆ دەربڕینی لێبوردن و پاڕانەوە :**

نالی دەڵێ :

وەی کە ڕوو زەردی مەدینەو ڕوو سیاهی مەککە خۆم!
دەرکراوو دەربەدەر، یارب دەخیلی عەفوی تۆم([2])

(نالی) لەم دێڕە شیعرەیدا کە ڕوو زەردی و ڕوو ڕەشی خۆی بە رامبەر بە شاری مەککەو مەدینە نیشان دەدات و دەپاڕێتەوە،داوای لێبوردن دەکات کە ناتوانی تیایاندا بمینێتەوە مەبەستی لەم هەواڵە داوای لێ خۆشبوونە.

---

[1] هەمان سەرچاوە ل ٥٤٣

[2] دیوانی نالی لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٢٩٩

### ٦- بۆپیاهەڵدان و بەگەورە زانین :

نالی دەڵێ :

پەیـــغامبـەرو حـەبیـبی خـــودا (خـــاتـــم الـرُسـل)
رەوضە ی لەئەرض و سایەی لەسـەر چەرخی ئەخضەرە([1])

نالی مەبەستی لەم هەواڵە پیاهەڵدان و بە گەورە زانینی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)

[1] هەمان سەرچاوە ل٤٢٣

## ڕاهێنان

مەبەست لەهەواڵ لە هەریەك لەم دێڕە شیعرانەی نالی بۆ چییە ؟

١- لایەقی مەخـــزەنی طەبعە هەمـــوو کەنزی غەزەلم
قابیلی ضـــە ربی ڕواجە زەڕ و زیـوی مە ثـە لم

٢-بە سـەر هاتوومە ئەو خاکە کە هەر میثقالە ذەڕێکی
بەمیزانی شـەفاعەت کێوی حیلم و بەحـری غوفـرانە

٣- خۆشترە عوذری گونەهکاران لەصەد ذیکری ڕییا
ئەم بەزمی عەفوە عەفوە، ئەو بەتوندی عـەف عەفە

٤-شێخم، چ گەرمە حەلقەیی ذیکرت بەڕەشبەڵەك
حـــالی ئـەمـانە خـۆ بـەجـەنــابـت مـوحـەووەلــە

٥-لـــە هێلانەی زەمیندا وەك شـــتوور مـــــورغ
منی قـــــودس ئـــاشیـان بێ بـــــاڵ و پـەڕم

## دووەم داڕشتن: ألإنشاء

داڕشتن: ئەوەیە خودی واژەی دەربڕاو درۆ و ڕاستی بە خۆیەوە هەڵنەگرێ.[1]

ئەوەی لەم پێناسەیە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، وتەی دەربڕا و لە داڕشتندا لە دەرەوەی خۆیدا بوونی نییە. ئێمە کەدەڵێین: ئەم کارە بکە،یان ئەم کارە مەکە، داوای کردنی کار لە فەرمانی (بکە)دایە. داوای نەکردنیشی لەفەرمانی(مەکە)دایە، داوای هاتن و ڕوتێکردن لە بانگەوازی دایە، هەر یەك لەمانە، بوونی نابێ تەنها بەو وشەو واژانە نەبێ کە لە داڕشتندا بە کاریان دێنین: ئەمەش واتە: تۆ هەر داواکاریەك بکەی ئەم داواکاریەت لەدەرەوەی چەمکی وتەکەت بوونی نییە، ئەو کاتە بوونی دەبێ، ئەوەی فەرمانی پێکراوە هەستی بە ئەنجامدانی کارەکەو جێبەجێ بکات.[2]

تۆ کە بە کەسێك دەڵێی: بنووسە، چەمکی ئەم فەرمانە لە درەوە بوونی نییە، تا ئەو کاتە کەسی فەرمان پێکراو ئەنجامی دەداو دەینووسێ، ئینجا بوونی دەبێ.لەم پێناسەیە کەدەڵێین(خودی واژەی دەربڕاو) بۆ لەبەر بردنەدەرەوەو جیاکردنەوەی پەیوەستی داڕشتنە،واتە: پە یوەستی داڕشتن مەبەست نییە، تۆ کەدەڵێی: لێم ببوورە پەیوەستێکی هەیە کە هەواڵە، ئەم پەیوەستە واتە: من داوای لی بووردنت لێ دەکەم، بەلاّم لە بەر ئەوەی ئەم چەمکە لە خودی واژەی داڕێژراوە کە نییە، بەڵکو

---

[1] جواهر البلاغة (أحمد الهاشمی) ل ٧٥

[2] هەمان سەرچاوە ل٧٥

چەمکێکی پەیوەستە بە بنەرەت دانانرێ، کەوابێ واژەی (خود) کە لە پێناسەکەدا باسکراوە بۆ ئەوەیە چەمکی پەیوەست لە بەر بچێتە دەر.[1]

ئەوەی ماوە لێرە ئاماژەی پێ بکەم ئەو داڕێژراوانەی مانای داواکاریان تێدا نییە وەك پیاهەڵدان (مدح) وسەرسوڕمان (تعجب)و تکا (رجا) وزۆری تر زانایانی ڕەوانبێژی

خۆیان پێوە خەریك نەکردووە،چونکە ئەم جۆرە ڕستانە لە بنەڕتدا بە هەواڵ دادەنرێن و گوێزراونەتەوە بۆ داڕشتن، بۆیە ئێمەش تەنها باس لە وانە دەکەین کە داواکاریان تێدایە.[2]

## جۆرەکانی داڕشتن

داڕشتن:لەم جۆرانەی خوارەوەپێکدێت: یەکەم: فەرمان : فەرمان: ئەویە داواکار لەڕووی دەسەلأتەوە داوا لە گوێگر بکات هەستی بە ئەنجامدانی کارێك[3]

محسن دەڵێ :

ڕۆڵە بخوێنە، دەست پاك بە هەردەم
قسەت پاك بکە، پێش دەرچی لەدەم
خۆشی لەبۆ کەس، جێگیر نەبووە
لە گوڕاندایە گشت کات و سەردەم([4])

---

[1] هەمان سەرچاوەل٧٥

[2] هەمان سەرچاوەل٧٦

[3] علم المعانی (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ل ٣٦٥

[4] گوڵزاری هۆنراوە (محسن أحمد مصطفی) دەستنووس

(بخوێنە، پاك بکە) ئەم دوو فەرمانە هەر دووکیان ڕاستی (حقیقی)ن چونکە لەلایان باوکەوەن باوکیش بەرامبەر بە ڕۆڵەی خۆی خاوەن دەسەلآتە لە لایانی ئایین ویاساوە،جێبەجێکردنی بەئەرك دەزانرێ بۆ ئەو کارانەی کە پێچەوانەی ئایین نەبن.

## بە کار هێنانی فەرمان بۆ مەبەستی تر

زۆر جار وادەبێ فەرمان لە مانای بنەڕەتی خۆی دەردەچێ بۆمەبەستێکی تر بەکاردێ بەڵگەو ڕەوتی ڕستە ئاماژەی پێ دەکات .

هەندێك لە زانایانی ڕەوانبێژی هەر وەك لە باسی هەواڵ باسمان کرد ئاماژەی ڕستەی داڕشتن وەك فەرمان (أمر) و نەهێشتن (نهی) و پرسیار(إستفهام) و ئەوانەی تر بە (درکە)ی ناو دەبەن ،چونکە مانای دووەمی ڕێگر نییە لە مانای یەکەم هەندێکی تریش ناوی دەبەن بەخوازەی تێکەلآوی بەربلآو (ألمجاز المرکب المرسل) دەڵێن: مەبەست لەم جۆرە شێوازانە مانای دووەمە کە لەیەکەمەوە بۆیان دەگوێز رێتەوە،لەبەر بوونی پەیوەندی لە نێوانیاندا، هەندێکی تریش دەڵێن: ئەم مانایانە لە رەوت و بەڵگەکان وەردەگیرێن بۆیە پێویست ناکات بە(درکە)یان (بەخوازە)ناو یان ببەین و بە دواداچونیان بۆ بکەین چونکە ئەم مانایانە هەر هەن.[1]

---

[1] علم المعانی ( د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ل ٣٥٧

ئەو مەبەستانەش کە لە ئاماژەی فەرمانەکان وەردەگیرێن وەك ئەمانەی خوارەوەن :

**١- بۆ پاڕانەوە :**

مەحوی دەڵێ:

چ کەس نابێ بە کەسدارم ، نییە لەو بەردەرە یارم
خودایە تۆ بکەی چارم ،کەسێکم بێکەس و بێدەر[١]

مەحوی لە نیوەی دێڕی دووەمدا فەرمانی (بکەی چارم)ی بۆ مەبەستی دوعا بەکار هێناوە

**٢-بۆ ئامۆژگاری و ئاگادار کردنەوە:**

مەحوی دەڵێ:

نزیکە مـــرد نت ئەی پیرە زاهـــــد
وەرە بـــا تۆبە بکەین، ئیتر ڕیابەس ([٢])

مەحوی لەم دێڕە شیعرەیدا ئامۆژگاری زاهد دەکاو پێی دەڵێت: وەرە باتۆبە بکەین و دەست لە ڕیاکاری بکێشینەوە، فەرمانی (وەرە) ی بۆ ئامۆژگاری و ئاگادار کردنەوەی بە کارهێناوە .

---

[١] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ١٣٠
[٢] هەمان سەرچاوە ل١٤٥

### ٣ – بۆ هاندان و پەلەکردن :

مەحوی دەڵێ

تـــــا سەر نەبووتە گۆ، دە لەدنیادە تۆ شەقێ
هــەر ئەم شەقە بەکارە،کەوا هەڵدرێ لە هیچ([1])

مەحوی کە دەڵێ:(دە لەدنیادە تۆ شەقێ) فەرمانی بۆ مەبەستی هاندان و پەلەکردن بە کار هێناوە .

### ٤- بۆ ئیهانەکردن :

نالی دەڵێ:

ئــــەی نەفســی موڕائــی چ گــرانبــاری تەکـــــالیف!
بۆ خـــەلقی دەکێشی..دە هەڕۆ ڕێش و جـــــەدەوبە

واتە((ئەی بنیادەمی ڕیاباز! ئەرکێکی قورست خستووەتە ئەستۆی خۆت،عیبادەت بۆ خوا نا،بۆ ڕوپایی ئەکەی.. دەبڕۆ، دەی! با لەژێر ئەم بارە گرانەدا پشتە ڕێشەت تووش ببێ و جەدەو ببێ و ناوشانت داڕزێ..)[2]

لەم دێڕەدا نالی دەرحەق بە کەسێکێ ڕیاباز، ڕێژەی فەرمان بە کار دەهێنێ کاتی پێی دەڵێت: (دە هەڕو ڕیش و جەدەو بە) مەبەستی ئیهانە کردنە.

---

[1] هەمان سەرچاوە ل ٩٨

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٩٨

## ڕاهێنان

فەرمان لە هەریەك لەم دیرە شیعرانەدا بۆ چی بە کارهاتووە ؟

١– جۆشێك بدەن وەکو هەنگ ،تەگبیر بکەن بەبێ دەنگ
ئەسبابی شەڕ پەیداکەن ، تۆپ و تفەنگ و هاوان

حاجی قادر

٢– ئیسلاحی نەفسی خۆت بکە رازی ببە بەحەق
ئیزهاری عیجزە بەسیە ڕەواجی شکات

حەمدی

٣– دەکەی نەخچیری صەد دڵ هەر بەتیرێ
ئیلاهی هەر بمینێ، دەست و بازووت !

نالی

٤– بنواڕە بوونی ئەووەلت و چوونی ئاخرت
هاتی چ ڕووت و قووت، هەڵاتی چ لووس و پووس

نالی

**دووەم : نەهێشتن (النهی)** داوای نەکردنی کارە لەڕووی دەسەڵاتەوە داواکەش ئەرك بێ بۆ داوا لێکراو.

پێغەمبەر(د.خ) لەحەججی ماڵ ئاوایی(حجةالوداع) بۆ موسڵمانان چەند یاسایەکی ڕاگەیاند:

خوێنی یەکتری، فـــەرمووی مەڕێـژن
پـــاش ملەی یەکتر، خـراپە مەبێـژن
مـــاڵی یەك نەخۆن،بەدزی وزۆرداری
هـــەموودەم دووربـن لـە خـرپەکـاری
داوێن پیـس نەبن، لەگـــەڵ یەکـتری
دەبێ موسلمان،ڕێگای ڕاست بگری([1])

مەبێژن، نەخۆن، نەبن) ئەم داوایانە هەموویان ڕاستی (حقیقی)ن چونکە سەرچاوەکەیان پێغەمبەرە (د.خ) کەدەسەڵاتی لەلایان خواوە پێدرا وە﴿وما آتیکم الرسول فخذوه ومانهاکم عنه فانتهوا ﴾ ئایەتی٧ سورەتی الحشر.

واتە:ئەوەی پێغەمبەر داوای لێ کردن بیکەن و لە سەرتانە ئەنجامی بدەن ئەوەی داواشی کرد نەیکەن نابێ بیکەن.

---

[1] دیوانی نالی لێکولینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ل ٣٩٢

## بەکارهێنانی نەهێشتن بۆ مەبەستی تر

زۆر جار وادەبێ نەهێشتن لەمانای بنەڕەتی خۆی دەردەچی بۆ مەبەستی تر بەکاردێ، ڕەوتی ڕستە ئاماژەی پێ دەکات وەك ئەمانەی خوارەوە :

**١- بۆ بێ ئومێدی :**

مەحوی دەڵێ :

مەثە لی عــــەهـدو وەفا وەك مەثە لی عــــەنقـایـە
پیاوەتی بـــاسی لەکن کەس مەکە،ئادەم بووەقات

((واتە: وەفاو پەیمان ڕاگرتن وەك باڵندەی عەنقا وایە، باڵندەیەکی وەهمیە ناوی هەیە ڕەنگی نییە، پیاویش نەماوە پیاوەتی لێ بوەشێتەوە، بۆیە باسی پیاوەتی لای کەس مەکە .)) [1]

(مکە) داوای نەکردنە بۆ مەبەستی مانای بنەڕەتی ڕاستی و داوای نەکردن نەهاتووە کەباس نەکردنی پیاوەتی یە، بۆ ئەوە وتراوە کە ئومێدی بەکەس نەماوە کە عەهدو وەفایان لاهەبێ.

**٢-بۆ ئامۆژگاری:**

مەحوی دەڵێ :

تێگەیشتن مەغزە، ئەم ئینســانە پۆست
خۆمەکە بێ تەجرەبە قوربـــــانی دۆست
تۆ مەڵێ یەك مەرتەبە ســــــەد مەرتەبە:
(دشــمن دانــــا بە أز نــادان دۆســت)

مانای وشە: مەغز: کاکڵ .پۆست : توێکل. مەرتەبە: جـار.

---

[1] دیوانی مەحوی لێکۆلینەوەی مەلاعبد الکریمی مدرس ل٦٢

مەحوی لەنیوەی یەکەمی ئەم چوارینە دەڵێ:((قەوارەی ئادەمی زاد وەك توێکڵ وایەو، تێگەییشتنیشی وەك کاکڵەی ناو توێکڵە کەوایە، ئەوەش کەتێگەیشتنی نەبێ وەك بەری پوچەڵ وایە.کەواتە تۆش تیگەیشتنت ببێ و دۆست تاقی بکەرەوە بزانە تێگەیشتووە، پشتی پێ دە بەستریٚ، یان نە؟ ئەوجا خۆت بکە بە قوربانی، نەوەك پاشان بەهەڵەدا بچی و پەنجەی پەشیمانی بگەزی ))

لە نیوەی دووەمی ئەم چوارینەش دەڵێ: ((نەك تاقە جاری سەد جار بڵێ دوشمنی تێگەیشتوو لە دوستی نەفام چاترە))[1]

(مەحوی) لەم چوارینەدا دوو جار داوای نەکردنی بە کارهێناوە(مکە، مەڵێ )بۆ مەبەستی ئامۆژگاری و جیاوازی، ئەوەیە دەڵێ: نابێ مرۆڤ خۆی بە قوربانی کەسانی ناتێگەیشتوو نەزان بکات. مەبەستیش لە دەرخستنی جیاوازی، ئەو جیاوازیەیە کە لە نێوان کەسانی تێگەیشتوو و نەزان داهەیە کەسانی ناتێگەیشتوو وەك پوچەڵ وان. لەنیوەی دووەمیشدا دیسان مەبەستی ئامۆژگاری و جیاوازییە،بۆ ئەمەش دەڵێ: دۆستایەتی کەسانی ناتێگەیشتوو مەکە، دۆستایەتی کەسانی تێگەیشتوو باشترە.

**٣- بۆ دەرخستنی ئەندازەی سۆزو خۆشەویستی :**

صافی دەڵێ:

بە نـــــاری عەشــقەوە مەمنیـژەجـانا
دەسووتێنی بە (باللە)کفن و تـابووت([2])

---

[1] دیوانی مەحوی لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٣٢٩ ٣٣٠

[2] دیوانی صافی لێکۆڵینەوی محمدی مصطفی هیرانی ل١٥٨

صافی کەدەڵێ :(مەمنێژە) داوای نەکردنی ناشتنی بۆ مەبەستی دیاری کردنی ئەندا زەی سۆزو خۆشەویستیە بۆ یارەکەی، پێی دەڵێ: باپێت شادبم ئەگەر نا عەشقم گڵپە بکات لەبەر ئەو هێزە زۆرەی هەیەتی کفن و تابووت دەسوتێنێ !

## ٤- بۆبێزاری و ناخۆشی دەربڕین:

مەحوی دەڵێ :

بـریـنـانی دەرروونـم ،چـــاوەکەم! وەك چـاومـە وێـران
لە وێــرانی مـــەپـرسـە، دەروون و هـەم ناومـە وێـران
بەدڵ ڕاضی نەبوو ڕۆیی،لـــە حوجرە هەم لە بەرچاوم
بەجارێ ماڵی دڵم و خــۆم و هـەردو چاومە وێــران[١]

مەحوی فەرمانی (مەپرسە)ی بۆ دەربڕینی ناخۆشی و بێزاری بەکار هێناوە.

## ٥- بۆ سووکایەتی پێکردن و پیاهەڵدان :

مەحوی دەڵێ:

دڵ دەبـــا غەمزەت، چ فەرقی ڕەندو صـوٚفی بۆ نییە
صــــەیدی مردوو حەیفە ئەم شـەهبازەی تێ بەرمەدە

((واتە: غەمزەی چاوی تۆ فەرقی لا نییە،چ عاشق بەرکەوێ چ وشکە سۆفی خانەقا، دەیپێکی.بەڵام ئەم وشکە سۆفیانە وەك نێچیری مردار وەبوو وان، بۆ تۆیش حەیفە شابازی چاوت بەردەیتە نێچیری مردار وەبوو ))[٢]

---

[١] دیوانی مەحوی لێکۆ ڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ل٣٤٧

[٢] دیوانی مەحوی لێکۆ ڵینە وەی مەلا عبد الکریمی مدرسل٢٤٧

مەحوی داوای تێ( بەرمەدە)ی بۆ پیاهەڵدانی چاوی جوانی یاری بە کارهێناوە، واتە چاوی ئەوەندە جوانە عاشق و وشکە سۆفی دەپێکی،لەلایەکی تریش سوکایەتی بە وشکەسۆفی کردووە بە نێچیری مردار وەبووی داناوە .

**٦- بۆ بەردەوامی و شانازی :**

مەحوی دەڵێ:

هەموو فەخـــری کەداغ و دەردە عاشق
مـەبەن، ڕیســوایيە نــاوی دەوا قەط[1]

(مەحوی)لەم دێڕدا کە دەڵێ(مەبەن) ئەم داوایەی بۆ ڕاستی و حەقیقەتی مانای بنەڕت نییە، بۆ دەرخستنی بەردەوامی و فەخرو شانازیە، چونکە ئەوەی جێگای شانازی عاشقانە بەردەوام بوونە لە نێو دەردو داغدا.

---

[1] دیوانی مەحوی لێکۆ ڵینە وەی مەلا عبد الكريمی مدرس ل١٦٠

## ڕاهێنان

نەهێشتن لە هەر یەك لەم دێڕە شیعرانە بۆچ مەبەستێك بە کارهاتووە؟

١- کــەس بە ئەلفاظم نەڵێ خۆ کــوردیە خۆ کردییە
هەرکــەسێ نادان نەبێ خۆی طالبی مەعنا دەکا

نالی

٢- رەوشــەنی داوە بە دڵ ڕەزەلی سینەم لە خەدەنگ
دەك ئیـلاهی نەڕزی دەســـــتی کەمـانـت لـە گـلاّ

سالم

٣-مەکـــەن لۆمەی پــــە شێوی دڵ کـــە ئەمـشەو
پەشێـواوە لــــــە بــــــەر پـەرچـەم پــەشێـوان

نالی

٤-بـــە ئاهم گەر ڕەقیبان بسووتێن ئەی گوڵی ڕەعنا
مەڕەنجە تـــــوخوا شوعلە لە ئاقاری چقـڵ چ بـکا

مەحوی

٥-گــــەر لە دنیا چاکەیێ صـادربو تەفرەی پێ نەخۆی
ڕوو ســـــپی هەر ڕوو رەشە گەربێ صـــەد ئازایی بکا

مەحوی

**سێیەم: پرسیار(الإستفهام)** داوای زانینی شتێکە داواکار پێی نەزانی .[1] وەك : بۆ زانینی شتی نەزانراو:

ئەو ئامرازانەش کە بۆ پرسیار بە کاردێن زۆرن لە وانە:(بۆ، چ ، بۆچ ، بۆچی ، چۆن ، ئایا، کەی،چەند ، چی،کێ ،کامە،کوا ، لەبەر چی ، کوێ ) لەم جۆرە پرسیارانە شتی پرسیار لێکراو دەبێ بە وەلاَم .

## بەکارهێنانی پرسیار بۆمەبەستی تر

هەر وەکو فەرمان و داواکاریەکانی تر، زۆر جار پرسیار لە مانای بنەڕەتی خۆی دەردەچی بۆ مەبەستی تر بە کاردێ ڕەوت و بەڵگەی ڕستە ئاماژەی پێ دەکات. وەك :

### ١- بۆ نەفی کردن و پیاهەڵدان :

نالی دەڵێ :

شیعری خەلقی کەی دەگاتە شیعری من بۆ نازکی؟!
کەی لە دیقەتدا پەتك دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا؟!

مانای وشە: دیقەت: وردی. باریکی. پەتك: ئەو بەنەی بەڕەو جوالی پێ دروست دەکەن. هەودا : تاڵی ئاوریشم

واتە:((شیعری خەلکی هەرگیز لە ناسکیدا ناگاتە ڕادەی شیعری من. شیعری من لە چاو شیعری خەلکیدا وەك تاڵی ئاوریشم وایە لە چاو پەتکداو پەتکیش هەر گیز ناتوانی لە باریکی و ناسکیدا بەریەرەکانی لەگەڵ تاڵی ئاوریشم بکات))[2]

---

[1] بلاغة العرب ( علی سلوم د .) ل ١١١

[2] دیوانی نالی لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل١٠٧

نالی لەم دێرە شیعرەیدا بە دووری خستووتەوە شیعری خەلکی بگاتە شیعری وی لە وردی و ناسکیدا لە هەمان کاتیشدا بەشیعری خۆشی هەلداوە کەشیعری ناسك و وردە .

**٢- بۆ دەربڕینی سەرسوڕمان :**

مەحوی دەلێ :

ئـــەوشۆخە هەرکەنەعشی منی دی قیــامی کرد
چی بم من؟ ئەم قیامەتە هەســـتا کەمن نەمام!

مانای وشە: نەعش: تەرم-جەنازە. قیام: ڕاست بوونەوە .

((واتە: یار کە جەنازەکەمی دی هەستایە سەر پێ وەك بلێی ڕۆژی قیامەت بەرپا بووبێ. نازانم من چیم؟ وا بەمردنی من ئەم قیامەتە هەستا !))[1]

مەحوی بە ئامرازی (چی) ڕانـاوی پـرس، مەبەستی سـەرسـوڕمانە،کە نـازانی خۆی چیەو بۆ بە مردنی یاری ئەو هەموو خەلکە بۆی هەستاونەتە سەرپێ .

**٣-بۆ دەربڕینی گلەیی :**

مەحوی دەلێ:

بەجێیە کوشتنم، سـووتاندنم، خاکـت بەبا بـۆ دام؟!
وتی: ئـــاهەنگی عیشقی من مەقاماتە لەگـەڵ بەستە

مانای وشە:مەقامات :جۆرە ئاوازێکە.بەستە: ئەو گۆرانیە وردانەی لەپاش مەقامات دەوترێ

---

[1] دیوانی نالی لێکوڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٢١٤

(( مەبەستی ئەوەیە وەك چۆن ئەوەی مەقامات بڵێ بەستەیە كیشی لە پاش دەڵێ یاریش كە دڵداری سووتاند، ئاهەنگی دڵدار سووتاندنەكەی بەوە تەواو دەكا خۆڵیشی بدا بە دەم باوە))[1]

(بۆ) كەئامرازی پرسە، پرسیاری لەهۆ پێ دەكرێت مەحوی كەدەڵێ:(خاكت بەبا بۆدام) مەبەستی پرسیار نییە، بەڵكو مەبەستی دەربڕینی گلەییە .

## ٤- بۆ دەربڕینی بێ ئومێدی :

نالی دەڵێ :

گوتم: ئایا بەزاری خـۆت دەپـرسـی حـاڵی زاری مـن؟
بڕۆی هێنایە یەك، وەك شـــەكلی (لا) یەعنی كە بێزارم

((واتە:بە یارم گوت ئاخۆ هەرگیز ڕێ ئەكەوێ ئەوەندە لوتفت لە گەڵم هەبێ بەدەمی خۆت هەواڵێكی حاڵی نارەحەتم بپرسی؟ ئەویش برۆكانی وەك وشەی لا هێنایە یەك هیچی نەوت

تەنها بەو برۆهێنانە یەكەی پێی ڕاگەیاندم كەدەمی ئەوەندە بچووكە قسەی پێ ناكرێ، یا خود بێزارو وەڕسە لێم وەڵامم ناداتەوە))([2])

نالی لەم پرسیارەدا مەبەستی بێ ئومێد بوونیەتی لەوەی كەیارەكەی لەحاڵی نارەحەتی بپرسی؟ هەروەك لەڕەوتی دەربڕینی بەم شێوەیە دەردەكەوێ .چونكە پرسیاربە(ئایا)كەلەسەرەتای ڕستەبێ وەڵامی

[1] دیوانی مەحوی لێكۆڵینەوەی مەلا عبد الكریمی مدرس ل٢٦٧

[2] دیوانی نالی لێكۆڵینەوەی مەلا عبدالكریمی مدرس ل ٢٧١

بە(بەڵێ) یا( نا) دەبێ وەڵامیش لێرە کە بە لا بەمانا(نا)بێ واتە:لێت ناپرسم بێ ئومێد بە .

**٥- بۆ دەربڕینی ناخۆشی :**

نالی دەڵێ :

نـالـە((نالّی)) نالی یە وا خەلکی خستە زەلـزەلە
یانە خۆ حەشرە، گونەهکاران وەها هاوارییە ؟!

((نالەنالّی دەروونی زەبوونی((نالی))یە خەلکی بێزار کردووەو، دنیای ئالۆزاندووە، یانەخۆ رۆژی حەشرە؟ هەر گوناهبارەو لە ئاستی خۆیدا کەوتووەتە هاوارو پاڕانەوەو دەنگەدەنگیان گوێی عالەم کەڕ ئەکا))[١]

نالی لەم دێڕە شیعرەیدا دەیەوێ لە ڕێگای پرسیار، خەم و ئێش و ئازاری خۆی نیشان بدا، ئەوەیە دەڵێ:((یانە خۆ حەشرە گوناهکاران وەها هاوارییە))؟ ناڵە ناڵی خۆی بەراورد کردووە بە ئاه و ناڵینی ئەو گوناهبارانە، لەبەر ئەوەی ئازارو ترسیان بە هیچ ئازارو ترسیدی بەراورد ناکرێ لە زۆری و ناخۆشیدا،کەوابێ دەبێ نالیش بەم شێوەیە توشی ناخۆشی و ئازاربێ .

**٦- بۆ دەربڕینی سەرسوڕمان :**

ئەحمەدی خانێ دەڵێ:

ســــۆهتین خوبخوە نزان چ حــاڵە
هــــوشیارییە خـونەیـــا خییاڵە؟!

مانای وشە :سۆهتین: شەوتین.سووتاین.نزان :نزانین.نازانین.

---

[١] هەمان سەرچاوە ل ٥٨٥

واتە: ئێمە سووتاوین و نازانین لەچ بارودۆ خێکین خەونە بینیمان؟!بەئاگاین؟! یان خەیاڵە ؟![1]

ئەحمەدی خانیٚ لەم دەربڕینەیدا کەدەڵێ: چ حاڵە... مەبەستی سەرسوڕمانە لەوسێ شتەی کە ناوی هێناوە، ئەم سەر سوڕمانەشی بە وشەی پرسی (چ) دەربڕیـوە.

---

[1] مەم وزین ئەحمەدی خانیٚ شەرح جان دۆست ل ٢٢٠

## ڕاهێنان

پرسیار لەهەر یەك لەم دێڕە شیعرانە بۆ چ مەبەستێك بە کارهاتووە ؟

١–ئێستەش مەکانی ئاسکەیە (کانی ئاسکان)؟

یا خۆ بووە بە مەلعبەیی گورگ و لوورەلوور

نالی

٢–شیعری خەلقی کەی دەگاتە شیعری من بۆ ناسکی

کەی لە دیقەتدا پەتك دە عوا لەگەڵ هەودا دەکات

نالی

٣–بـــــوچی حـــاجی نەخوێنی وەك تـــــــــووتی

ئەم زەمـــــانە هـــــەزاری خســـــــتە قەفەس

حاجی قادر

٤–هەمــــــــوو قەومێك وەسەرکەتوون لـــــــە هەوراز

بـــــــەشی تـــۆ کوردە تـاکـــــــەی هەر نشێـوە

هێمن

کـــەی لەکن ئەحمەق دەبێ حـــاجـــاتی دانـــا ڕوا؟!

قـــــەت دەکرێ چەرمــــە کــەر یابە عەبا یابە کەوا؟!

مەحوی

**چوارەم :بانگکردن**: داواکردنی(دوێنەرە)لە گوێگر بۆ وریا بوونەوە و گوێ ڕایەڵی یان ڕوو لێوەکردن[1] بە هۆی ئامرازێکی وتراو- وەك ئەی ، هۆ ، هێ ،یا ، ۆ ، ە ، ێ - یا نە وتراو ئاوازی ڕستە ئاماژە بە بانگکردن بکات.

## بەکارهێنانی بانگکردن بۆ مەبەستی تر

بانگکردن وەك ئەوانەی لەمەو پێش باسمان کردن زۆر جار وا دەبێ لەمانای بنەڕەتی خۆی دەردەچێ بۆ مەبەستی تر بە کاردێ ڕەوت و بەڵگە ئاماژەی پێ دەکات وەك :

### ١ – بۆ پاڕانەوەو دەرخستنی بێ هێزی :

مەحوی دەڵێ :

نەپێیەك هـــەڵگری شـوێنیێ، نە دەسـتێ گەییە دا وێنی
خـــودا ! دەرحـەق بە ئەحواڵی منی بێ پاوو پەل،چارێ !

واتە: نە پێ یەکی گورج و گوڵم هەبوو بتوانی شوێن پێی یار هەڵگری و بزانی لە کوێییەو پێی بگات، نە ئەو دەستەشم هەبوو بتوانی بگات بە داوێنی یار سا..خوایە چارێکی منی بێ دەست و پێ بکە.))[2]

مەحوی کەدەڵی: "خودا واتە:خودایە یان ئەی خودایە ئامرازی بانگ کردنی (ە)یان(ئەی) نەوتووە، تەنیا بانگ کراوی وتووە، بۆ ئەوەی کێشی شیعرەکەی لەنگ نەبێ،ئاوازو خوێندنەوە ئاماژە بە بوونی ئامرازی نەوتراو دەکات ،مەبەستیشی لەم بانگکردنە پاڕانەوە و دەرخستنی بێ

---

[1] علم المعانی (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود ) ل ٤١١

[2] مەحوی دیوان لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ل ٣٠٠

هێزی خۆیەتی هەروەك لەڕەوتی ڕستەكە دەردەكەوێ، لە لا یەكی تریش بانگكردن بەمانای بنەڕەتی ناشێ بەرامبەر بەخوای تاك وتەنیا .

**٢-بۆ ئامۆژگاری :**

نالی دەڵێ :

**ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا، هەتاكەی حیرصی وێرانە !**
**لەگەڵ ئەم عەشقبازانە بڕۆ بازانە ئازانە**

مانای وشە: بووم ئاسا: عادە ت وەك كوندە بەبوو .بازانە : وەك باز.ئازانە: ئازایانە .

واتە:((ئەی نەفسی حەز لە ئاوەدانی نەكردوی وەك كوندە بەبوو وێرانە نیشین: ئەم دنیایە لە چاو ئەو دنیادا وەك كەلاوەی وێرانە وایە،دەسا تۆ تاكەی دەس بەرداری ژیانی ئەم كەلاوە وێرانەیە نابی؟! ئازایانە هەڵسە، وەك بازی تیژ پەڕ، بفڕە و، لەگەڵ عاشقانی ڕێگای ڕاستیدا ڕوو بكەرە ئاوەدانی عەشق و خواناسی .))[1]

نالی لەم دێڕدا كە دەڵێ: (ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا) ئامڕازی (ئەی) بۆ بانگكردنی ڕاستەقینە بەكار نەهێناوە،چونكە نەفس بە شێوەی ڕاستی بانگ ناكرێ، بەڵكو بۆ مەبەستی ئامۆژگاری بە كاری هێناوە هەروەك لە ڕەوتی ڕستەكە دەردەكەوێ .

---

[1] دیوانی نالی لێكۆڵینەوەی مەلا عبد الكریمی مدرس ل ٤٨٢

### ٣- بۆ سوکایەتی پێ کردن :

نالی دەڵێ :

وا خـوانی کەنــاری من بـۆ نــوقـڵی دەم و ماچـە
ئەی لووتە خۆری تەکیە، سا تۆ لە کەنارت چی!

مانای وشە: کەنار :داوێن . لووتە خۆر:بخۆری پارووی زل. کەنارە: قەراخ . لێوار.

((واتە:کۆشی من کە ئەڵێی سفرە و خوانی ڕاخراو و ڕازاوەیەو پڕیەتی لە شیعری جوان، تەرخانە بۆ باسی دەم و ماچی دەمی وەك نوقڵ و بچووك و شرین و خۆشی یار. تۆیش، ئەی کابرای پاروو زل گلێنی ناو تەکیە، پیاوی ئەم مەیدانە نیت و شایانی ئەوە نیت بێیت لە قەراخی ئەم سفرەیەدا دانیشی و دەستی بۆ ڕاکێشی..))[1]

نالی کە دەڵێ: ئەی (لووتە خۆری تەکیە) مەبەستی مانای پەیوەستە کە ڕەوتی ڕستە ئاماژەی پێ دەکات واتە:کەسێکی هیچ و بێ بایەخ و بێ دەسەلات. بۆ ئەو مەبەستەش ئامرازی (ئەی) بە کارهێناوە کە بۆ بانگکردنی (کەس) بەکاردێ بۆ نێرومێ و کۆمەڵ.

### ٤-بۆ دەربڕینی دڵسۆزی :

قانع دەڵێ :

ئەی وەتەن دەردت لە دڵما، زامی سەد خەنجەر ئەکا
بۆ بـڕینی جەرگی لەتـلەت ،ئیشی سەد نەشتەر ئەکا([2])

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٦٤٥

[2] دیوانی قانع کۆکردنەوەی برهان قانع ل٤٤

قانع لەم دێڕە شیعرەیدا کە دەڵێ:(ئەی وەتەن ) مەبەستی دەربڕینی دڵسۆزی خۆیەتی هەر وەك لەڕەوتی ڕستەکە دەردەکەوێ بۆ ئەو مەبەستەش ئامرازی (ئەی) بەکارهێناوە وەتەنی وەك کەسێك سەیرکردووە.

**٥- بۆ سەرسامی و وەسف کردن :**

نالی دەڵێ :

ئەی سەرووی بوڵەند قەددو، برۆ تاق و، مەمك جووت!
کێ دەستی دەگاتە بەی ونـاری نە گەیشـتـووت ؟!

واتە:((ئەی یاری بالا ٚوەك سەروو بەرزی، برۆ وەك تاق کەوانی، مەمك دووان، تۆ بالآت ئەوەندە بەرز بێ،کێ دەستی ئەگاتە جووتە مەمکی وەك کاڵە بەی و جووتە گۆنای وەك هەنارت کەهێشتا پێ نەگەیشتوون؟!))[1]

نالی لەم دێڕەدا سەرسامی خۆی پێشان دەدا بەو سیفەتانەی کەلەیارەکەی دا هەیە،ئەم سەرسامیەشی بەبەکارهێنانی (ئەی) دەربڕیوە.

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ل ١٥٢

# ڕاهێنان

نالی لەم دێڕە شیعرانەیدا بانگکردنی بۆ چ مەبەستێك بەکارهێناوە ؟

١–ئـــاسمان هــــەورین دەبــــیٚ ئێمە بەغــەمگینی دەڵێین
ئـــەی خودا چ بکەین لەژێرئەم کــاولەی کـــەس تیا نەماو

٢–لە دووری تۆیە ئەی خورشیدی پڕتەو بەخشی شەو گەردان
کە نــــالی لـــــە حالەتی میحاقی مــــاهی نـــەو دایە

٣–هەی کەرێکم بــــوو چ پەیکەر طە ی کــە ری هەوراز و لێژ
ســـینە پان و مووچە کــــــورت و شانە بەزو گـــــویٚ درێژ

٤–قوربــــــانی تۆزی ڕێگەت بــــم ئەی بــادی خۆش مروور
ئــــەی پەیکی شــــــارەزا ، بە هەمـوو دەشتی شارەزوور

**پێنجەم خۆزی** (**ألتمنی**): داوا كردنی شتێكە بەهۆی یەك لەو ئامرازانەی تایبەتن بەو مەبەستەو، شتەكەش لەوانە نەبێ بێتەدیَ.[1]

ئەوەی لەم پێناسەیە بۆمان دەردەكەویَ، بەدی نەهاتنی شتی داواكراو بە شێوازی خۆزی وەك ئەم شێوانەی خوارەوە دەبێ:

١- نەهاتنە دێی لەبەر ئەوە بیَ شتەكە ڕابردوو بیَ و بەسەر چووبیَ .

نالی دەڵیَ :

هەموو ڕۆژیَ لە تاو هیجرانی ئەم ســـاڵ
تـەمـەنـنای مـــردنی پێـراره بیَ تـۆ([2])

نالی لەم دێڕە شیعرەدا تەمەننای لەجیاتی(خۆزی یان بریا) بەكارهێناوە، خۆزگەی بۆ مردنی پێرارە، ئەمەش بەدەست هێنانی شتێكی مەحاڵەو نابیَ .

ب/نەهاتنەدێی لە بەر ئەوەبیَ چونكە نەویستراوە:

محسن دەڵیَ :

هەژارێك دەست پـــــاك ،بەدەنگ دەگــــریا
لەبـــەر نەبوونی، هـــەر دەی گـوت بـــریـا
منیش گـــەنـدەڵبام ، وەك گەندەڵكـــــاران
بـــۆچی وام نەكـرد، بۆ نەبووم وریـا؟!([3])

---

[1] جواهرالبلاغه(أحمد الهاشمی)ل١٠٣

[2] نالی دیوان لێكولینەوەی مەلا عبد الكریمی مدرس ل ٣٨٤

[3] گوڵزاری هۆنراوە. دەستنووس

دەست درێژ کردن بۆ گەندەڵی شتێك نییە لەوانەبێ نەبێ، بەلآم بە کەسانی دەست پاك و خۆ پارێز ناکرێ، باری دەرونی و دەردی هەژاری وادەکات بریای بۆ بلّێ بەلآم ڕوودانی مەحاڵە،چونکە بەلایەوە نەویستراوە.

٢- شتێکە ویستراوەو ڕانەبردووە،بەلآم بوونی ئەستەمەو لەدەسەلآت دانییە: وەك

محسن دەڵێ:

کۆێرێـکی زکمــاك، هــــەر دەیوت بـریــــا
بــــە دەریــاوانــی ، بــــم دیبــا دەریــــا
چ ســــــەرسوڕمـــانی، لەخـۆ گــــرتووە؟!
ئینجـــــا بمردبـــــام ، ئەو دەم لـە خـۆشیا([1])

دەریاوانی شتێکی ویستراوە، بەلآم بوونی بۆ کوێر ئەستەمەو نابێ .

لە پێناسەی خۆزی وتمان شتەکە لەوانە نەبێ بێتەجێ، ئەمەش واتە ئەگەر لەوانە بوو بێتەجێ، ئەو کاتەدەبێ بەهیڤی وەك قوتابیەکی زیرەك بلّێ بریا دەبووم بە ئەندازیار، ئەندازیاری بۆ قوتابی تێکۆشەر و زیرەك شتێکە لەوانەیە ببێ بەئەستەم دانانرێ .

لە زمانی کوردی چەند ئامرازێك بۆخۆزی بە کارهاتوون لەوانە :-

(خوزگە ، خۆزی ، بریا ، کاشکی)

خوزگە،خۆزی: هەردووکیان یەك ئامرازن بۆیەك مەبەست بەکاردێن .

---

[1] گوڵزاری هۆنراوە (محسن احمد مصطفی) دەستنووس

خادیم دەڵێ :

خۆزگە ئەمـــزانی بە خادیم تۆ بەچی ڕحمێ ئەکـــەی؟
یـــــا دوعا یائیلتیجا، یـا پاڕانەوەم بێ بەکەرەم

واتە:((وای دەنا بمزانی بایە کەرەم بەخشی تۆ بۆ خادیم بەچی ئەبێ بەدوعا یان ئیلتیجا یان بەکەرەم؟ ))[١]

ئامرازی (بریا) وەك (خوزیا) بۆ هەمان مەبەست بە کاردێ. وەك بریا ئێوە هەمووتان زیرەك بوونایە.

کاشکی: ئەمەش ئامرازێکی ترە بۆ واتای خۆزگە هاتووە، فارسیە.

صافی دەڵێ :

ئەی کاش شـــەوی هیجران بووبا بە صـــباح الخیر
چـونکێکە لـــە ڕۆژی ڕووی نـەظەرێـکم بـــــوو

ئەی کاش کورتکراوەی(کاشکی)یە واتە: خۆزگە بوو بایە (صباح الخیر) بوو بایە سبەینەی خێرو خۆشی، خوزگە شەوی هیجران ڕۆیشتباو بوو بایە ڕۆژی بە یەك گەیشتن و چاك و چۆنی و لە یەکتر پرسین و دواندن[٢]

**بنچینەکانی ڕستە لە زانیستی واتاناسی**

ڕستە لەزانستی واتاناسی لەسەر دووبنچینەی سەرەکی دادەمەزرێ،یەکیان پاڵپێنراو (ألمسندإلیه)یە ئەوەی تریان پاڵنراو(ألمسند)ە ئەوەی بەر لەم دووانەش لەڕستەدا تەواوکەرە. بکەر لەڕستەدا ئەو کەسە یان ئەو شتەیە

---

[١] دیوانی خادیم لێکۆڵینەوەی (جمال محمد محمد أمین)ب ١ل١٨٢

[٢] دیوانی صافی لێکۆڵینەوەی محمدی مصطفی هیرانی ل ١٦٠

کارێکی تەواوی بەبێ یاریدەی درابێتە پاڵ و کردبی بە بکەرو مانای تەواو و سەربەخۆ بەدەستەوە بدات.

نیهاد: ئەو کەسەیە یان ئەو شتەیە هەواڵ(خبر)ێك یان سیفەتێکی درابێتە پاڵ و کردەوەیەك نیشان بدات بە یاریدەی وشەی تر.وەك وشەی(بوو) بۆدەمی کاری ڕابردوو یان بۆ دەمی کاری ڕانەبردوو (ئاینده)وەك (ە)کەیەك لە وەزیفەکانی جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی تاك و کاری ناتەواوە بۆ کاتی ئێستا.مامۆستا(نەریمان خۆشناو) دەڵێ:(ە)جێناوی لکاوە بۆکەسی سێیەمی تاکە و بۆنیهاد دەگەڕێتەوە، هیچ جۆرەکارێکی تێدانییە،کە دەڵێین سەرباز ئەندازیارە(سەرباز)نیهادە( ئەندازیار) گوزارەیە(ە)جێناوی لکاوەبۆ نیهاد دەگەڕێتەوە، رستە کە بەم شێوەیە بێ دەبێ بە ڕستەی ناوی (ألجملةالإسمية) ئەمەش واتە ڕستەی ناوی لەزمانی کوردی بوونی هەیە، ئەگەر نیهاد ناوی تایبەت بوو:یان ناوی کەسێ بوو: یان جێناوی سەربەخۆ بوو بۆ کەسی سێیەمی تاك.[1]

بەم شێوەیەی کەباسمان لێوەکرد رستە لەزمانی کوردی دەبێ بەسێ جۆر:

١- ڕستەی کاری تەواو: ئەگەرلەڕستە کە کاری تەواوی بێ یاریدە درابوە پاڵ بکەر،لەهەر ڕستەیەك کاری تەواو هەبێت ئەوا چەمکی بکەرو بەرکاری ڕاستەوخۆ یا خود تەنیا بکەر لەڕستە کە بوونی دەبێت. مەبەستیش لەکاری تەواو ئەوەیە کات و ڕودانی تێدابێ و کارەکەش لەڕووی هێزەوە تێپەربێ یان تێنەپەڕبێ، وەکو ئێوەی تێکۆشەر سەردەکەون .

---

[1] سەلام ناوخۆش ـ نەریمان خۆشناو زمانەوانی ل١٦١-١٦٢

٢– ڕستەی کاری ناتەواو:(بەو ڕستانە دەوترێت ،کەواکارەکانیان لەجۆری ناتەواو دابێت، کارا(بکەر)بەکارەکە هەڵناستێت و کارەکە لە سنوورێکی ناتەواوی و بێ هێزی بخولێتەوە.[1]

ئەمەش واتە کاری ناتەواو لەڕووی هێزەوە تێنەپەڕەو بەکارنایێ، تەنیا بەچوونە پاڵ وشەیەکی تر نەبێ کە پێی دەوترێت تەواو کەری کاری ناتەواو ،لەوکاتەش بکەرو بەرکاری ڕاستەوخۆ بوونیان نابێ پێکهاتەی ئەم جورە ڕستەیەش بریتیە لە نیهادو گوزارە.وەکو شیرزاد زیرەکە .

٣–ڕستەی ناوی (ألجملة الإسمية ) ئەگەر لەڕستەکە نە کاری تەواو هەبوو نە کاری نا تەواو،نیهادیش ناوی تایبەت بێ، یان ناوی کەسێ بی، یان جێناوی سەربەخۆ بوو بۆ کەسی سێیەمی تاك.[2]

ڕستە لە زمانی کوردی کە ئەم سێ جۆرەی هەبێ لە واتاناسیش بە هەمان شێوەیە، بەڵام بنچینەکانی لە هەمووشوێنێك وەکو یەك نابێ، جاری وادەبێ لە بنچینەکانی پاڵ پێوەنراو(بکەر - نیهاد) یان پاڵنراو (کار،گوزارە) لە ڕستە لادبرێ لەبەر چەند هۆیەك :

**یەکەم لابردنی بکەر یان نیهاد:**

**١- لەبەر دوو بارە بوونەوە ئەگەر لەڕستەی پێشەخۆی ناوی هاتبوو .**

نالی دەڵێ :

پێم دەڵێن: محبوبە خیڵەو قیچەمەیلی شەڕدەکا
خێل و قیچە،یا تەرازوی نازی نەختێ سەردەکا؟!

---

[1] زمانەوانی سەلام ناوخۆش - نەریمان خۆشناو ل١٦١–١٦٢

[2] ڕێزمانی کوردی بەشەکانی ئاخاوتن نەریمان خۆشناو ل ٧٢–٧٣

((نالی لەم غەزەلەیدا بەر پەچی ئەوانە دەداتەوە کەخێلی حبیبەیان بە عەیب داناوە، دەڵێن:خۆشەویستەکەت خێل و چاو لارە خیسە لەخەلکی دەکات وەك بلێین شەڕیان پێ دە فرۆشێ، نەخێر نەخێلەو نەخێسەش لە کەس ئەکا تەنها ئەوەندەیە تەرازوی نازی  کە چاویەتی کەمێك سەر ئەکا بەسەر لایەکا ناز  زۆر تر ئەکا تا بەسەر لایەکەی ترا.. سەرکردنی تەرازوو ئەوەیە کە هەڵی ئەبڕی  هەردو سەرەکەی هاوسەنگ نەبن ))[1]

لەنیوەی یەکەمی ئەم دێڕەدا نالی ڕستەی (مەحبوبە خێل و قیچە)ی هێناوەتەوە لە

نیوەی دووەمی دا دیسان هەمان دێڕی  هێناوەتەوە، بەلأم بەبێ هێنانەوەی بەشی نیهاد کە مەحبووبەیە تەنها وتوویەتی (خیل و قیچە) ئەمەش لەبەر ئەوەی ڕستەکە  لە پێشدا هاتووەو، گوێگر لە مەبەستی دەگات و پێویست بە دووبارە کردنەوە  ناکات.[2]

**٢-لەبەر ئەوەی بکەر لەلایان خەلکەوە ناسراو بێ :**

نالی دەڵێ :

دەفەرمووی چـــاوەکەت زنجیرکە((نالی))!
کـــە مـوطلق چـانییە ئینـــسـانـی هـەرزە

واتە:((ئازیز! تۆپێم ئەفەرمووی چاوت وەك ئینسانێکی هەرزە وایە یا بیبیلەی چاوت وەك کەسێکی هەرزەو بێ تەربیەت وایە، بەرللأبێ و کەس لێی نە پرسێتەوە چی ئەکا. بۆیە کەوتووەتە دووی من و هەر تەماشای من

---

[1] دیوانی نالی  لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل  ١٠٨

[2] هونەری ڕەوانبێژی لەشیعری نالی داعبدالسلام سالار ل٢٥٨

ئەکا .بیبەستەوەو مەهێڵە دوام بکەویّ،چونکە باش نییە ئینسانی هەرزە،یا چاوی هەرزە بەرەڵلا بکریّ و جلەوی بۆ شوّڕ بکریّ))[1]

نالی لەنیوەی دێڕی یەکەم کە دەڵێ (دەفەمووی) ناوی بکەری نە بردووە کە حەبیبەی یاریەتی لەبەر ئەوەی خۆشەویستی ناسراوی نالی یە بەپێویستی نە زانیوە ناوی بێنی، بەڵکو بێ ناو هێنانی ڕاستەوخۆ کاری ڕانەبردووی ((دەفەرمووی)) داوەتە پاڵ .

**٣- لەبەر نەناسراوی بکەر:**

مەحوی دەڵێ :

پـرســــرا حـاڵـم، کە من کەوتـم لە بەر پێیا درێــژ
ئەو وتی: هەر سێبەری دیوم بوە سەرســـام و گێژ

واتە:((کە لەبەر پێی یار درێژ کەوتم هەواڵمیان لێ پرسی ئەویش لە وەلآمدا وتی:

تەنها بەدیتنی سێبەرم سەرسام و گێژبووەو کەوتووە، ئەگینا نە دیومەو نەدیومی))[2]

(مەحوی) کە دەڵێ: (پرسرا حاڵم) بکەری لە بەر نەناسراوی باس نەکردووە کاری ڕابردووی نادیار کە(پرسرا) یە د راوەتە پاڵ حاڵ ) بووە بەجێگری بکەر .

---

[1] نالی دیوان لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٤٥٠

[2] دیوانی مەحوی لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل١٤٢

**٤- باس نە کردنی بکەر یان نیهاد لەبەر بەکەم زانینی :**

نالی دەڵێ :

گوتم: قوربـــانی تۆ من بم ،گوتی قوربانی تۆ سەگ بێ
گوتم: شیشەی دڵـم ناتوێ؟ گـوتی بۆچیمە مەکسـوورە

واتە:((بە یارم وت :بەقوربانت بم،کەچی ئەو ئەوەندە دڵی ڕەق بوو، دڵی شکاندم و لە وەڵامدا وتی: سەگ بە قوربانت بێ لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەست بەرداری نەبووم و پێشنیارم کرد کە شووشەی دڵمی بدەمێ بچێتە ناوی و ڕازی بێ بەخۆشەویستی و لە دڵما جێگیر ببێ، بەڵام قایل نەبوو وتی: تۆ دڵت شکاوەو، منیش ناچمە ناو دڵی شکاوەوە))[١]

لە دوایی دێڕی دووەم کە دەڵی:(بۆ چیمە مەکسوورە؟) نیهادی باس نە کردووە کە دڵە، نەی وتووە(دڵی مەکسوورە) ئەمەش لەبەر بەکەم زانینیەتی .

**٥- لەبەرپاراستنی کێشی هـۆنراوە :**

مەحوی دەڵێ :

وتی:میوەی بەهەشـتە شیعری((مەحوی))
خـــــودا نەبـڕێ لـــەباغـم داری بـــەردار

واتە:((یەکێك وتی: شیعری مەحوی ئەوەندەجوان و خۆشە وەك مێوەی بەهەشت وایە. سا خوایە داری بەری توانای شیعر وتن لەباغی ژینی من نەبڕی، بۆ ئەوەی هەمیشە شیعری جوانی وەك میوەی بەهەشت خۆش بڵێم))[٢]

---

١ دیوانی نالی لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٤١٠

٢ دیوان مەحوی لێکولینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ل١٢٠

مەحوی لە بری ئەوەی بڵێ(یەکێك وتی )تەنها وتوویەتی(وتی) بێ ئەوەی ناوی بکەر ببات ئەمەش بۆ ئەوەی کێشی شیعرەکەی لەنگ نەبێ .

گوتمان بکەر یان نیهاد زۆر جار وادەبێ لەڕستە باسیان لێوەناکرێ لەبەر چەند هۆیەك لەو هۆیانەش هەندێکمان باسکرد،بەلاّم باسکردنی هەریەك لەم دووانە"بکەر یان: نیهاد"بە پێویست دەزانرێ باس بکرێن ئەگەر هیچ بەڵگەیەك نەبوو ئاماژە بە بوونیان بکات،جاری واش دەبێ بەڵگەش هەیە بۆ لابردنیان لەگەڵ ئەوەشدا پەسند وایە لە ڕستەدا باسیان لێوەبکرێ، پەسندی باسکردنیشیان ئەمانەن :

**١- بەراوردکردن لە نێوان دوو نیهاد یان دووبکەر یان زیاتر:**

نالی دەڵێ :

تــــۆ نەوشــکفتــە وەردی، من مایــلم بــە زەردی
تــۆ هەمسەرێنی ت نەسیمە،من هەمدەمم لەهیبە

((نالی دەیەوێ بۆ یارەکەی ڕوون بکاتەوە کە لە یەکتر دوورن پێی دەڵی: تۆ گوڵ غونچەیەکی تازە پشکوتوی بە ڕەنگ و بۆی هەروا تۆ هاوڕێی شنەی فێنکی بیابانی و تازە لە ڕووی ژیان ئەکرێیتەوە.منیش خەریکە زەرد دەبم، هاوڕێم هەناسەی گەرمی وەك بڵێسەی ئاگری دووری سوتاندمی و هەڵی پڕوزاندوم))[1]

نالی لەم دێڕدا چوار بکەری هێناوەتەوە کە(من ،تۆ) یە بەراوردی لە نێوانیاندا کردووە بەم شێوەی کە لە شیعرەکەی دیارە.

---

[1] دیوانی نالی لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٣٩٥

**٢- لەبەر بێ هێزی بەڵگەو، بێ هێزی تێگەیشتنی گوێگر:**

مەحوی وی دەڵێ :

دنیـــا تیاترۆیە،مەوەستە تیا بـڕۆ
کێ مـایەوە تیا، نە بووبێ تیاتڕۆ؟

مانای وشە: تیاترۆ، تیئاتر:تیاترۆخانە،جێگای دانس و پێشاندانی شانۆ نامە بە ئاوازو مۆسیقاو دانسەوە.لە زاراوەی میللی کوردیدا مانای دانسی نا شەرعی و ئافرەتی سەماکەری

نیمچە ڕووت و قووتی وەرگرتووە، بەڵام مەحوی مانا ڕاستەکەی بە کار هێناوە.ترۆ: بەدناوو ئابڕوچوو.

واتە:((دنیاوەك تیاترۆ خانە وایەو،شانۆنامەیە بە ئاوازو موسیقاو دانسەوە، بۆ ئەوکەسانە پێوەی پەیوەستن لە ڕێگای ئەو بەرنامەیە نین کە خوا بۆی داناون ، هەرکەسێکیش بەردەوام بوو لەسەر کارەکانی ئەم بەزمەو ئەم شانۆ نامەیە بیری لە کاری ڕاستی خوا نەکردەوە، یاساکانی ئەوی جێبەجێ نەکرد، ئەوەئەبێ بە کەسێکی ترۆ و بەدناوو ئابڕو چوو))[1]

ئەگەر مەحوی دەست نیشانی نیهادی نەکردبایە کە دنیایە ئەو کاتە بەڵگەیەکی وانەبوو ئاماژەی بۆ بکات،خوێنەر یان گوێگر بۆی هەبوو نیهادێکی تری بۆ دانابا وەك ئەم (شوێنە) یان (ئێرە) ئەو کاتەش ئەو مەبەستەی بە دەستەوە نادا،بۆیە دەبێ نیهاد بگوترێ کە (دنیایە).

---

[1] دیوانی مەحوی لێکۆلینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٣٥٣

**٣- بۆ پەرچدانەوەی کەسانی بێ بروا :-**

مەحوی دەڵێ :

ئەوهادی سوبول، تەنیا ئەوە مەبعوثە بۆسەر کول
بۆخەتمی ڕوسول، خاتەم ئەوە تاجی ڕەسوولانە([1])

(ئەو) جێناوە بووە بە نیهادو باسکراوە مەبەستی بەرپەچدانەوەی کەسانی بێ بڕوایە.

**٤- بۆ دەربڕینی گەورەیی نیهادیان بکەر:**

مەحوی دەڵێ :

بێ حیسابە گەر گوناهم، باکم چییە !
حەضرەتی ئەو شافیعە ڕۆژی حیساب([٢])

(ئەو) جێناوە بووە بە نیهاد، مەبەست لێی پێغەمبەرە(د.خ)بەکار هێنانی لێردا بۆ دەربڕینی گەورەیی ئەو زاتەیە کەخاوەنی ئەم پلە بەرزەی شەفاعەتە لە ڕۆژی دوایی.

**٥- بۆ ئاماژەکردن بەکەمی و زۆری بکەر یان نیهاد :**

نالی دەڵێ :

عومرێکە بەمیزانی ئەدەب توحفە فرۆشم !
زۆرم وت و کەس تێنەگەیی،ئێستا خەمۆشم !

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٤٢٦

[2] هەمان سەرچاوە ل٤٤

((واتە: دەمێك بوو بەسەنگ و تەرازووی ئەدەب شیعری جوانم بە ناو خەلکا بلآوئەکردەوە، و عەنتیکە فرۆشیم ئەکرد. بەلآم ئاستی تێگەیشتنی خەلك ئەوەندە نەوی بوو، هەرچیم وت کەس لێم حالی نەبوو! بۆیە ئێستا وابێدەنگ بووم ! ))[1]

(کەس)جێناوی نادیارە بکەرە بۆکاری ڕابردووی نەری (تێ نەگەیی) نالی گەر بکەری باس نەکردبا کە(کەس)ە زۆری وکەمی ناتێگەیشتوان لە شیعرەکانی نەدەزانرا،بەلآم بەباس کردنی بکەر دەرکەوت ئەوانەی لە شیعرەکانی ئەو ناگەن زۆرن،چونکە(کەس) لێرە بۆ گشتی بەکار هاتووە.

**٦- بۆ سووکایەتی کردن بە بکەر یا نیهاد :**

مەحوی دەڵێ :

ئەربابی غینا ئەوەندە غەررە بەزەڕن
بێ بۆنی بەهارو دیتنی جۆ دەزەڕن

مانای وشە:

ئەربابی غینا : دەولەمەندان .غەررە : مەغرورو بایی بوو.

واتە:(دەوڵەمەندەکان ئەوەندەبایی بوونە،بەو زێڕو زیوەی هەیانە، سروشت و ڕەوشتی نێرەکەری دابەسراویان وەرگرتووە، بێ ئەوەی بۆنی بەهاریش بکەن ،یان دەنکە جۆیەکیان چاو پێ کەوی هەمیشە لە خۆیانەوە دەزەڕێنن))[2]

(ئەربابی غینا) نیهادە مەبەست لە باسکردنی بۆ سوکایەتی یە.

---

[1] نالی دیوان لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٢٨٠

[2] دیوانی مەحوی لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٣٤٩

یاوەك دەڵێ :

لا لغاوی واعظ ئەمڕۆ مەوج ئەدا ،دەم پڕ لەکەف
ڕیشی قیروسیا،کتێبی وە عظە کەی بوو بەرتەڕف

مانای وشە :

بەرتەڕف: فەوتاو کەلك پێوە نەماو .

واتە:((واعیظ ئەوەندە چەنەی داوە دەمی پڕبووە لەتف و کەفی دەریای دەمی لە لالغاویەوە شەپۆل دەدا، چش لە ڕیشی کە کەفی پێدا دێتە خوار،خەمی کتێبەکەی بەر دەستیمە ئەوەندە پڕژی کەفی لێ کەوتووە کەلکی هیچی پێوە نەماوە))[1]

(لالغاوی واعیظ) بکەرە بۆ کاری ڕانە بردووی (مەوج ئەدا) مەبەست لە باسکردنی بۆ سوکایەتی پێ کردنە.

---

[1] دیوانی مەحوی لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل١٧٤

## ڕاهێنان

لەم دێڕە شیعرانەی نالی دا بکەرو نیهادی لەچەند شوێنێ کە باس نەکراون دەست نیشانیان بکەو هۆی باس نەکردنیشیان دیاری بکە:

١-ماچی دەمەکەی دامێ ، کەدامێ سەرو مالّم
بنوارە چ صەبیادە، چ جەللادە بەحالّم

٢-وتم داخۆ چییە سوورو سپی تێکەڵ ؟! کەتێفکریم
سەراسەر کەللەیی وشتر، لەباڵەب خوێنی ئینسان

٣-وەی کەڕوزەردی مەدینە و ڕووسیاهی مەککە خۆم
دەرکراوو دەربەدەر ، یارب ، دخیلی عەفووی تۆم

٤-هەموو ڕۆژێ لەتاو هیجرانی ئەمساڵ
تەمەننای مردنی پێرارە بۆ تۆ

**لابردنی پاڵنراو ( حذف المسند ) کار یان گوزارە یان هەواڵ.** زانایانی واتاناسی ئەو جێگایانەیان دیاری کردووە بۆ لابردنی هەر یەك لەمانە بەبێ ئەوەی زیان بەواتای ڕستەکە بگەیێنی، بەڵکو لابردنیان دەبێ بە پێویست لەچەند شوێنێك وەك:ـ

**١- لابردنی لەبەربوونی پەیوەستێك ئاماژە بەبوونیان بکات:**

**هێمن دەڵێ:**

تۆی لـــــە من ون کردو منی لـە تۆ دوور
ئەو بستۆکەی دوژمن ناوی نا سنوور[1]

(هێمن) کە دەڵێ:(تۆی لەمن ون کرد) کاری ڕابردووی (ون کرد) پەیوەست و ئاماژەیە بۆکاری ڕابردووی لابراو لە(منی لەتۆدوور) واتە:منی لە تۆ دوور کردەوە.

**٢- لابردنی لە بەر دووبارە بوونەوە :**

**مەحوی دەڵێ :**

بەخـۆکـوشتن نەجاتی خۆ بدە((مەحوی))وەکوو فەرهاد
لە زۆری قەهرەمانی عیشق، ئەفەندم، هەر ئەجەل بەستە

واتە:(وەك چۆن فەرهاد لە پێناوی خۆشە ویستی شیریندا خۆی بەکوشتدا، چاری تۆیش ئەوەیە هەر لەو ڕێگایەتدا بەردەوام بی تا بەکوشت دەچی، چونکە تەنها ئەجەل و مەرگ (بەستی) دڵدارە لە ڕووی قارەمانێکی وەك(عیشقدا)[2]

---

[1] تاریك وروون هێمن ل ١٨٤

[2] دیوانی مەحوی لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل١٩٩

مەحوی کەدەڵێ (وەکو فەرهاد) واتە:چۆن فەرهاد نەجاتی خۆی دا بەخۆ کوشتن.کاری لابردووە بۆ ئەوەی دووبارە نەبێتەوە .

**٣- لابردنی لەبەرئەوەبێ کارێکی هاوشێوەی لە پێشەوە هاتبێ دەست نیشانی کاری لادراو بکات**

مەحوی دەڵێ :

خە ط و زاری کەبـــاسـی کەوتە گـوڵـزار!

کەچ ئەستۆما وەنەوشە، غونچە دڵ تەنگ!

مانای وشە: خە ط : موو.زار: دەم .کەچ ئەستۆ:مل لار .

واتە:(( کەباسی دەمی بچووك و مووی ناسکی دەم و چاوی یار گەیشتە ناو باخ و، وەنەوشە لە شەرمەزاریدا ملی کەچ کرد، چونکە خۆی لە ئاستی مووی ئەو دا بە هیچ هـاتە پێش چاوو غونـچەش دڵ تەنـگ بـوو، چونکە دەمی ئەوی لـەخۆی بە نەپشکووتویی و بچـووك تر دی!))[1]

مەحوی کە دەڵێ (غونچە دڵ تەنگ)واتە: غونچەدڵ تەنگ بوو زانیویەتی کاری (بوو) لابردنی لەدڵ تەنگ کار ناکاتە سەر مانا، چونکە کارێکی هاوشێوەی لە پێشەوە هاتووە کە(کەچ ئەستۆما)یە بۆیە لای بردووە وەنەوشە کەچ ئەستۆبێ، دەبێ غونچەش دڵ تەنگبێ .

**٤-لابردنی کار بۆ بە هێزبوونی مانا:**

قانع دەڵێ :

لەم حاڵەتی مەحکومی یە بێـزار لە ژینـم

هاوارە دەساغیرەتێ، ئەی کـۆمەڵی شێـران([2])

---

[1] دیوانی مەحوی لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٢٦٦

[2] دیوانی قانع کۆکردنەوەی برهان قانع ل ١٥٨

قانع که دەڵێ (غیرەتیێ) واتە:غیرەتیێ بکەن کارەکەی لابردووە بۆ ـەهێزی مانا .

**٥- لا بردنی لە بەرئەوەبێ چەمکی بکەر دەست نیشانی جۆری کارەکەبکات :**

مەحوی دەڵێ:

ئەوی ئیمڕۆ بە دەوری تەختیا هەلهەلـەی مەخلـووق
لەدەوری نەعشیا سبحەی دبێنی وەلوەلەی مەخلووق

واتە:(دنیا تا سەر بۆکەس نامینیێ،ئەوەی ئیمڕۆ پادشایەو خەلك بە ـەوری تەختەکەیدا قوولولوو شادمانی دەکێشن، سبەینێ بە دەوری تەرمەکەیدا،شین و زاری دەکەن))[1]

(هەلهەلەی مەخلوق و وەلوەلەی مەخلوق) هەردووکیان بکەرن ئامارە بە بوونی کاری لابراو دەکەن چەمکی ئەم جۆرە وشانە خۆیان دەست نیشانی کارەکەیان دەکەن هەرچەندە باسیش نەکرابێ.

---

[1] دیوانی مەحوی لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ١٨٠

## ڕاهێنان

ئەم فەرمانانە چین و لەبەرچی لەم دێڕە شیعرانەی نالی نەهاتوون ؟

١–مـــــن گریە ئەتۆ خەندە بەیەکدی دەفـــرۆشین
مــن لەعلی بەدەخشـــــان و ئەتۆ لوئلوئی لالا

٢–ئـــــەو چـــاو غەزالە ، فەتەراتی ســـــەروماڵە
ئەونەرگسە کـــــاڵە نەمنی هێشت و نەکـــاڵا

٣–لێوی تـــــۆ ئـــــاوی بەقـــــا مــــــن خضرم
فەیضی تـــــۆ ڕەحمەت و مـــــــن زەوزەگـــــیا

٤–چـــــاوێ بخەلە ســـــەبزەوو سیرابی دائیرە
جێی جیلوە گاهی چاوە کـــەمە نەرمە یانەزوور

## سێیەم: پێشخستنی کار یان گوزارە :

**ڕستەلە زمانی کوردی لەسەردوو بنچینە دادمەزرێ :**

١ – بکەر وکار . ٢– نیهادو گوزارە .

مەبەست لە بکەر ئەو کەسەیە یان ئەو شتەیە کە لە ڕستەدا کارێکی کردووە، یان کارێکی دراوەتە پاڵ و شوێنی بکەرەکە لەڕستەدا پڕ دەکاتەوە.[1]

مەبەستی لە نیهاد ئەو بەشەی ڕستەیە،کە شتێکی خراوەتە پاڵ و هیچ شتێ ئەنجام نادات ).[2]

گوزارە:((ئەو شتەیە کەدەخرێتەپاڵ نیهادەکەو، هەمیشەکارێکی ناتەواوی لەگەڵ دایە))[3]

بکەر لە زمانی کوردی لەپێش کاردێ، نیهادیش لەپێش گوزارەدێ، بەڵام هەندێك جار لەبەر مەبەستێك، زانستی واتاناسی وادەکات پاش و پێش لەڕستەدا ڕوبدات، واتە:کار پێش بکەر بکەوێ، یان گوزارە پێش نیهاد بکەوێ مەبەستیش لە پاش و پێشخستن زۆرن لەوانە:

**١- پێشخستن بۆخێرایی کردن لەخۆشی دمربڕین :**

جزیری دبێژی :

| | |
|---|---|
| هات پادشاهی پرســــیاه | قامەت ئەلیف دیم شبهی ماه |
| دادو مەدەد سەد ئاهو واه | زولف و عەقاریب تێنەســەر |

---

[1] ریزمانی کوردی بەشەکان ئاخاوتن نەریما ن عبداللە (خوشناو) ل٢١

[2] هەمان سەرچاوە ل٧٤

[3] هەمان سەرچاوە ل٧٤

واتە: پاشای خاوەن سوپاو لە شکری زۆر- کەسانی ئەڤینداری ئەون - بۆ لای ئێمە هات، بەژن و بالآی کە وەك(ئەلیف) وایە لەڕاستی و ڕێکیدا، ڕووی وەك مانگ وایە لەجوانی و تیشك دانەوە، ئێمەش داوای دادپەروەری و ئینساف دەکەین دەربارەی مافی خۆمان،داوای یارمەتی و بە هاوار هاتنی لێ دەکەین بۆ ئەو بارو دۆخەی کەئێمە پەیوەست و دووچاری بووین ، ئاخ ئاخ لە کاری گەری ئەو زولفە ئالۆزاو و پێچ خواردووەی،کەوەك کلکی دووپشك بەسەر ڕووی جوانی هاتووتە خوارەوە.[1]

جزیری لە بری ئەوەی بلێ پادشای پڕسیاە هات، وتوویەتی(هات پادشاهی پڕسیاه) هات کاری تێپەڕی ڕابردووە درواتە پاڵ ( پادشاه) و کردوویەتی بەبکەر، مەبەستیش لە پێشخستنی کاری (هات) بایەخ دانە بە هاتنی (پادشا) چونکە هاتنی پادشا کە یارە بە لایەوە لەوپەڕی خۆشی دابوو، بۆیە لەپێش هەموو شتێك دەڵێ: هات .

**٢-بۆ خێرایی کردن لە دەربڕینی خەم و پەژارە :**

هێمن دەڵێ:

لـەبـەر ئازاری ژیـنـی نــــــالەبـاری
دەنـــاڵی بـولبولی شـەیدا بە زاری([2])

وشەی شەیدا هاوەڵناوە دیارخەری ناوی بولبولە، چونکە واتای وشەی بولبولی تەواو کردووە کە بکەرە،(بەزاری) هاوەڵکارە تەواوکەری کاری ڕانەبردووی (دەناڵی)یە شاعیر لە بری ئەوەی بلێ (بولبولی شەیدا دەناڵی

---

[1] العقدد الجوهری/ شرح احمد الزڤنگی أحمد الجزری (الشیخ) ب١ ل٢٤٧
[2] تاریك و ڕوون هێمن ل ١١٢

وتوویەتی(دەناڵی بولبولی شەیدا)کاری ڕانەبردووی (دەناڵی) پێشخستووە
ونەوەی هەر زوو ناڵینی بولبول ڕابگەیێنێ .

**٣- پێشخستن بۆ ئاشکراکردنی حاڵ و شانازی بەخۆ کردن :**

نالی دەڵێ :

حەرەکاتم سەکەنات و، سەکەناتم حەرەکات
چوستە سستی،قەوییەضعیف و،سەریعەکەسەلم

مانای وشە:

حەرەکات:جوولە.سەکەنات:دامرکان.چوست :چالاک .کەسەل: تەمەڵی.

واتە:((جولەم وەك دامرکان وایەو کەس پێی نازانی،کەچی لە ڕاستیشدا
هەر لەحاڵی جولە دام وکار ئەکەم و تاوێکیش دامرکانم نییە، هەمیشە هەر
ە جوولەو کاردام، سستیم لە ئاستی بژێوی خەڵك دایەو بێ هێزیم لە
ـستی هێزدا یەو تەمەڵیم لە ئاستی پەلەکردن یانایە. مەبەستی ئەوەیە،
ە هیچ دا لەکەس ناچم و لە هەموو دیمەنێکی بژێوی ئادەمی زاد دا لە
خەڵك بالاً تـرم))[1]

لە نیوەی دێڕی دووەمی ئەم هۆنراوە شاعیردەڵێ :(سستی،ضعیف
.کەسەل)ئەم هەرسێ وشەیە ناون و نیهادن چونکە هەر یەکەیان
ـیفەتێکی دراوەتە پاڵ کە لەپێشی دا هاتووە (ە) لە وەشەی(چوستە،
قەوییە، سەریعە) کاری ناتەواوە بە یارمەتی وشەی چوست ،قەوی،
ـەریع، بوونە بە گوزارە.نالی لە بری ئەوەی بڵێ سستیم چوستە،ضەعیفیم

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ل٢٩٠

قەوییە،کەسەلم سەریعە، هەستاوە گوزارەی پێش نیهادی خستووە،ئەم جۆرە دەربڕینەشی بۆ نیشاندانی حاڵ و شانازی بەخۆکردنە

## چۆنیەتی شێوازی دەربڕین

تایبەتکردن،یەکسانی،کورتبڕی،درێژ بڕی ،پێکەوەنان ،دابڕین

کەسانی ڕەوانبێژو شارەزا لە گوزارشتکردن و دەربڕینی ماناو مەبەست دەتوانن ئەو شوێنانە هەڵبژێرن کە لەگەڵ باری گوێگرو خوێنەر دەگونجی:کامەیان لەم شێوازانە پێویستە :

## یەکەم: تایبەتکردن:التخصيص :

تایبەتکردن: ئەوەیە شتێك بە شتێکی تر تایبەت بکەی بەچەند ڕێگایەکی دیاریکراو.[1]

ئێمە گەر بەوردی لە دەقەکانی ئەدەبی کوردی بڕوانین دەبینین تایبەتکردن لە زمانی ئێمەی کوردیش جێگای خۆی کردوتەوە وەك ئەمانەی خوارەوە:

١–بە نەرێ(النفی) وجیاکردنەوە(ألإستثناء) :

ئەو ئامرازانەی بۆ نەرێ نەفی بە کاردێن :

(نە ، نەخێر ، نا) یە.

ئەو ئامرازانەش بۆ جیاکردنەوە بەکاردێن زۆرن لەوانە :

---

[1] جواهر البلاغە (أحمدالهاشمی) ل ١٧٩

(جگە، بێجگە، بەولاوە ، بەبێ، نەبی ، بترازێ ،لێ دەرچی ،غەیر)
(غیر) هەرچەند وشەیەکی عەرەبیە بەلاّم کورد زۆر لە دەربڕینەکانی بەکاری دێنیێ .

نالی دەڵێ :

ظاهرو باطن، لەســـەر لەوحی حەقیقەت یا مەجاز
ئاشنای سرری قەلەم بێ، غەیری نالی کەس نەما[1]

(غەیر) وشەی هەلاواردنە واتە: جگە لە نالی ( نالی) جیاکراوەیە(کەس) لێ جیاکرا وەیە (نەما) ئامرازی نەرێ (نفی) یە نالی دەڵێ: ئەوەی ئاشنای نەهێنی قەلەم بێ تەنیا منم، سیفەتی ئاشنابوون بە قەلەم تایبەتکراوە بە خاوەن وسف کەخۆیەتی بە هۆی ئامرازی نەرێ و جیاکردنەوە .

یاوەك هێمن دەڵێ :

قەت لە دنیا دا نەبوو بێجگە لە ناخۆشی بەشم
مات و داماوو پەشێوو بێ کەس و چارە ڕەشم![2]

(نە) ئامرازی نەرێی (نفی) یە(بێجگە) ئامرازی جیاکردنەوەیە (ناخۆشی) جیاکراوە (بەش)لێ جیاکراوە (هێمن) سیفەتی ناخۆشی تایبەتکردووە بەخۆی بە هۆی ئامرازی نەفی و ئامرازی جیاکردنەوە.
ألإستثناء:

---

[1] دیوانی نالی لێکوڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل١٣١
[2] تاریك رون(هێمن) ل١١٥

**٢- بە پاش و پێشکردن :**

مەحوی دەڵێ:

بێ کەس منم ،کەسێ لە زوبانم بگا نییە
هەمدەم خودا نەناسن ودەم پڕ لەیاخودا

((واتە:لەم دەریای دنیایەدا گەشتی ڕۆژگار ئەوەندەی دووری خستوومەتەوە گەیشتوومەتە شوێنێ کەس شك نابەم تیاداو کەسێ نییە لە زمانم حاڵی بێ و لە دەردم بگاو بە فریامەوە بێت، هەر چیم لەگەڵە بە دەم و دیمەن هەر یاخودا .. یاخودا..یانە لە خوادەپارێنەوە، کەچی لە ڕاستیشدا لە کۆمەڵێکی خوانەناس بەو لاوەنین.))([١])

مەحوی لەبری بڵێ (بێ کەس منم) دەبوایە بڵێ (منم بێ کەس) بەڵام مەبەست لەم دووا خستنەی تایبەتکردنە، واتە تایبەتکردنی بێ کەسی بەخۆی،یانی بێ کەسی ڕاستی منم، ئەمەش واتە تایبەتکردنی سیفەت بەخاوەن وەسف کەخۆیەتی.

**٣-تاییەتکردن بە هۆی هەندێ وشەی وەك :**

**أ / وشەی تەنیا :**

محسن دەڵێ :

گشت لەناو دەچی چی لەدنیایە
ئەوەی دەمینێ ،تەنیا خوایە
هەستە هەوڵدە لەبۆ ڕێگای ڕاست
تەنیا ڕا ستی یە خۆشی لە دووایە([٢])

---

[١] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٣-٤

[٢] گوڵزاری هۆنراوە (محسن أحمد مصطفی) دەستنووس

ب/وشەی( هەر) :

مەحوی دەڵێ :

وتم: عیشق ئـــاگری گرتە وجوودم

وتی:هـــەر بابەتی سووتانە خاشاك

خاشاك :پل و پوش

((واتەگیانی تۆ وەك پل و پووش وایە هەر بۆ سووتان دەست دەدات ))[1]

ج/ وشەی بەس:

مەحوی دەڵێ :

هـەرچی هـەیـە موسـەببیبە، باقیکە فـانـیـە

بەندەی یەکێ بە، بەس ببەرە عەبدی سەد هەزار

مانای وشە : موسەببیب : ئەوەی سەبەب دروست دەکات کەخوایە

فانی: فەوتاوو بێ مایە .

((واتە: هەر موسببیب شتە کە خوایەو لەو بەولاوە کەس هیچ نییەو ، تۆیش تەنها بەندەی یەکێ بە کەخوایەو مەبە بەبەندەی هەزار، کە سەبەبەکانن کەلە بڕانەوە نایەن))[2]

---

[1] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل١٨٧

[2] هەمان سەرچاوە ل ١٢٤

**د/وشەی بێ:**

مەحوی دەڵێ :

کەسەیری ئاینەی کردو لەپاشان ئەم کەلامەی دی
وتی: من هەم بەبێ تیمثال و ئەم شیعرانە بێ ئەمثال

((واتە : یار کە ئەم قسەی منی بیست لە باسی لێوو چاویداو بۆ تاقی کردنەوەی

ڕاستی قسەکەم ڕوانییە ئاوێنە باوەڕی کردو وتی: نەجوانێکی تری لەچەشنی من هەیەو نەشیعری وەك شیعرانەی تۆیش وتراوە))[1]

**ە/ وشەی دەبێ :**

هێمن دەڵێ :

بــزانـە تــۆ ئــەوی ئەهلی هـونـەر بێ
دەبێ یا دەس بەسەر یا دەر بەدەر بێ[2]

## جۆرەکانی تایبەتکردن :

تایبەتکردن بەگشتی دووجۆری هەیە :-

١- تایبەتکردن لەڕێگای ڕاستی وحەقیقەت :

ئەوەیە: شتێك تایبەت بکەی بە شتێکی تر، ئەم تایبەت کردنەش ڕاستی و حەقیقەت بێ ، شتی تر بە خۆیەوە هەڵنەگری .[1] وەك هیچ

---

[1] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٢٠٢

[2] تاریك روون (هیمن) ل١١٣

ـروست کەرێك نییە جگە لەخوا ، ئێمە سیفەتی دروست کەرمان ـیبەتکردووە بەخوا، تایبەتکردنەکەش ڕاستی و حەقیقەتە،چونکە سیفەتی دروستکەر تایبەتە بەخوا، هەر ئەوە ئەو توانایەی هەبێ، ئەمە لە کاتێك دا دەبێ کە دەربڕو گوێگر هەر دوکیان بڕوایان بە خوای تاك و تەنیا هەبێ بزانن هەر ئەوە دروست کەرە.

مەحوی دەڵێ :

بەس بێ سەبەب پەرستی، ئەطیببا دەوا دەدەن
بەس هەر خوا طە بیبە کە نادا شیفا بەکەس

((واتە:بابەسبێ سەبەب پەرستی و تۆزێکیش موسەببیب بپەرستین ، ئەم سەبەبانە کەپێیان دەڵێن پزیشك هەر دەرمان دەدەن پزیشکی ڕاستەقینە هەر خوایە کە چاککردنەوەی نەخۆشی لە دەست دایەو بەکەسی ناسپێری.))[٢]

طەبیبی ڕاستەقینە تایبەتکراوە بەخوا، تایبەتکردنەکەش ڕاستیو حەقیقەتە، چونکە چاك کەرەوەی ڕاستی هەر خۆیەتی ئەوەی تر تەنیا هۆکارن.

٢– تایبەتکردن بەپێی درانەپاڵ،واتە: تایبەتکردنی شتێك بەشتێك ئەم تایبەتکردنەش بۆی هەبێ شتی تر بگرێتەوە.ئەم شێوەتایبەتیەش سێ جۆری هەیە :

---

[١] جواهرالبلاغة أحمد الهاشمی ل١٨٣

[٢] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الكريمی مدرس ل ١٤٨

أ/ تایبەتکردنی تاك لایانە (ألإفراد) : ئەوەیە کە گوێگر بیرو بڕوای هاوبەشی هەبێ لە نێوان دووشت یان زیاتر.[1]

وەك کەس تاوانبار نییە تەنیا شوان نەبێ،لە کاتێکدا گوێگر بڕوای وابێ شوان و سامان هەر دوکیان هاوبەشن لە تاوانەکە،بۆ پەرچدانەوەی ئەم بڕوایە دەڵێین: تاوانبار تەنیا شوانە.

مەحوی دەەڵێ :

پرسرا حاڵم ، کە من کەوتم لە بەر پێیا درێژ
ئەووتی:هەر سێبەری دیوم بوە سەرسام و گێژ[2]

تایبەتکردنی(سێبەر)لەنیوەی دیڕی دووەمی ئەم شیعرە وەك وەڵامێکە بۆ کەسانێك وابزانن بەر لەسێبەری مەحوی جەستەی یارەکەشی دیوە،بۆ نە مانی ئەم هاو بەشیە دەڵێ:(هەر سێبەری دیوم)بە هیچ شێوەیەك منی نەبینیوە .

یاوەك هێمن دەڵێ :

نیمە ئاواڵێ لە گۆشەی بێ کەسی دا ،غەم نەبێ
چاکە ئەو لێرەش، وەفای هەر ماوە سایەی کەم نەبێ[3]

هیمن لێرەئەوە دەردەخات کە لە گۆشەی بێ کەسیدا هەر غەمی ئاوەڵەو بەردەوام لە گەڵیدا، لە شادی وخۆشی بە دوورە ئەم دەربڕینەی

---

[1] جواهر البلاغة (احمد الهاشمی) ل ١٨٥
[2] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ١٤٢
[3] تاریك وروون (هێمن) ل١٣٢

هێمن وەك وەلآمێکە بۆ کەسانێك وابزانن هێمن لە پاڵ ئەوەی کەغەم ئاوەڵیەتی خۆشی و شادیشی هەیە، بەلآم هێمن بەو هاوبەشیە ڕازی نییەو ئاوەلآیەتی غەمی بۆ خۆی بە تاك لایانە نیشانداوەو دوورە لەشادی .

ب ـ تایبەتکردنی پێچەوانە:

واتە: تایبەتکردنی شتێك بەشتێك بۆ پەرچدانەوەی کەسێك بڕوای بە پێچەوانەی ئەم تایبەتکردنەوەبێ.[1]

وەك کەسێك بڵێ گەشت کەرەکە تەنیا هیوا بوو، بۆ پەرچدانەوەی کەسێك بڕوای وابێ گەشت کەرەکە شوان بوو هیوا نەبوو .

نالی دەڵێ :

بۆ هەرکەسێ مەبذولە طەریقێکی ئەمانەت
هەر عاشقی بێچارە لەڕێی خەوف و خەطەرما

مانای وشە :مەبذول : ئاسان. ئەمانەت : سەلامەتی . ما: مایەوە.

((واتە: هەرکەس ڕێگایەکی بێ وەی و سەلامەتی بۆ ئەلوێ بیگرێتەبەر،عاشقی داماو نەبێ ڕێگاکەی هەمووی مەترسی و مەینەتە))[2]

نالی کەدەڵێ (هەر عاشقی بێچارە لە ڕیی خەوف و خەطەر ما) سیفەتی خەوف و خەطە ری تایبەتکردووە بە مەوسووفێکەوە کە عاشقە بۆ پەرچدانەوەی ئەوانەی لەو بڕوایەدان کە ڕێگای سەلامەتی ڕێگای عاشقانەو خەوف و مەترسیان نییە .

---

[1] جواهر البلاغة (احمد الهاشمي) ل ١٨٥

[2] دیوان نالی لێکۆڵینەوەی مەلاعبدالکریمی مدرس ل ١٢٠

ج/تایبەتی سەپاندن: قصرالتعیین:

تایبەتی یەکە بەکاردێ بۆ ڕەواندنەوەی دوودڵی گوێگر کە گومانی بە پێچەوانەوە بێ.[1]

وەك کەسێك بڵێ زەوی دەسووڕێ ، بۆ پەرچدانەوەی ئەوانەی بە گومانن لە سووڕانی زەوی .

نالی دەڵێ :

یا تـوربەتی،یا غـوربەتی بـا ڕێ بشـکێنـین
هەر مونتەظیرە((نالی)) ئەگەر مردوو ئەگەرما

مانای وشە: توربەت : گۆڕ. غوربەت: غەریبی. ڕێ شکاندن : هاتوچۆکردن .

(( واتە:یا غەریبیم بشکێنەو بانگم کە بێمەوە ئەگەر بەسەر زیندووبووم ،یا ئەگەر مردم سەرێ لە گلگۆ کەم بدەو گوڕەکەم پێ شێل کە.. هەرچۆن بێ من هەمیشە چاوە ڕێیی پێ گەیشتنم چ بە زیندوویی بێ چ بە مردوویی.کەواتە بائەم لێك بڕانە بەس بێ و ڕەچەی نێوانمان بشکێنین و بەیەك بگەینەوە))[2]

نالی کە دەڵێ(هەر مونتەظیرە ((نالی)) ئەگەر مردوو ئەگەر ما) دەیەوێ دوودڵی یارەکەی بڕەوێنێتەوە واتە: وا گومان مەبە من لەچاوەڕوانی تۆ دانیم، نەخێر بە مردوویی و بە زیندویی من هەر چاوەڕووانی تۆم دڵنیا بە .

---

[1] جواهرالبلاغة (احمد الهاشمی) ل ١٨٦

[2] نالی دیوان لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ١٢١

تایبەتکردنی ڕاستی(حقیقی) بەشێوەی درانەپاڵ (الإضافی)بە گوێرەی سیفەت و وەسف کراو دوو جۆری هەیە :

أ/ تایبەتکردنی سیفەت بە وەسفکراو: ئەوەیە سیفەت بە وەسفکراو ببەسترێتەوە و پێوەی تایبەت بکرێ و هەر بۆ وەسفی ئەوبێ، لەهەمان کاتیشدا زور جار وا دەبی ئەم وەسفکراوە بە سیفەتی تری بەر لەو سیفەتەی کە پێ تایبەتکراوە وەسفی دەکرێت وەك هیچ بژێوەر (رازق) یك نییە تەنیا خوا نەبێ.بژێوەر (رازق)سیفەتێکە تایبەت کراوە بە وەسفکراو کە خوایە لە هەمان کاتیشدا خوا وەسفی بە سیفەتی تریش دەکرێ کە میهرەبانی و بەخشەندەیی و زۆری ترە.[1]

مەحوی دەڵێ :

بەس بێ سەبەب پەرستی،ئەطیببا دەوا دەدەن
بەس هەر خوا طەبیبە کە نادا شیفا بەکەس([2])

(طه بیب)کەسیفەتە تایبەتکراوەبە وەسفکراو کە(خوایە)لە هەمان کاتیشدا خوا

وەسفی بە سیفەتی تریش دەکری وەك ناوە جوانەکانی .

ب/تایبەکردنی وەسفکراو بەسیفەت واتە:بەستنەوەو تایبەت کردنی وەسفکراو بەسیفەتێك یا بەچەند سیفەتێك.[3]

---

[1] جواهر البلاغه ( احمد الهاشمی) ل ١٨٥

[2] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ١٤٨

[3] جواهر البلاغة (احمد الهاشمی) ل١٨٥

نالی دەڵێ :

چیت لـە کـاکۆلی سـەرو مـووی میـانی داوە؟!
هەموو هەر هەمم و پەرێشانی و دەردی سەری یە

مانای وشە: میان: ناوقەد. هەمم: همّ: خەم

((واتە: واز لە قژی بە کاکول کراوی سەری یارو لە ناوقەدی وەك موو باریکی بێنە.. هەموو هەرمایەی خەم و خەفەت و پەریشانی و دەردی سەری یە دەسبەرداری بی باشترە بۆت))[1]

قژو ناوقەد کە وەسفکراون (نالی)تایبەتی کردوون بەخەفەت و دەردەسەری لەهەمان کاتیشدا ئەم دووە وەسفیان بەشتی تریش دەکرێ هەر وەکو (نالی) خۆی بەر لەتایبەتکردنیان بە هەمم و دەردی سەری چۆن وەسفی کردوون .

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٥٨٥– ٥٨٦

# ڕاهێنان

هونەری تایبەتکردن لەم دێڕە شیعرانەی نالی دیاری بکە

١–مەگـــــەر هـەر یـــاری نەقشینم بێتە نەقشی دڵ
کەنەقشی غەیری ڕەنگی ئەو بەئــاوی دیدە شۆرابێ

٢–لــــــە دووری نـــــــازەنینم ڕەنـگ زەردم
وەکوبەی هـــــەر وەکوبەی هـــــەر وەکو بەی

٣–ئەو چـــاوە کە هەڵدێنێ صەد عەربەدە دەنوێنێ
هەر ڕوحە کەبیستێنێ لەم غەمزە دوو بارەت چی!

٤–ظاهیرو بـــاطن لە سـەر لەوحی حقیقەت یامەجاز
ئـــاشنای سیڕری قەلەم بێ غەیری نالی کەس نەما

## یەکسانی : ألمساواة

یەکسانی(المساواة): دەربڕین و گەیاندنی ماناو مەبەستە بەواژەی یەکسان واتە: واژە دەربڕاوەکان بێ زیادوو کەم بە پێی ماناو مەبەست بێ[1]

ئەوەی پێویستە بەئاماژە بۆ کردن، کردنی یەکسانی بەپێوەر بۆ هەڵسەگاندنی کورتبڕی و درێژبڕی دەربڕین، ئەگەر لەوەی بۆی دانراوە کەمتر بوو ببێ بە کورتبڕ ئەگەر زیادتریش بوو ببێ بەدرێژ بڕ ، زانا ڕەونبێژەکان ئەم شێوازەیان بە هەند هەڵنەگرتووە،چونکە ئەو دەقانەی شێوازی ڕەوانبێژیان بە خۆوەگرتووە یان کورتبڕ دەبێ یان درێژبڕ دەبێ. بۆیە باش وایە نموونە هێنانەوە بۆ یەکسانی بەدەقی شێوازی ڕەوانبێژی نەبێ، بەڵکو بەدەق و دەربراوی ئاسایی بێ[2]

خادیم دەڵێ :

دەردی گـــرانــە حـــاڵی هــــەژا ری
مەگـــــەر وەك ئــەوبێ نـەخوێنـدەواری
بـــــەزگێ تێـری، بـە ســـەد زگ بـرسـی
کـەس نییـە جـــارێ حـــاڵت بپـرسـی
موحتـاجی دەســـتی نـــامەران ئـەبـی
بۆ هەمووکـارێ ســــەر گـەردان ئـەبی
بە هـــەر دوولاوە دنیـا نـــا خـۆشـە
هــەر کارێ ئەیکەی هەمووی هەر بۆشە

---

[1] علم المعانی (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ل ٥٢٩

[2] هەمان سەرچاوە ل ٥٢٩–٥٣

ئەتـــەویٚ دایـم دڵت بـیٚ غـــەم بـیٚ

قـەنـــاعەتت بیٚ زۆر بـیٚ یـا کەم بـیٚ

دڵت بەدنیـــا هـــــەر گـیـز مەبـەسـتـە

دڵ بەخـــوا بەستە چـونکی ئەوبـەستە

خـــوٚی فەرموویەتی خیتاب بـــەبەندە

((ألَيـسَ اللـه بِـکـــــاف عَبـدە ))([1])

خادیم لەم دێڕە شیعرانەیدا واژەی بە گوێرە واتای مەبەست بە کار هێناوە هەر وشەیەکی لیٚ لابەرین واتای دێڕەکە لەنگ دەبیٚ .

---

[1] دیوانی خادیم لێکۆڵینەوەی جمال محمد محمد أمین ل ٢٥٦

## ڕاهێنان

ئایا دەتوانین ئەم دوودێڕە شیعرەی نالی بەدەر بڕینی هونەری یەکسانی دابنێین ئەگەرنا لە بەرچی ؟

١-لێوی تۆ ئـــــاوی بەقـــــا مـــــن خضـــــرم
فەیضی ڕەحمەت و مـــــن ســـــەوزە گییا

٢-قوربان مەحـــاڵە پێکەوەبن صەبرو ئیشتیاق
خاریج لە نەصصی ئایە یە تەکلیفی (لایطاق)

## دووەم: کورتبڕی/ الایجاز

کورتبڕی: خەستکردنەوەی مەبەست و مانایە لە چەند وشەیەکی کەمدا بە ڕوونی و ئاشکرایی[1]

ئەوەی لەم پێناسەیەدا دەردەکەوێ دەربڕینی مەبەست و مانای تەواوو خەستکردنەوەی لە چەند وشەیەکی کەمدا، ئەوەیە وشەکانی کەم تر بن لە ئاسایی خۆیان و لەگەڵ ئەوەشدا مانای بۆ دانراوی خۆیان هەمووی بگەیێنن، ئەمەش واتە:کورتبڕینێك بەم شێوەیەنەبێ، مەبەست و مانای بە تەواوی نەدەپێکا دەبێ بە دەربڕاوێکی نا دروست لە ڕوانگەی زانستی ڕەوانبێژی،کەواتە هونەری کورتبڕی دەبێ لەو کورتانە نەبێ زیان بەما بگەیێنی، لەو درێژانەش نەبێ ببێ بە دەربڕینێکی سادە و ساکار، کەوابێ کورد جوانی گوتوە(قسەی کورت درێژ مەکە، ڕێگای نزیك دوور مەکە)[2] چونکە کەسێك تێگەیشتوو بێ بە ئەلفێکیش تێ دەگات ، هەروەك وتراوە((ئەو کەسە کەسە ئەلفێکی بەسە)) کەوا بێ ئەو پێناسەیەی بۆ کورتبڕی دەست نیشانمان کردووە هەمان چەمکی ئەو پەندانەن کە کورد بۆ مەبەستی کورتبڕی مەبەستی بووە ، بەڵام جاری واش دەبێ باری گوێگر لەو ئاستە نییە مەبەستەکە ڕاستەو خۆ وەر بگری، بەڵکو پێویست بەوە دەکات کە قسەی بۆ درێژ بکرێتەوە بۆ ئەوەی بگات بەو مەبەستەی کە قسەکەر دەیەوێ،کەوابێ بۆ هەرشوێنێك قسەی خۆی هەیە، ئەمەش واتە درێژبڕی لە شوێنی خۆی بە پێویست دەزانرێ هەر وەك

---

[1] جواهرالبلاغة أحمد الهاشمي ل ٢٢٢

[2] گوڵبژێریك لە پەندی کوردی هۆشیار نوری(لەك) ل٧

لەمەودوا باسی لێدەکەین،جا ئەوەی لە پێناسەی کورتبڕی دەردەکەوێ ئەوەیە ئەم هونەرە واتاکەی

چڕ بێتەوە لە جەستەی چەند وشەیەکی کەمدا، جگەلە مانای بنەڕەتی خۆی، مانای ئەو دیوی خۆشی نیشان بدات و بیری گوێگر بجولێنی و بیبا بەرەو دەریاییێکی خەستی لێکدانەوە، بۆیە(جاحظ) زانای ڕوانبێژی عەربی دەڵێ:(ڕەوانبێژی کورتبڕی یە)[1]چونکە هەر ڕستەو دەربڕینێك کە کورتبر بێ کاریگەری زیاترەلە دڵ گوێگر، بەئاسانی دەتوانی لەبەری بکات و بیڵێتەوە لەکاتی پێویست، لەهەمان کاتیشدا خێرایەو ماوەی دەربڕینەکەی زۆری ناوێ هەروا دەبێتە شاردنەوەی ماناش تەنیا بۆ کەسانی مەبەست نەبێ .

نالی دەڵێ :

(نالی) عەجەب بەقووەت و حیکمەت ئەدا دەکا
مەعنایی زۆرو گەورە بەلەفظی کەم و بچووك([2])

**جۆرەکانی کورتبڕی**

أ- کورتبڕی تایبەت: واتە چڕ کردنەوی مانا لەچەند وشەیەك بەبێ هیچ لا بردنێك:

مەحوی دەڵێ :

چاوە،جێی ئەو شۆخەبێ، وتم و، وتی:
ئەم مەلا شێخە قسەی بێ جا دەکا([1])

---

[1] هونەری ڕەوانبێژی لەشیعری نالی دا عبدالسلام سالار ل ٢٦٧

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل(٢٦٠)

مەحوی لەبەر ئەوەی یارەکەی خۆی زۆر بە خۆشەویست و گەورە زلنیوە، ویستوویەتی جێگایەکی شیاوی خۆی پێ بدا، هیچ جیگایەکی شیاوی لەچاوی خۆی شیاو تری نە دۆزیەوە، بۆیە چاوی هەڵبژاردووە ببێ بەجێ نیشینی ئەو شۆخە، بەلاّم لەو کاتە کە شۆخەکەی ئەمەی بیست و تی: ئەمە مەلایە، ئەم هەموو زانستەی لایە کە خزمەت بە ڕاستی وداد پەروەری دەکات، لەلایەکی تریش شێخە، شێخییش کەڕاستبێ دەبێ لە ڕێی عارفان بێ عاشقی ئەو ڕاستی و حەقیقە تانەبێ کە لەلای (عارف) بۆی دانراوە، چۆن دەبێ ئەم قسەبێ جێ و ڕێیانە بکات؟چۆن ڕازی دەبم کە چاوی ئەو جێگای من بێ ! ؟ جێگای من دەبێ زۆر لەو جێگایە بەرزو شیاو تربێ، من هەر گیز ڕازی نیم بەم جۆرە بدوێ، ئەم قسە بێ جێ و ڕێیانە بکات!

ئەم دێڕە شیعرەی مەحوی ئەم هەموو ماناو مەبەستانەی لە جەستەی چەند وشە یەکی کەم کۆکردووە تەوەو هیچ لابردنێکیشی تێدا نییە .

ب– دەربڕینی کورتبڕی بە لابردنی وەك ئەمانەی خوارەوە :

١–بە لابردنی ئامرازی لێکچون :

مەحوی دەڵێ:

ئەوەندەم لەو قەدو باڵایە ئاشووبەو بەلاّ دیـوە

لەسەیری سەرووی باغم غایلەی غوولی بیابانە

---

[1] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٢٣

((واتە:ئەوەندە دەردو بەلاَم لە بالاَی بەرزی یارەوە تووش بووە کە لەناو باغدا سەیری داری سەرو دەکەم ترسم لێ دەنیشێ وەك بڵێی غولی بیابانم هاتبێتە ڕێ))[1]

مەحوی کە دەڵێ:(غولی بیابانە) واتە: وەك غولی بیابانە کورتبڕی بە لابردنی ئەوزاری چواندنی (وەك) کردووە .

٢-بە لابردنی ئەوزارو ڕوی لێکچون :

مەحوی دەڵێ :

وتی: میوەی بەهەشتە شیعری((مەحوی))
خـۆدا نە بـڕێ لـەباغـم دا ری بـەردار([2])

مەحوی کە دەڵێ (میوەی بە هەشتە شیعری مەحوی ) واتە: شیعری مەحوی وەك میوەی بەهەشتە،کورتبڕی بە ئەوزاری (وەك) و ڕووی لێکچون کە(خۆشی)یە پێك هێناوە.

٣- بەلا بردنی کار :

مەحوی دەڵێ:

بریقەی بەرقی جیلوەی تۆ لەچاوی
نەدابێ، بـۆچیـە ئاییـنە حەیـران؟!

((واتەئاوێنە بۆچی سەرسام و حەیران بووە،ئەگەر لەبەر ئەوە نییەکە تیشکی دەرکەوتنی تۆ داویە لە ناوچاوی!))[1]

---

[1] دیوانی مەحوی لیکۆلینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٢٧٩

[2] هەمان سەرچاوە ل١٢٠

مەحوی لە بری بلێت: ((ئایینەحەیران بوو)) وتوویەتی: ئایینە حەیران کاری ڕابردووی (بوو) ی لابردووە بۆ کورتبڕی.

٤–بە لابردنی دیارخەر :

سەیرێکی خۆش لە چیمەنی خانەقا بکە
ئایە ڕبیعی ئاهووە، یا چایری سنوور؟![2]

نالی لەم دێڕەشیعرەیدا لەبری ئەوەی بڵێ خانەقای مەولانەخالید تەنها وژەی خانەقای هێناوەتەوە،دیارخەر کەمەولانە خالیدە لای بردووە بۆ مەبەستی کورتبڕی .

یاوەك مەحوی دەڵێ :

جوبارە لالە زارە، وەرە سەرچەمم ، وتی :
ئاشووبە ئەم بەهارە، بوەسەیری چەم حەرام

**مانای وشە :**

جۆبار: جۆگەی ئاو.لالەزار: گوڵزار، مەبەست لە دلۆپی فرمێسکی سوورە.چەمی یەکەم: چاو.چەمی دووەم ڕووبار.

((واتە: بەیارم وت وەرە سەر چەمی چاوم تەماشای فرمێسکی گوڵ ڕەنگم بکە، کەچی وتی: بەهاری ڕووت پڕە لە ئاشووب و تەماشای چەم حەرام بووە،لەبەر ئەوە نایەم.))[3]

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٢٤١
[2] دیوانی نالی لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ١٨٨
[3] دیوانی مەحوی لێکولینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ل ٢١٢

مەحوی کەدەڵێ (وەرە سەیری چەمم) واتە وەرە سەیری چەمی چاوم ، دیار خەر کەچاوە باسی نەکردووە بۆ کورتبڕی .

٥- بە لابردنی دیارخراو :

نالی دەڵێ:

داخۆ دەرِوونی صافە،گوڕەی ماوە(تانجەڕۆ)
یا خـۆ ئەسـیری خاکە بەلێلی دەکاعـبور؟!

تانجەڕۆ: چەمێکە لەسەرچاوەکانی سەرچنارەوە پەیدا دەبێ .

((واتە ئاخۆ تانجەڕۆ کەسی هەیە گوێیی بداتێ و هەموو ساڵێ جۆماڵی بکاو، بە هێزو

گوڕەکەی جارانیەوە ئەڕوا، یان پـڕ بـووەتـەوە و قـوڕو لیـتە بـەری گـرتـووە لـیخن بـووە؟))[1]

نالی لەم دێڕە شیعرەیدا لە بری ئەوەی بڵێ چەمی تانجەڕۆ تەنها واژەی (تانجەڕۆ)ی هێناوەتەوە دیار خراوی لابردووە کەچەمە بۆ مەبەستی کورتبڕی .

یاوەك مەحوی دەڵێ :

بـڕوانە سـووتـنم، وەرە، بـڕواکە من نـەمام
پەروانەم، ئیترم نیە، پەروا کە من نەمام

مانای وشە : سووتن : سووتان.ئیترم نیە: ئیتر نیمە.[2]

---

[1] نالی دیوان لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ١٨٨

[2] مەحوی دیوان لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٢١٣

مەحوی کەدەڵێ:(بڕوانە سووتنم) واتە: بڕوانە جەستەی سووتاوم، دیارخراو کە جەستەیەلابردووە بۆ کورتبڕی.

٦– بە لابردنی ئامرازو تەواو کەری ئامرا زی پەیوەندی)

نالی دەڵێ :

پڕکە قەدەحی پڕ فەرەحی بێ تەرەح وغەم
نَاوِلْنی، وَنَادِمنی وغازِلْنی بِالأفراح([1])

نالی لە سەرەتای نیوەی دێڕی یەکەم کە دەڵی (پڕکە) کورتبڕی بەکارهێناوە. واتە: پڕکە لەمەی (لە) کە ئامرا زە (مەی) کەتەواو کەریەتی باسی نە کردوون .

٧– بەلابردنی نیهاد :

نالی دەڵێ :

چاوەکەت ئاگر لە سینەی عاشقی مسکین دەکا
مەستە،مەیلی چەن کە بابێکی دڵی خوێنین دەکا

((واتە: چاوە کەت ئاگر بەردەداتە دڵداری بەسەزمان کە هێلانەی دڵیەتی ..بەلاَم ناهەقی نییە وا ئەکا..سەرخۆشە.سەرخۆشیش بۆمەزە حەزی لە کەبابە.چیش لە دڵی خوێناوی چاترە لەبۆ کەباب ؟! ))[2]

---

[1] نالی دیوان لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ١٦٦

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلاعبدالکریمی مدرس ل ١٦٦

لەنیوەی دووەمی ئەم دێڕە شیعرەیدا نالی لە بری ئەوەی بڵێت: یار مەستە نیهادی ڕستەکەی لابردووە تەنها گوزارەکەی هێشتووەتەوە کە (مەستە)

٨ – بە لابردنی بکەر :

نالی دەڵێ :

دەفەرمووی چاوەکەت زنجیرکە(( نالی))
کەموطلەق چانی یە ئینسانی هەرزە[١]

(نالی) لە بری ئەوەی بڵێ: یار دەفەرموێ دەڵێ (دەفەرمووی) بکەری باس نەکردووە تەنها کاری ڕانەبردووی هێناوەتەوە کە(دەفەرمووی)) یە، ئەمەشی بۆ مەبەستی کورتبڕی یە.

٩– کورتبڕی بەشێوازی تایبەت :(ألقصر)

نالی دەڵێ :

نەقدی دڵ و جان بۆ قەدەمت نیمە بەهایە
غەیری ئەمە، قوربان،بە خودانیمە بەهایێ[٢]

مانای وشە: نەقد: پارەی نەخت. قەدەم : هاتن.پێ و قدوم. نیمە: نیوە.بەها: بایی. نرخ.

[١] هەمان سەرچاوە ل٤٥٠

[٢] هەمان سەرچاوە ل ٧٠٦

((واتە:تۆ ئەوەندە نازداری ئەگەر بنیادەم دڵ و گیانی بکا بەشاباشی ڕێت هیشتا کەمەو  نیوەی ئەو ئەندازەیەیە کە شایەنیەتی، منیش نازیزەکەم هەر ئەم نیوە شك ئەبەم و وا لە بەر پێتا فڕێی ئەدەم، هیوام وایە پەسندت بێ .. ))[1]

نالی لەم دێڕە شیعرەیدا لە بری ئەوەی درێژە بە قسەکەی بدات هەر وەك لە شی

کردنەوە کە دا هاتووە هەستاوە مەبەستەکانی چڕ کردووتەوە لە چەند وشەیەکی کەم

نالی دەڵێ :

بڕی پارچەی غەزەل یارم کەوای کرد
بڕی بەندی دڵم یارم ،کەوای کرد[2]

(یار) لەنیوەی دێڕی یەکەم جارەك بووە بە بکەر بۆ کاری ڕابردووی (بڕی)جارێکیش بووە بە بکەر بۆ کاری ڕابردووی (کەوای کرد) بە مانا پۆشاکی کەوای کرد.لە نیوەی دێڕی دووەمیش جارەك بووە بە بکەر بۆکاری ڕابردووی(بڕی) جارێکیش بووە بەبکەر بۆ کاری ڕابردووی (کەوای کرد) بەمانا بەم کارە هەستا.

[1] هەمان سەرچاوە ل٧٠٦

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلاعبدالکریمی مدرس ل٧١٥

١٠- بە بکەرکردنی شتێك لە هەمان کاتیشدا ببێ بە نیهاد:

نالی دەڵێ:

چونکە مەنشووری گوڵ ندامی بە ناوی خۆی دەوێ
یار ئەگەر لەو باغیانەکەس بمینێ، عارە بۆی[١]

وشەی(یار)لە نیوەی دووەمی ئەم دێرەدا بووە بە بکەر بۆ کاری ڕانەبردووی (دەوێ) لە هەمان کاتیشدا بووە بەنیهاد بۆ کاری نا تەواوی (عار)ە

١١- بەبەرکار کردنی وشەیەك بۆ دووکار لەهەمان کاتیشدا ببێ بەنیهاد:

نالی دەڵێ :

شەقی کە،غەیری حوببی تۆی تێدا بێ،
بەدەستی خۆت دڵم دەربێنە، قوربان[٢]

وشەی (دڵ) لەم دێرەدا، لە لایەکەوە بەرکارە بۆکاری داخوازی (شەقی کە) لەهەمان کاتیشدا بەرکارە بۆ کاری داخوازی(دەربێنە) هەروەها نیهادیشە بۆ ڕستەی (غەیری .... تاد)

---

[١] هەمان سەرچاوە ل٦٩٤

[٢] هەمان سەرچاوە ل ٣١٦

# ڕاهێنان

هونری کورتبڕی لەم دێڕەشیعرانە نالی دیاری بکە

١–لـــەبت مـــــــیم و قـــــدت ئەلف و زولـــــف چیم
دەزانی بـــــەم ســــیيانە طـــــاليبی چیــــــم

٢–ئەگەر خوێنم دەرێژی تۆ، ئەوە تیغ و ئەمیش گەردەن
ئەگـــــــەر بنیادی پەیمان، دەستی من دامێنتە بازا!

٣–ڕەوغەنی دیــــدەم ڕژایە سەر کیتابی خەطیطی خۆم
چاو لە ئێشی ئەو سپی،نووریش بەسەر ئەودا سەقەط

٤–ڕۆژی هـــــــاوینی وەهــــــا مثقالە ذەڕرەی پڕ دەبێ
نییمە ذەڕرە یــــــەك ســــــێبەری تێدا نییە

## سێیەم: درێژبڕی/ألإطناب

درێژبڕی: دەربڕینی مەبەست و مانایە بەواژەی زۆتر لەخۆی بۆ ئەوەی سوودی زیاتر بە دەستەوە بدات.[1]

ئەوەی لەم پێناسەیەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە دەبێ مانای مەبەست بە ئەندازەی وشەکانی بێ بەبێ ئەوەی هیچ خەست کردنەوەو چڕ کردنەوەیەکی تێدابێ، لە هەمان کاتیشدا دەبێ لە وشەکانیشی وشەی واهەبێ سوودی تر بگەیێنێ، کەوابێ درێژ بڕی وەکو یەکسانی نییە مانای بەپێی وشەکانی بێ زیادوکەمی، وەکو کورتبڕیش نییە، چڕ کردنەوەو خەست کردنەوەی لە چەندوشەیەکی کەم دابێ، کە لەپێناسەکەشی دەڵێین: سوودی تری پێویستیش بە دەستەوە بدات واتە: بۆ مەبەستێك هاتبێت،چونکە زۆری وشە و کەڵەکە بوونی لە ڕستەدا بە دووری دەکات لە هونەری ڕەوانبێژی،کە وابێ هەر کاتێك درێژبڕی بە پێویست زانرا، دەبێ بۆ مەبەستێك بێ، لەم ڕوونکردنەوەیە بۆمان دەردەکەوێ هەر یەك لە کورتبڕی و لە درێژبڕی شوێنی تایبەتی خۆی هەیە،کورتبڕی لە شوێنی درێژبڕی یان درێژبڕی لە شوێنی کورتبڕی دەر چوونە لەهونەری ڕەوانبێژی،کەوابێ درێژبڕی لە جێگای خۆی بۆ ڕوونکردنەوەو ئاشکرا کردنی مانای مەبەستە، ئاشکراکردن و ڕوونکردنەوەش بە چڕو پڕی وشە دەبێ، کە وابێ باشترین دەربڕین ڕوونترینیانە، ڕوونترینیشیان ئەوەیە هەموو واتای مەبەست بگرێتەوە،کەسێکیش بڵێ:کورتبڕی باشترە لەبەر ئەوەیە کەمێکی سوود بەخش باشترە لە زۆرێکی سوودی کەم بێ. بەهەرحاڵ ئەم دوو شێوازە هەر یەکەیان لە شوینی خۆی جوانەو بەشیاو

---

[1] علم المعاني(د. بیسیوني عبدالفتاح فیود) ل ٥٠٦

دەزانرێ، بەکارهێنانی هەریەك لەم دووانەش لەشوێنی ئەوەی تر دەبێ بە هەڵەیەکی ڕەوانبێژی.بۆیەدەبێ دەربڕین و نووسینی هونەری لە چوار چیوەی یاسای درێژبڕی دەر نەچێ

ئەحمەدی خانێ دەڵێ :

ئەی خـــامە تەژی گەلەك درێژکر
ئەڤ نـــامە بەسە تە پڕ قرێژ کر
هەر چەندە کـــەلام شوبهێ دوڕبت
بێ قـەدر دبت دەمـا کو پـڕبت[1]

**مەبەستەکانی درێژبڕی**

١–بۆگەیشتن بەتەواوی مانای مەبەست :

مەحوی دەڵێ :

لەسەر تۆ بوومە پەندی عالەمێ،وتم و،وتی :((مەحوی))
بەسی بێ موشریکی،بەس،یا لە دنیا یا لەمن لادە

((واتە:بە یارم وت بە هۆی تۆوە بوومە پەندی عالەم ، ئەویش وتی: بە سبێ موشریکی و هاوبەش دانان بۆ من. نابێ لە یەك کاتدا دڵی منیشت مەبەست بێ و شەرمیش لەوە بکەی کە ناوت بکەوێتەسەر دەمی خەڵك ،واتە: نابێ بایەخ بە خۆت بدەی بە هاوبەشی خۆشەویستی من، یالەمن بەو لاوە گوێ بە کەس مەدە، یا دەس لە من هەڵگرە .))[2]

---

[1] مەم و زین. ئەحمەدی خانێ بەراڤەوشرۆڤەیەك نوو پەروێز جیهانی ب٢ل١١٤

[2] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٢٦٩

مەحوی بۆ ئەوەی بگات بە تەواوی مانای مەبەستی لە(بە سبیّ موشریکی بەس) دەبینین روونی کردووتەوە بە(یا لەدنیا یا لەمن لادە) بوئەوەی لێکدانەوەی تر هەڵنەگرێت و واتای مەبەستیش بەدەستەوە بدات.

٢- لەباسی گشتی یەوە بۆتایبەتی لەڕێی سەرسووڕمان :

نالی دەڵێ :

بنـــازم دڵبـەری خــۆم چەنـدە پــڕ وەصـف و چ بێ عەیـبە
بە چاو مەست و،بە دڵ هۆشیار،بە ئەبرۆ جووت و هەم تاقە !

((واتە:مایەی شانازیمەکەوا یارم ئەوەندە چاك و جوان و بێ خەوشە،بەچاو مەستەو بە دڵ هوشیـارە، بـرۆکـانی لە لایەکەوە جـووتن، لـە لایەکی ترەوە کەوانـین وەك نالی لێرە بەگشتی باسی پڕ وەصف و بێ عەیبی یاری کردووە،ئەوەیە کە لە نیوەی دێڕی دووەم دەڵێ:(بەچاومەست و، بەدڵ هوشیار، بە ئەبرۆ جووت و هەم تاق) لەنیوە دێری یەکەم کە دەڵێ: (چەندە پڕ وەصف وبێ عەیبە) ئەم سیفەتانەی دووایيشی گرتووەتەوە، بەلأم ئەم هەر درێژەی پێداوە ناوی ئەم چەند سیفەتەشی هێناوە. کەوابێ درێژبڕ یەکەی لەگشتی یەوە بۆ تایبەتیە لە هەمان کاتیشدا بۆ سەر سووڕمانیشە.

تـاق و هیـلال)) (١٣٨)

٣–له باسی تایبه‌تییه‌وه‌بۆگشتی:

نالی ده‌ڵێ :

ده‌فه‌رمووی: چاوه‌كه‌ت زنجیركه‌((نالی))!
كه‌موطله‌ق چانییه ئینسانی هه‌رزه[1]

نالی له‌م دێره‌دا به‌تایبه‌تی باسی چاوده‌كات ودواییش به‌گشتی قسه‌ده‌كات وده‌ڵێ: (كه موطله‌ق چانییه ئینسانی هه‌رزه)درێژبڕی له دووای تایبه‌ته‌وه هێناوه .

٤– بۆ زیاده روونكردنه‌وه‌و پیاهه‌ڵدان :

نالی ده‌ڵێ :

ئیستیطاعه ی قووتی طه بعم،به‌كوردی وفارسی
عاره‌بی ئیظهاری چالاكی وچه‌سپانی ده‌كا[2]

له‌م دێڕدا نالی درێژه‌ی داوه به‌ناوی چه‌ندزمانێك ،كوردی،فارسی،عه‌ره‌بی چونكه گه‌ربیگوتایه(ئیستیطاعه و قووه‌تی طه بعم)(ئیظهاری چه‌سپانی ده‌كا) ناوی زمانه‌كانی نه‌بردایه نه‌ده‌زانرا چۆن و به چ زمانێك .له‌پاڵ ئه‌م مه‌به‌سته‌ش كه زیاده ڕونكردنه‌وه‌یه‌و ئاماژه به پیاهه‌ڵدانیش ده‌كات.

٥– بۆ بێگومانی وزیاده ڕۆیی :

نالی ده‌ڵێ :

واظه‌ن مــــه‌به ڕوخســـــاره‌یی تۆ غائیبه قوربان
بنواڕه چلۆن نه‌قشـــه لــــــه نێودیده‌یی تـــه‌ڕما

---

[1] هه‌مان سه‌رچاوه ل٤٥٠

[2] هه‌مان سه‌رچاوه ل١٠٤

((واتەئازیزە کەم لەم قسانەوە کەکردمن واگومان نەبەی کەوا وێنەی ڕوخسارە نازدارەکەی تۆش وەك وێنەکانی تر شۆراوەتەوە لە ناوچاومان نەماوە نەء .. وێنەی تۆ هەمیشە هەر ئەمینێ..سەیرکە چۆن لە ناوچاوە بە فرمێسکە تەڕەکەمدا نەخشەو دیارنییە.ئەم شیعرە موبالەغەیەکی زۆر جوانی تیایە،چونکە نەخش بەعادەت دەبێ لە ناو ئاوا بکوژێتەوە کەچی نەخشی ئەو لە ناو ئاوا جێگربووە ))[1]

نالی لەم دێرەشیعرەیدا دریژە پێدانی بۆ بێگومانی وزیادەڕەوی بەکار هێناوە .

٦- بۆ هەڵگەڕانەوە و ڕوونکردنەوە:

نالی دەڵێ :

وەرە بنـوارە دوو دەســـــتی حەنـاییـم
حەنایی چی؟ هەمــوو هەرخوێنە قوربان!

واتە:قوربان وەرەسەیری هەردوو دەستە سوورەخەنەییەکەم بکە. بەلآم وا نەزانی سووربووی خەنەن خەنەیی چی؟ بۆیە سوورن ،چونکە جەستەم هەمووی خوێنە تیری خۆشەویستی برینداری کردووم . دەستەکانیشم لەم سووریە بەدەر نابێ.[2]

نالی کە دەڵێ:(وەرە بنوارە دوودەستی حەناییم ) بۆ ئەوەی بزانرێ ئەم سوورە خەناویە لەچی یەوە هاتووە لە ڕێگای پرسیار درێژەی پێ داوە دەڵێ: هەموو هەرخوێنە واتە جەستەم گشتی هەردوو دەستیشی لەگەل دابێ.

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ل ١٢١

[2] هەمان سەرچاوە/٣١٥

٧– بۆ گەڕانەوە سەرقسە لە دووای هەڵوەستە کردن :

ڕستەی هەڵوەستە(ألجملة الإعتراضية) ئەوەیەدەربڕ لەکاتی قسەو دەربڕینەکانی لەو قسەو دەربڕینانە وازبێنی قسەیەکی تربکات ئینجا بگەڕێتەوە سەر قسەکانی و تەواوی بکات.[١]

ڕستەی هەڵوەستە بۆ زۆر مەبەست بە کاردێ لەوانە:

١– لەکاتی پاڕانەوە :

صافی دەڵێ:

بەســــیە بێ ڕەحمێ ـ بەقوربان ـ پایە ماڵی غەم بووم
ڕێی نەجاتم بۆ نییە گەر تۆ نەبی غەم خوارەکەم([٢])

صافی کەدەڵێ : (بەسیە ڕەحمێ) وازی هێناوەوە وتوویەتی(بەقوربان) ئینجا گەڕاوەتەوە سەر قسەکەی خۆی بو ئەوەی تەواوی بکات ئەوەیە دەڵێ: پایە ماڵی غەم بووم ).

پایە ماڵی غەم بووم :(دوو چاری غەم و پەژارەی زۆری کردووم.

٢– بۆ دووعا:

مەحوی دەڵێ :

شەوی ڕیحلەت پدر ـ ڕوحی مورەووەح ـ وەصیەتی فەرموو:
مەحەببەت مەذهەبت بێ، نوری چاوم، مەیکەشی مەشرەب

---

[١] علم المعاني (د. بيسيوني عبدالفتاح فيود) ل ٥٢٤
[٢] دیوانی صافی لێکۆڵینەوی محمدی مصطفی هیرانی ل ١٧٨

مانای وشە: ریحلەت: کۆچی دوایی.پدەر: باوك. رۆحی موڕەووەح: گیانی شاد بێ.مەذ هەب: ڕیبازی ڕێ.مەیکەشی: شەڕاب دەرخواردی خەڵك دان. مەشرب:ڕەوشت.ئاوە خۆرگە.

((واتە: باوکم بەڕەحمەت بێ،لەشەوی کۆچی دوواییدا وەسیەتی بۆکردم کەوا هەمیشەڕێگای خۆشەویستی بگرمە بەرو شەڕابی دڵداری دەرخوادی خەلك بدەم، یا لەسەرچاوەی شەڕابی خۆشەویستی خۆم تێراو بکەم ))[1]

مەحوی لەپاش ئەوەی کە: دەڵێ (شەوی ریحلەت پدەر) وازدێنی بۆ شتێکی تردەچی کە دوعابۆکردنە، ئینجادەگەڕێتەوە سەر مەبەستەکەی و تەواوی دەکات بە شێوەی درێژە پێدانی هەڵوێستە دوعا .

٣ — بۆ درێژەپێدان لە دووای هەڵوەستەی جیاکەرەوە :

نالی دەڵێ:

هەردەمە فەرشی کەسێکی کە بەبێ مەهرو نیکاح

ـ دوور لـە چاکانی ـ عەجەب فـاحیشـە دنیـاییێـکە

((واتە: ئەم دنیایە بێ وەفایە هەر ڕۆژێ ژیرخەری یەکێکی تازەیە بەناحەق ئەکەوێتە ژێردەستی، وەك ئافرەتی داوێن پیس کەبێ مارەیی و مارەبڕین لە ژێر هەرکەسێکا بیەوێ ڕائەکشێ.. ئای لەم دنیایە، دوور لەپیـاو چاکەکـانی، دنیـایەکی بی‌ناموس و داوێن پیسە))[2]

---

[1] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٥

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٤٦٣

(نالی لەم دێڕدا، دەستەواژەی (دوورلە چاکانی) بەکار هێناوە بۆ ئەوەی چاکەکان دوور بکاتەوە لەو وەسفەی کە بۆ دنیا ئەیکا، لێرە درێژەپێدانی بۆ هەڵوەستە کردن بەکار هیناوە)[1]

---

[1] هونەری رەوانبێژی ل شیعری نالی دا عبد السلام سالار ل١٣٦

# ڕاهێنان

نالی بۆ چ مەبەستێك لەم دێڕە شیعرانەیدا درێژبڕی بەکارهێناوە:۔

١-نیشـــــانەی فەخرە بۆ من گەر بەسـەر بێم نەك بەپێ ئەمما
بە مەرگی تۆ قەســــەم، شاهم ! عوذرمەسمووعە، سەرمایە

٢-موددەعی زەجرم دەكـــات وپێم دەڵێ :صـــــــەبرت ببێ
كـــــەر بە لەعنەت بێ كە كەی عـاشــــق قەراری گرتووە

٣-لەگـــــەڵ ئال و لەگەڵ صەحبی،خوصووصەن چاریاری دین
ئەبـــوبەكرو عومــــەر و عوثمـــان و حەیدەر شێری یەزدانە

٤-چـــاویشی لەنـــــالی كرد، دین و دڵ و جـــــــانی بر
گـــــەر زولفە ئەگـــەرنازە ، گەرخەندەیە گەرچــــــاوە

٥ -وەك قیـــاسێكی كـــــە مـــــوثبەت بێ نەتیجەی بێتەجی
حــــەمدو لیللا شەه كەعـــــالی جابوو خـــالی جانەبوو

**پێکەوەنان :( ألوصل )**

گێڕانەوەی وشەیە بۆسەر وشە یان ڕستە بۆ سەر ڕستە،گونجاوی یەکیش هەبێ بە یەکەوەیان کۆبکاتەوە.[1]

زمانی کوردی وەك هەر زمانێك چەند ئامرازێکی هەیە بۆ بەیەکەوە بەستنەوە (عطف)ی وشە بۆ سەر وشە یان ڕستە بۆ سەر ڕستە لە نێو ئەو ئامرازنە یەکیان (واو)ە، بەلاَم ئەوەی لە ڕەوانبێژی عەڕەبی هاتووە گرینگی پیێکەوەنان تەنیا لە(واو) دەردەکەویّ، ئەوەی من بۆی دەچم لە پێکەوەنان و لکان بە یەکەوە لە شێوازو دەربڕینی کوردیش بە هەمان شێوە هەر لە(واو) دایە،بۆ ئەم هۆیەش دەڵێن: (واو) تاکە ئەوزارە حوکمی هاوبەشی گونجاوی لەنێوان لکاوو پیێ لکاو(المعطوف والمعطوف علیه) دیاری دەکات . ناسینی شوێنی بە یەکەوەنان و لێکدا بڕینی وشە یان ڕستە هەموو کەسێك سەری لیّ دەر ناچی تەنیا ئەو کەسانە نەبن کە سووار چاکی ئەم بوارەن و شارەزایی تەواو یان لێوە هەیە، زانایان لە وەلاَمی ڕەوانبێژی چییە؟ وتوویانە((زانینی پێکەوەنان و لکانە)) کە وابیّ شوێنی بەکار هێنانی(واو) بۆ هەموو کەس ئاشکرا نییە پێویستی بە وردەکاری و بیرکردنەوە دەبیّ لە گوزارشت و دەربڕین. ئامرازەکانی تری لکان و پێکەوەنان (عطف) شوێنی لکان و پێکەوە نانیان دیارە، (واو) کەدوایی بە بەرایی دە بەستێتەوە دەبیّ گونجانێك هەبیّ لکاوو پێلکاو (ألمعطوف والمعطوف علیه) بە یەکەوە کۆ بکاتەوە.[2]وەك ئامرزەکانی تری پێکەوەنان و لکان نییە شوێنی بەکارهێنانی دیار بیّ بۆ نموونە

---

[1] جواهر البلاغة (احمد الهاشمی)ل ١٩٦-١٩٧

[2] هەمان سەرچاوە ل١٩٨

ئامرازی پەیوەندی (ش) تەنیا بۆ مەبەستی جەختكردن(تأكید) بە كاردیت، ئامرازی (یان) بۆ هەڵبژاردن و سەر پشكردن لە نێوان دوو شت بەكاردێ ئامرازی (نە)ی نەرێ بۆ دەرخستنی نەرێنی دووشت بە كاردی وەك نە دەخوێنی نە دەنووسیٚ. ئەمانە بەكار هێنانیان شتی تری بە دوواوە نیە، ئێمەكەدەڵێین: بەختیار دەنووسیٚ و دەخوێنێتەوە، لە نێوان نووسین و خوێندوەدا گونجاوی هەیە بۆ بە یەكەوە كۆكردنەوە بەڵام گەر بڵێین مرۆڤ و ماسی هەر دووكیان لەناو ئاودا دەژین ئەم جۆرە بەیەك لكانە بەڕاست نازانرێ و لە جێی خۆی نییە چونكە هیچ گونجاویەك لە نێوان ماسی و مرۆڤدا نییە، مرۆڤ لە ناو ئاو ناژی ماسیش لە دەرەوەی ئاو ژیانی نابێ .

**شوێنە كانی پێكەوەنان :ـ**

١ـپێكەوەنان لە بەر ئەوەی هەر دوو ڕستەكە هەواڵ بن :

مەحوی دەڵێ :

من پادشاهی عیشقم و هەر داغی جونوونم
تاجی سەرە، باقی كە لەدێوانە حەرامە

((واتە:من لەمەیدانی عیشقدا ئەوەندە شێت بووم ،بووم بەپادشا،بەڵام لەجیاتی تاجی پادشایەتی تەنها داخی شێتیم ناوەتە سەر سەر،چونكە شێت لەو داخە بەو لاوە هیچی ناگرێتەخۆی و هیچ لەبەر ناكا))[1]

لە نێوان(من پادشاهی عیشقم و) ڕستەی (هەر داغی جنوونم تاجی سەرە) گونجاویەكی تەواو یان لە نێواندا هەیە،چونكە مەحوی كە پادشای عیشق بێ دەبێ داغی جونوونی تاجی سەری بێ. هەردو ڕستەكەش هەواڵن.

[1] دیوانی مەحوی لێكۆڵینەوەی مەلا عبد الكریمی مدرس ل ٢٧٦

٢- پێکوەنان لەبەرئەوەی ڕستەی لکاوو پێ لکاو هەر دووکیان دارشتن بن:

نالی دەڵێ :

وەرە نێو بەزمی گـــوڵزاران و گوڵ زاران تەماشـاکە:
سەراسەر پێکەنینی گـــــوڵ، لەبالەب غونچە پشکووتن

((واتە: وەرەنێو بەزم و ئاهەنگی باخچەکان و سەیری جوانان و نازداران بـکە، ببینە چۆن لە هەموو لایەك گەشەی گوڵ و پشکوتنی غونچەیە،یان چۆن لە هەموو لایەك کچان وەك گوڵ پێ ئەکەنن و دەمی وەك غونچەیان ئەکەنەوە قسەی خۆش دەکەن))[١]

لە نیوەی یەکەمی ئەم دێڕەدا هەر دوو وشەی (وەرە) و (تەماشاکە) داڕشتنن هەروا لە نێوان ئەم دوو ڕستەشدا گونجاوی تەواو هەیە.

٣-پێکەوەنان لەبەر ئەوەی یەك کار(فعل) هەبێ بۆ لکاوو پێ لکاو :

مەحوی دەڵێ :

لەهەمـــــوو جێ لەچ کەس بێنی مروەت نایێ
کـە ڕەم و صـــــدق و وەفـا بـووە قـات([٢])

کەرەم پێ لکاوە(معطوف علیە)(صدق و وەفا)لکاو(معطوف)ن بۆ هەموویان یەك کار(فعل)هەیە (بوەقات) هەمووشیان لەگەڵ یەکتری گونجاون

---

[١] دیوان نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٣٢٨

[٢] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ل ٦٢

٤- پێكوەنانی دوو ڕستە لەبەر دژایەتی نێوان واتاكانیان :

نالی دەڵێ :

لەسـایەی ئەمرو نەهی،حەقق و باطل بوو بە دوو فیرقە

بە میثلی فەرقی ڕۆژو شـــەو كە فـاریق نـوری ئیمـانە

((واتە: بەهۆی ئەمر بە چاكەو نەهی لە خراپە كردنی پێغەمبەرەوە،(د.خ) حەق و ناحەق ڕون بووە و خاوەن باوەڕ و بێ باوەڕ لە یەك جوێ بوونەتەوە بوون بە دوو تاقم ،وەك ڕۆژو شەوو روناكی و تاریكی لەیەك جیان و جیاكەرەوەی دوو تاقمەكەش لەیەك بریتی بوو لە نوری ئیمان كە لەناو چاوی تاقمێكیان دیارەو ئەو تاقمەكەیان لێی بێ بەشە)[1]

پێكەوەنانی (ئەمرو نەهی)(حەق و باطیل) (ڕۆژو شەو) لەبەر بوونی دژایەتیە كە لە نێواندایە.

٥- پێكەوەنانی دوو ڕستە لەبەر پێچەوانەی واتای كارەكانیان لە یەكتر:

نالی دەڵێ:

بنـــوارە بـــوونـی ئەولـت و چـــوونـی ئاخــرت:

هاتی چ رووت وقوت و، هەلاتی چ لوس وپوس؟!

((واتە :ئەی ئادەمیزادی لەخۆبایی بوو! بیرێ لە خۆت بكەرەوە، چۆن هاتیە دنیاوە چۆن ڕۆیشتی..بەڕوت و قووتی لە دایك بوویت و بەتالآن

---

[1] دیوانی نالی لێكۆڵینەوەی مەلا عبدالكریمی مدرس ل ٥٠٦

کراوی و ڕووت کرا وەیی ڕۆیشتی کەواتە دنیا بۆ ئەوە ناشێ پشتی پێ ببەستی .. ))[1]

لە نیوەی دووەمی ئەم دێڕەدا هەردوو کاری(هاتی) و (هەلاَتی) پێچەوانەی یەکترن و بەتەبا ناو دەبرێن،چونکە کەیەکەممان بیست پێچەوانەکەی بیر دەکەینەوە. هەردوو ڕستەکەش هەواڵن و بە یەکەوەش گونجاون.

**چوارەم: دابڕین: ( ألفصل )**

دابڕین جیاکردنەوەی وشە یا ڕستەیە لەوەی پێش خۆی.[2] وەك:

١- هاتنی چەند ڕستە بە دووای یەکەوە بۆ ڕوونکردنەوە :

مەحوی دەڵێ :

لە ئیعجازی مەحببەت دا،چوار فەصلم جوملە بۆ جەمعە

سورشکم سورە، ڕەنگم زەردە، لێوم وشکە، چاوم تەڕ

((واتە:موعجیزەی دڵداری هەرچوار وەرزی ساڵی بە جارێ تیدا کۆ کردومەتەوە، فرمێسکی سوورم گولاَڵەی بەهارەو، ڕەنگی زەردم گەلاَی داوەریوی پایزانە، لێوی وشکم قرچەی هاوینەو، چاوی تەڕم بارانی بەخوڕی زستانە))[3]

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٢٣٩

[2] جواهر البلاغة (احمد الهاشمی) ل ١٩٦

[3] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ل١٣١

لەنیوەی دووەمی ئەم دێڕدا دەستە واژەی (سورشکم سووره، ڕەنگم زەردە ، لێوم وشکە،چاوم تەڕە) هەموویان بە دووایی یەکدا هاتوون بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە .

٢– لەبەر بوونی پاڕانەوە لە ڕستەدا :

مەحوی دەڵێ :

چکەس نابێ بە کەسدارم نییە لەو بەردەرە یارم

خودایە تۆ بکەی چارم،کەسێکم بێکەس و بێ دەر[١]

کەس دارم : بەرپرسم .بەردەر: بەردەگا .

مەحوی لە دێڕی دووەم کەدەڵێ: (خودایە تۆبکەی چارم) ئەم ڕستە دوعاو پاڕا نەوەیە بۆیە لەڕستەکانی تر دابڕاوە .

٣–ئەگەر لە نێوان ڕستە کاندا سوێند هەبوو :

نالی دەڵێ :

قەسەم بەو شەربەتی دیداری پاکت

شەرابم عەینی ژەهری مارە بێ تۆ[٢]

لەبەر ئەوەی لە سەرەتای نیوەی یەکەمی ئەم دێڕەدا سوێند هاتووە لە ڕستەی دووەم دابڕاوە .

---

[١] هەمان سەرچاوە ل١٣٠

[٢] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ل ٣٨٢

٤– ئەگەر لە نێوان ڕستەکاندا یەکگرتنێکی تەواو لەوێنەو واتا هەبوو:

نالی دەڵێ :

بینابیم کـــــوێرە، هەڵنایێ بە ڕوی کەس
موژەم یـــەك یەك دەڵێی بزمارە بێ تۆ[1]

نالی کەدەڵێ: بینابیم کوێرە)لە دوایێ دەڵێ:( هەڵنایێ) یەکگرتنێکی تەواو لە نێوان ئەم دوو ڕستەدا هەیە،لە بارەی وێنەو واتاوە،چونکە چاو کە کوێر بوو واتە توانای هەڵاتنی نابێ کە هەلیش نەهات نابینێ .

٥–ئەگەر ڕستەك داڕشتن بوو ئەوەی تر هەواڵ بوو:

نالی دەڵێ :

بەزمی هوزارە،قەل فری ئەغیارە، دەوری گوڵ
صـــۆفی! بڕۆ، مەبە بەدڕك، تـۆ لە ئێمەنی ..

مانای وشە: هوزار: بولبول. قەل فڕی: درکەیە لەدەرکردن و دورخستنەوە.ئەغیار: بێگانەو ناحەز .

((واتە: سەردەمی ڕابواردنی عاشقانە کە وەك بولبول وان و، کاتی دەرکردن و دوور خستنەوەی ناحەزو بێگانەیەو، ڕۆژ ڕۆژی گوڵانە .. کەواتە ئەی وشکە صۆفی جێی تۆ لای ئێمە نییە .. تۆ نەبولبولی و نەگوڵی تۆ بێگانەی و لەئێمە نیت دەسا لێمان مەبە بەدڕك و بڕۆ دوور کەرەوە،دڕك و گوڵیان پێکەوە نەوتووە.. ))[2]

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٣٨١

[2] هەمان سەرچاو ل٦٦٤

نالی کەدەڵێ:(صوفی بڕو مەبە بەدرك) ڕستەیەکی داڕشتنە کەدەڵێ تۆ لەئێمەنی ڕستەیەکی هەواڵە.

٦- لەکاتی دووبارە کردنەوەی ڕستە :

نالی دەڵێ :

لەنەهڕێنی دوو چـــاوم ئەشکی خوێنین
پەیـــاپەی دێ پەیاپەی دێ پەیاپەی

((واتە:بێ وچان دڵۆپی فرمێسکی خوێنین یەك لە دوای یەك بە ڕێز لە هەردوو چاوی وەك جۆگامەوە دا ئەوەڕێ))[1]

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٧١٢

## ڕاهێنان

شوێنی پیکەوەنان و دابرین لەم دێڕە شیعرانە نالی دیاری بکە

١–بولبولی طبعم ئەوا دیســـــان ثەنـــــا خوانی دەکـــــا
نوکتە سنجی و بەذلە گۆی و عەنبەر ئەفشانی دەکـــــا

٢–پەیـــــامت هات و پەیکت ڕۆیی ،خەیاڵم نـــاردو نەیگەییێ
ڕەســـــوولم کەوتە ڕێ، هێنای وەك ئـــــاگرە ســـــوورە

٣–کەللە وەك جەرڕەی شـــــــەرابی پڕنیشاط وتەڕ دەمـــاغ
شێری نەڕ، ئـــاهوویی بەڕ،گورگی سەفەر ،قەمچی نەچێژ

٤–خەراباتی دڵی نـــــالی مە فەرمـــــوو خالییە، نـــــایەم
بەمەرگی تۆ قەسەم ،چاوم! بە ذیکرت بەیتی مەعموورە

# ڕوونبێژی

## ڕوونبێژی: ألبيان

ناوەرۆکی ئەم بەشە :

١– پێناسەی ڕوونبێژی :

٢–گرنگی ڕوونبێژی .

٣– چواندن (التشبيه)

٤– دروست (ألحقيقة) و جۆرەکانی:

أ/ دروستی زمانی/ ألحقيقةاللغوية

ب/دروستی نەریتی تایبەت/ألحيقيقة العرفية الخاصة

ج/دروستی نەریتی گشتی/ألحقيقة العرفية العامة

د/دروستی شەرعی و دەستووری/ألحقيقةالشرعية والدستورية

٥– خوازە (ألمجان)و جۆرەکانی :

أ/خوازەی ژیری(ألمجاز العقلي ).

ب/خوازەی زمانی(ألمجاز اللغوی) ئەوەش دووجۆرە :

– خوازەی بەربلاو(ألمجاز المرسل ).

– خواستن (الإستعارة).

٦– درکە (کناية).

٧ – تەوس (التعريض).

ڕوونبێژی :(البيان)

**ڕوونبێژی:** زانیستێکە دامەزراوە لەسەر چەند بنەرەتێك بۆ دەربڕینی تاکە مانا لە ڕێگای جۆراو جۆر کە هەندێکیان لە هەندێکیان ڕوون ترو ئاشکرا ترن.[1]

لەم پێناسەیەدا کە دەڵێین: (رونبێژی زانستێکە دامەزراوە لە سەر چەند بنەڕەتێك) مەبەست ئەو بنچینەو بنەمایانەن کە بۆ زانینی تاکە مانا بە چەند شێوەی جیاواز بە کاردێن ، وەك بنچینەکانی چواندن و خوازە و ئەوانەی تر، مەبەست (لەتاکەمانا) ئەو مانـایانـەن کە دەربڕ دەری دەبڕێت بە شێوازێکی ڕێك و ڕەوان و گونجاو لەگەڵ باری پێویستی بۆ وتراو، وەك واتای ئازایەتی و بەخشندەیی و زیرەکی و جوانی و پاکی و زۆری تر. ڕوونبێژی نییە دەربڕینی مانا بە وشەی هاو واتا(مرادف) وەك - کەلەشێرو کەڵەباب - چونکە ئەمە بۆ زانیستی زمانەوانی دەگەڕێتەوە نەوەك ڕوونبێژی، مەبەست لەڕێگای جۆراو جۆر لەڕوونی و ئاشکرایی، ئەوەیە ئەو مانایانە هەندێکیان ڕوون و هەندێکیان ڕوونتر بن، مەبەست ئەوەنییە هەندێکیان ڕوون و هەندێکیان شاراوەبن، چونکە شاراوەی تەم و مژاوی مانای مەبەستی لێ دەرناکەوێ، جیاوازی ڕێگاکانی تاکە مانا وەك ئەوە وایە کەسێك باس لە بەخشندەیی کەسێك بکات بە چەند ڕێگایەکی جیاواز وەك باسکردنی بە چەند شێوازێکی لە یەکتر جیای چواندن[2] بڵێ (ئازاد وەك دەریایە لەبەخشین) (ئازاد وەك دەریایە) (ئازاد دەریایە) ئەوەی لێرە تێبینی دەکرێ ئەو دەربڕینانە هەموویان ڕاستن، بەڵام جیاوازی لە زیادەڕەویان دایە، دەربڕینی یەکەم زیادەڕەوی لەوەی دووەم

---

[1] علم البيان (د. بيسيونى عبدالفتاح فيود) ل ١٥

[2] هەمان سەرچاوە ل ١٦

کەمترە،چونکە (ئەوزارو ڕووی وێکچوونی)لێ باسکراوە ئەوەی دووەمیش زەیادەڕەوی لە وەی دووای خۆی کەمترە، چونکە(ئەوزاری)وێکچوونی لێ باسکراوە ئەوەی سێیەم زیادەڕەوی لە هەردووکیان زیاترە ،چونکە ئەوزارو ڕووی وێکچوونی لێ باس نەکراوە، بەم شێوەیە جیاوازی پلەی زیادە ڕەوی بەپێی جیاوازی جۆری چواندن دەبێ.یاوەك دەربرینی مانا بە شێوەیەك لەشێوەکانی خواستن (ألإستعارة)وەك لەڕێگای خواستنی ئاشکرا(ألإستعارة المصرحة) بلێی: دەریایەکم بینی دەیبەخشی.

ئەوەی لێرە بۆمان دەردەکەوێ، دەبینین زانستی ڕوونبێژی کراوە بە چەند بنەمایەك،کە ڕێ خۆشکەرن بۆ پەردە لادان لە رووی ماناو مەبەست .کەواتە گرنگی ئەم زانستە بۆ ئاشکردنی وردە کاریە لەڕێی بنەماکانی، وەك چواندن و خوازەو خواستن و درکەو تەوس، بەم واتایە ڕوونبێژی بە مانا هونەریەکەی دەربڕینێکی ڕەوانە لە گوزارشت کردن و دیاری کردنی مەبەست و مانای نێودڵ، هەرلەم پێناسەیەدا ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێ، ڕوونبێژی وەك زانست چەمکێکی گشتی یەو کورتەو هەمەلایانە، هەموو ئەم بابەتانە دەگرێتەوە کە گوزارشتیان بە شێوەی جۆراو جۆر لێ دەکرێ،کە واتە ئەم زانستە پێمان دەڵێ : هەر شتێك هاوبەشبوو لە ڕووی وێکچوون لەگەڵ شتێکی تردا دەشێ لە دەربڕین بە ئەوی بچوێنین بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی چواندن ،یان هەر شتێك پەیوەندی بە هێزی هەبێ لەگەڵ هاوشێوەی خۆی لە واتاو سیفەتدا دەشی لە ڕێگای خواستن بە کاری بێنین بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی خواستن،کەسێك کە شارەزابێ لەم زانستە دەتوانی لە ڕێگای بنەماکانی ببێ بە دەریاوانی دەریای هەموو گوزارشتێکی هونەری، یەکە یەکە مرواریەکانی بە دەستەوە بدات، بەڵام بنەماکانی زانیستی ڕوونبێژی هەر یەکە پلەو ئەندازەی خۆی هەیە، لە ڕوونکردنەوە و

ئاشکراکردن، هەریەکە جۆرە کارتێکردنێکی هەیە لە بەدەستەوەدانی مانا، پەسندکردنی هەریەك لەم بنەمایانە لەدەرخستنی مانا، تام و چێژی خۆی هەیە بۆ بیسەرو خوێنەر، بەلآم دەبێ ئەوەش بزانین پشت بەستن بە ڕونبێژی لەدوای پشت بەستن بە بنەماکانی واتاناسی دێ ،دەبێ مەرجەکانی واتاناسی تێدابێ و، بارو دۆخی گوێگرو خوێنەری لێ ڕەچاو بکرێ، وەك نووسین و دەربڕین بۆ کەسانی زیرەك دەبێ کورتبڕبێ، بۆ کەسانی بیرو هۆش نزم دەبێ درێژبڕبێ ، هەروا دەبێ ئەوەش بزانین گەیشتن بە مانای مەبەستی ڕوونبێژی هەمووی لەڕێگای مانای ڕاستەو خۆی وشەکانەوە نییە، بەڵکو هەندێکی پەیوەندی بەو مانایانەوە هەیە کەگوێگرو خوێنەر بەژیری خۆیان لە بەڵگەو ئاماژەکان وەری دەگرن وەك ئاماژەی لەخۆگرو پەیوەستایەتی (ألتضمين والإلتزام).

ئێمەکەلەدەقێکی پڕ لە هونەری ڕوونبێژی دەڕوانین، دەبینین لەچەند وشەیەك پێکهاتووە،ئەم وشانە تەنیا هەر ماناو واتای ڕاستەو خۆو سادە نین، بەڵکوئەو وشانەن گیانی نوێ و خەستی ڕوونبێژیان بە بەر داهاتووەو دیوی ئەودیویان هەیە، دەربڕینی ماناو مەبەست بەشێوەی جۆراو جۆرو جیاواز لە ڕێگای ڕوونبێژی بە مەرجەکانی ڕەوانبێژی، دەبێتە خاوەن وێنەو ڕوخسارێکی جوان و سەرنج ڕاکێش لەلایەن سۆزو بیرو هەست و شێواز ناسکی .

## چواندن :التشبيه

ئەوەیە: شتێك بەشتێکی دی بچوێنی کەهاوبەشبن لەسیفەتێك یان زیاتر، بەهۆی یەك لە ئەوزارەکانی، باس کرابێ، یان باس نەکرابێ ڕەوتی ڕستەئاماژەی پێ بکات.[1]

---

[1] بلاغة العرب علی سلوم (د) ل١٧١

## گرنگی چواندن

ئێمە لەو کاتە شتێك بەشتێك دەچوێنین و دەیکەین بە هاوبەش لەگەڵ شتێکی لە خۆی ئاشکرا ترو بالاّ تر بۆ گەیشتن بە ماناو مەبەست، دەبینین هونەری ڕوونبێژی بەو پەڕی جوانی دەردەکەوێ و پەردە لە ڕووی شتی بزرو شاراوە لادەداو گوێگرو خوێنەر بەبنج و بنەوانی ماناو مەبەست دەگات و ڕووپێوێکی سیفەتی چوێنراوت بۆ دەکات لەو کاتە کە بەلەخۆی بالاّ تری دەچوێنی، چونکە مەبەست لە چواندن بۆ زیادەڕەویە، زیادەڕەویش یان ستاییش (مدح) یان داشکان (ذم)یان بۆ ڕوونتری و ئاشکرا تری دەبێ بە هەرحاڵ لەم سێ حاڵەتە دەرناچێ بۆ ئەوەی چواندنەکە ڕێك و ڕەوانی خۆی وەربگری لە هەموو چواندنێك تەقدیری ئامرازی پەسندیدە (إسم التفضيل) لە پێ چوێنراو دەکرێ.[1]

ئێمەکە دەڵێین فەرهاد شێرە)لەچەمکی ئەم چوواندنە دەزانین پێ چوێنراو کەشێرە ئازاترە بەلاّم چواندنەکەمان بۆ زانینی ئەندازەی ئازایەتی چوێنراوە کە فەرهادە .

چواندن وەك هەر هونەرێکی ڕەوانبێژی شتێك نییە تایبەت بێ بەزمان و نوسینی نەتەوەیەك، بەڵکو جێگایەکی بەرفراوانی لە نووسین و ئاخاوتنەکانی ئێمەی کوردیشی گرتووەتەوە، وەك بەهەرەیەکی زگماك و گشتی لەدەربڕین و گوزارشت کردن، زۆر جارکەسانی نەخوێندەواریش گوزارشت بەم بەهرەیە بەڕێك و ڕەوانی دەکەن. بۆ ئەوەی ئەندازەی شیرینی خواردنێك بزانن دەڵێن:دەڵێی هەنگوینە.بۆ زانینی ئەندزاەی ئازایەتی دەڵێن: دەڵێی شێرە .بەلاّم لەبەر ئەوەی چواندن جۆرێکە لە

---

[1] علم البيان عبد العزيز عتيق(د) ل ٨٢

وێنـە،جوانی و داهێنـانی بۆکەسێکە هـەموو پێداویسـتیەکانی وێنەکێشـانی هەبێ،لە وشەو مانـاو دارشـتن و لـە خـەیاڵی چڕو پڕ، ئەمـەش بـۆ هـەموو کەسێك دەستەبەر نابێ، تەنها بۆ کەسانی شارەزای ئەم بوارە نـەبێ، بۆیـە گوتراوە چواندن لە نێو هونرەکـانی ڕەوانبێـژی هونـەرێکی جـوان و سـەرنج ڕاکێش و هەستیارە هەرکەم و کووڕیەکی لێ ببینرێ لکـەداری دەکـات و بـۆ ناشیرینی دەبات ئەم کەم وکووڕیانەش هەندێکی بۆ وشـەو هەندێکیشـی بـۆ خـەیاڵ و بـۆ بنـەماکانی ڕەوانبێـژی دەگەڕێتـەوە کەچـواندنی لەسـەر دامـەزراوە، ئـەو بنـەما ڕەوانبێژیانـەش کـە چـواندنی لـە سـەر دادەمـەزرێ پێویستە شت بـە لـەخۆی بـالاّ تـرو بـە هێزتـر بچـوێنرێ گـەر چـواندن بـەم شێوەیە نەبوو دەبێ بە چواندنێکی ناتەواوو پڕ لەکەم و کووڕی.[١]

دەبـێ ئـەوەش بـزانین هـەموو بـەهاو بەشـکردنێك نـابێ بـە هونـەری ڕەوونبێژی،چـونکە هـەردەم ڕووی چـواندن (وجـه الشـبه) لـە پـێ چوێنراو(ألمشبه به)پەسـند تـرو لـە بـارترە لـە چـو ێنـراو (ألمشـبه) تـەنیا لەچـواندنی پێچـەوانە (التشـبیه المقلـوب) نـەبێ کـە لەمـەو دوا باسـی لێوەدەکـەین کەواتـە وەك یـەك (التشـابه) ناخرێتـە پـاڵ چـواندن، چـونکە ئەگەر مەبەست لە چواندن بۆ بەستنەوەی کەم بە زۆرەوە نەبوو بـەڵکو بـۆ یەکسانی هەردوو سەری وێکچوون بوو، بە جورێـك هـەردووکیان دەگونجـان ببن بە چوێنراو و پێ چوێنراو بێ ئەوەی یـەکیان پەسـند تربکـرێ لـەوەی تر، ئەوکاتە باش تر وایە دوور بکەوینەوە لەم جۆرە چواندنە[٢]

---

[١] علم البیان عبد العزیز عتیق(د) ل٨٨-٨٩

[٢] علم البیان (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ل ١١٨

## بنەڕەتەکانی چواندن

چواندن بابەتێکی گرنگی ڕوونبێژی یە لەسەر چەند بنەڕتێك دامەزراوە کە ئەمانەن :

١– چوێنراو/ المشبە :

واتە:چواندنی شتێك بە شتێکی دیار تر لەخۆی لە سیفەتی هاوبەشی نێوانیاندا ،بۆ ئاشکراکردن و زانینی هەمان سیفەت لە یەکەمدا .

٢–پێ چوێنراو: ألمشبەبە:

واتە:ئەوشتەیە دەبێ بەئاوێنەی ناسین و ئاشکراکردنی سیفاتی چوێنراو بە هاوبەشکردن و پێ چواندنی.[1]

لەم دوو پێناسەیەدا(چوێنراو- المشبە، پێ چوێنراو- المشبەبە)کەپێ یان دەوترێ دوولای چواندن(طرفا التشبیە) ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ ئەو شتەی کەسی دەربڕ دەیەوێ گوزارشتی لێوەبکات دەبێ ئەو سیفەتەی لێوە هەبێ پێویست بە ئاشراکردن و ڕونکردنەوە بێ، بە بەراورد کردن و هاوبەشکردنی بە سیفەتی هاوبەش و هاوشێوەی لە خۆی ئاشکراو دیار تر،کەپێ چوێنراوە (ألمشبەبە) چونکە شێوازی چواندن دەبێ دوولاکەی لە هەندێ لا جیاوازیان هەبێ لە هەندێك لاش وەکوو یەك بن، بە شێوەك پێچوێنراو ببێ بەتەرازوو و ئاوێنە بۆ زانینی چۆنیەتی سیفاتی چوێنراو. (ألمشبە) .

(قدامە بن جعفر٣٣٧ هـ)) زانای ڕەوانبێژی عەربی دەڵێ: (چواندن ئەوەیە لە نێوان دووشت بێ هاویەشبن لە چەند مانایەك و وەسفیان بەو

---

[1] جواهر البلاغة (أحمد الهاشمی) ل ٢٤٧

مانایانە بکرێ، لە چەند شتێکیش جیاوازو سەر بەخۆ بن،لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: شت بەخۆی ناچوێنرێ بەشتی بەر لە خۆشی نا چوێنرێ لە هەموو ڕووێکەوە،چونکە گەر دووشت لەهەموو لایەکەوە بە یەکتر چوون هیچ جیاوازیەکیان لە نێواندا نەبوو دەبن بە یەك شت، بۆیە بەلای ئەو زانایە جوانترین چواندن ئەوەیە لەنێوان دووشت بێ لە زۆری سیفەتەکان هاوبەشبن بە شێوەیەك لە یەکتر نزیك ببنەوە وەك یەك سەیربکرێن ، هەروا دەڵێ: دروستە شت بەشت بچوێنرێ لە هەموو ڕویکەوە هەرچەند جیاوازیش لە نێوانیاندا هەبێ وەك کەسێ بڵێ ڕووی وەك ڕۆژ وایە، هەرچەندە وەك ڕۆژیش نەبێ لە تەواوی تیشکدانەوەو لە قەبارەو گەورەیی، بەلاَم لە واتایەك بەیەك دەچن کە جوانیە،گەر بڵێن کەسێکە وەك دەریایە واتە: وەك دەریایە لە بەخشش ولەزانست ، مەبەست سوێری و سیفاتی تر نییە کە لەدەریادا هەیە)[1]

٣- ڕووی لێچوون سیفەتێکی هاوبەشی نێوان (پێ چوێنراوو چوێنراوە) بۆ بەیەکتر بەستانەوەیان، دەبێ لە یەکەم ڕوون و ئاشکراتربێ.[2]

لەبەر ئەوەی ڕووی وێکچوون بۆ مەبستی تایبەتی پێکەوە بەستنی هەردوو سەری چواندنە بەیەکەوە، دەبێ گرنگی زۆری پێ بدرێ بە بایەخ پێدانی لە لایانی وردەکاری، هەرچەند ئەم سیفەتە پڕبی لە بیرو هەست و سۆزو خەیاڵ تەمەنی درێژتر دەبێ و دەبێتە جێگای سەرنج ڕاکێشان، دەبێ ئەوەش بزانین مەرج نییە ئەم سیفەتە هاوبەشە لە هەموو دەق و

---

[1] علم البيان. (عبدالعزيز عتيق.د) ٤٣-٤٤

[2] علم البيان (د. بيسيوني عبدالفتاح فيود) ل ٢٤

گوتراوێك ڕاستەوخۆ باسی لێوەبکرێ، بەلآم دەبێ بوونی هەبێ چونکە بنەڕەتێکی بەیەکتربەستانەوەیە .

٤– ئەوزاری چواندن/أداة التشبیه:

ئەو وشانەن دەبن بە ئەلقەیەك بۆ بەستنەوەی سیفەت و پەیوەندی نێوان چوێنراو پێ چوێنراو.

ئەوەی شایانی باسە مەرج نییە ئەوزار لە هەموو ڕستەیەکی چواندن ڕاستەو خۆ باسی لێوە بکری،بەڵکو زور جار بۆ بە هێز بوونی لایانی زیادەڕەوی ئەوزار لە ڕستەدا باس ناکرێ هەروەك لە مەودوا باسی دەکەین.

**لە ئەوزارە کانی چواندن:**

(وەك ، وەکوو، ژڕەنگی ، وێنە، چەشن، چوو، ئەڵێی، تەرز، چۆن ، ناسا، لەونەکا، لەونەچی، شێوە، ڕەنگ)

سەرەڕای ئەم ئەوزارانەش شاعیرانی پێشوو بۆ مەبەستی چواندن (مانەندو ، چون)ی فارسیش یان بەکار هێناوە، هەروا ئەوزاری عەرەبیشیان زۆر بەکارهێناوە وەك (مثل و شبە و عین و عەدیل) زۆری تر .

هەندێك لەنموونەی ئەوزارەکان:–

١– (وەك) ٢–(وەکو) ٣– (شێوە) ئەدەب دەڵێ :

بەغەمزە بازو ڕەوش! کەو بەجیلوە ! وەك تاوس
بەلەنجە هەر وەکو کۆتر، بەشێوە جەیران بوو([1])

---

[1] دیوانی ئەدەب (دیوان مصباح الد یوان ) لێکدانەوی (محەمەد سعید نەجاری) ل٧١

٤- ( ژڕەنگیٚ) ئەحمەدی خانیٚ دەڵیٚ :

سـەد تـازە جـەوان، ژڕنگـیٚ سـروان
دیبـاوو حەریـرو خـەز دبـەروان([1])

٥- مانەند : نالی دەڵیٚ :

دڵبرێـکم هەیـە مەشهـووره بەبـیٚ مانەنـدی
بـیٚ شـك وشـوبهە،خودا شـاهیدە،مانەندی نییـە([2])

٦- (چوو) : نالی دەڵیٚ :

ئـەو فـەوت ووەفـاتە سەبـەبـی عەهـد و وەفاتـە
چوو ساعیقەیی بەردی عەجووزو گوڵ و مـول هـات([3])

٧-(وێنە) : مەجزوب دەڵیٚ :

تانـەی ناکەسـان،ڕەقیبی بـەدگۆ
وێنـەی مارانگـاز نـە دڵ مـە دۆسـۆ([4])

٨- (دەڵێی):نالی دەڵیٚ:

سـەراپای گـوارە زەردی تـرس و لـەرزە
دەڵێـی عاصـیی بووەلـەو جێگەبـەرزە !([1])

[1] مەم وزین ئەحمەدی خانیٚ شەرح جان دوست ١٩٤
[2] دیوان نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٥٩٣
[3] فەرهەنگی دیوانی شاعیران.محمەد نووری عارف ل٢٩٠
[4] بەشێك لەدیوانە مەجزوب مەجزوب لێکدانەوەی حەکیم مەلا ساڵح ل٢٨

٩– (لەوئەچی) : حەمدی دەڵێ:

ئەحـــوالی ئـــەم زەمـــانە لەکایـــەی منـــاڵ ئەچـــی
دونیایـــەکی چ پووچـــە لـــەزەرفی بـــەتاڵ ئەچـــی[2]

١٠– (عەین) :حاجی قادر دەڵێ :

ئەگـــــەرخاڵت بڵـــــێم مشـــــکی خەتایـــــە
عـــــەزیزم مـــــن ئەمـــــەم عـــــەینی خەتایـــــە[3]

١١– (مثل): نالی دەڵێ:

نـە ظمـــی نـــالی میثلـــی ئـــاوو ئاوێنـــە ڕەنـــگی نییـــە
دوو ڕووە بۆ سەیری خاتر:یەك خەفیی و یەك ئاشکار[4]

١٢– (شوبهێ) ئەحمەدی خانێ دەڵێ :

ئـــــەی خامـــــە تـــــەژی گەلـــــەك درێـــــژکر
ئـــــە ڤ نامـــــە بەســـــە تـــــە پـــــڕ قرێـــــژکر
هەرچـــــــــەندەکەلام شـــــــــوبهێ دوڕبـــــــــت
بـــــێ قـــــەدر دبـــــت دەمـــــا کوپڕبـــــت[5]

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٤٤٨
[2] دیوان حەمدی لێکۆڵینەوەی جەمال محەمەد محەمەد ئەمین ل١١٦
[3] دیوانی حاجی قادری کۆیی/پێداهاتنەوەی/ هێرش بێتووشی/٧٦
[4] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ١٧٤
[5] مەم وزین ئەحمەدی خانێ بەراڤەو شرۆڤەیەك نوو پەروێز جیهانی ب٢ل١١٤٧

١٣- (عەدیل): نالی دەڵێ:

عەرعــــەڕ عـــــەدیلی قەدییـــــە، یـــــەعنی بەرامبـــــەرن
ســـــونبول شــــەبیهی زولفیە،فــــەرقی نییـــــە مـــــوێ(١)

## بەشەکانی چواندن

**یەکەم: چواندن بەگوێرەی باسکردن و باس نەکردنی بنەڕەتەکانی :**

١-چـواندنی ڕەوان/ ألتشبیـه البلیــغ : ئەوەیـە تـەنیا چوێـنراو و پـێ چـوێـنراوی لێـوە ها تـبێ.(٢)

ئەم جۆرە چواندنە بە بە هێزترین پلـەی چـواندن دادەنـرێ لـە لایـەنی زیادەڕەویـەوە، چـونکە وەك ئـەوە وایـە چـوێنراو بەهـەمان شـێوەی پـێ چوێنراو سەیر بکرێ، هەروا وا لە گوێگر دەکات زەینی بۆ هەموو وێنەکانی چواندن بچێت ئاماژەکانیشی ڕوون و ئاشـکربێ و بـەجوانترین شـێوە مانـاو مەبەست بپێکێ(٣)

مەحوی دەڵێ:

دنیـــــا تیاترۆیـــــــە، مەوەســــــتە تیــــا، بــــــڕۆ
کـــێ مایـــەوە تیـــا کەنـــەبووبێ تیـــا تـــڕۆ؟!(٤)

(دنیا)(چوێنراو- مشبە)ە

(تیاترو) (پێ چوێنراو - مشبەبە)یە

---

١ دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٦٩

٢ جواهر البلاغة ( احمد الهاشمی) ل ٢٧٠

٣ علم البیان ( عبدالعزیز عتیق.د).ل ٢٢

٤ دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی/مەلاعبدالکریمی مدرس ل٢٥٣

ئەو زارو ڕووی لێکچوون نەهاتووە.

مەحوی دەڵێ :

کۆتری دڵ، چەنگوڵی بازی قەضا یەعنی موژەی
دی،بە زولفی چوو پەنا با،کەوتە داوی بەلاّ

((واتەکۆتری بەسەزمانی دڵ چەنگی بازی قەزاو قەدەری دی کە برژانگی یارە،لە ترسا چوو پەنای بە زوڵفی برد خۆی تیاحەشار بدا،کەچی لە وێش کەوتەداوی بەلاّی زولفیەوە.))[1]

(کۆتر) پێچوێنراوە. دراوەتە پاڵ (دڵ) ( دڵ ) چوێنراوە.

ڕووی لێکچوونە کە( بێهێزی)یە ئەوزار کە(وەك)ە هەردوکیان نەهاتوون

٢–چواندنی جەخت لێ کراو/ألتشبیه المؤکد :

ئەوچواندنەیە دامەزرابێ لەسەر چوێنراوو پێ چوێنراو ڕووی لێکچوون و ئەوزاری چواندنی لێ باس نەکرابێ.[2]

نالی دەڵێ :

بەحری غەزەلم پڕ لە دڕو گەوهەرە، ئەمما
غەوواصی دەوێ یەعنی تەعمیقی بزانە

واتە:غەزەلەکانم لەقوولی و پڕمانایی وردو جوانیدا وەك دەریای قووڵی پڕ لە دڕو گەوهەرە،کە سانی زانای وەك دەریاوانی چاکی دەوێ بتوانی

[1] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی/مەلاعبدالکریمی مدرس ل٢٨

[2] بلاغة العرب علی سلوم (د) ل ١٧٧

بچێتە قـووڵایی بنـی ئـاوی لێکدانەوەلەشـیعرەکانم بگـات و مانـای ورد و گرانبەها بەدەست بێنی.[١]

(بەحر) پێ چوێندراوە دراوەتەپاڵ غەزەل .

( غەزەل) چوێنراوە.

(تەعمیق)کە قوولیی و ڕووچوونە، ڕووی لێکچوونە

ئەوزار: نەهاتووە .

٣- چواندنی قوول.تێکرایی./التشبیه المجمل :

ئەوەیە: چوێنراوو پـێ چـوێنراوو ئـەوزاری لێـوە هـاتبی، بـەڵام ڕووی لێکچـوونی لێـوە نەهاتبی[٢]

مەحوی دەڵێ :

بـــــەگریانم، وەکـوگــــــول، پێـــــــکەنی یـــــار
لــــەباغی مـــــن بــــە بـــــارش غونچــــە پشـــــکوت

بارش: باران بارین .

واتەیاری وەك گوڵ نازدارو جوانم بەگریانی من پێکەنی. ژیانی مـن وەك باغ وایەو گوڵەکەی یارەکەمەو بارانی ئاودانی چاوەکانمە. بـەداوەرینی ئـەو بارانە گوڵەکەی من کە یارەکەمە پشکوت و پشکوتنەکەی ئەوە بـوو دەمـی کرایەوە پێکەنی.[٣]

---

[١] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلاعبدالکریمی مدرس ل٢٨

[٢] علم البیان (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ل ٤٨٠

[٣] دیوان مەحوی لێکۆڵینەوەی/مەلاعبدالکریمی مدرس ل٨٠

(یار) چوێنراوه .

(گوڵ) پیَ چوینراوه

(وەکو) ئەوزاره هاتووه .

ڕووی لێکچوون :نه هاتووەکه دەم کرانەوەیه.

٤– چواندنی درێژ : ألتشبيه المفصل، أولمرسل.

ئەوەیه: هەرچوار بنەڕەتەکانی لێوەهاتبێ چوێنراو و پیَ چوێنراو و ئەوزارو ڕووی چواندن..ئەمەیان بێ هێزترین پلەی چواندنه.[1]

نالی دەڵێ :

نەظمی((نالی)) میثلی ئاو و ئاوێنه ڕەنگی نییه
دوو ڕووه بۆ سەیری خاطر: یەك خەفییو یەك ئاشكار

((واتەشیيعری نالی وەك ئاوو ئاوێنه وایه ڕەنگی نییه، دوو رووه، بەرو پشتی هەیه.له ڕوێكیابنیادەم، وەك چون له ئاوو ئاوێنەدا خۆی دەبینی، مەعنای ئاشكرای بۆ دەر ئەکەوێ و، لەو ڕووەکەی تریشیان وەك بنی جام یا وەك جیوەی ئەودیوی ئاوێنه وایه هیچ دەرناکەوێ))[2]

(نه ظمی نالی): چوێنراوه

(میثل ): ئەوزاره

(ئاوو ئاوێنه) پیَ چوێنراوه

(خەفییوئاشكار): ڕووی لێکچوونه.

---

[1] علم البيان (د. بيسيونى عبدالفتاح فيود) ل٨٢

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الكريمى مدرس ل ١٧٤

**دووەم : لێکچواندن بە پێی هەستی و ژیری :**

لەبەرئەوەی چواندن ڕەگی ڕوونبیژی خۆی لەناخی زەوی بە پیت و بەرەکەتی هونەرەکانی ئەدەب دا کوتاوە و، بووەبە درەختێکی زل هەردەم وشەگەش بۆ گوزارشت کردن و دەربڕین.کە سەرنجیش دەدەین دەبینین چەند جۆری هەیە وەك:

١- چواندنی شتی هەستی بەهەستی :

شتەهەست یارەکانیش ئەمانەن : (دیتن، بیستن ، بۆن کردن، تام وچێژ ، لێك خشان )

نالی دەڵێ :

تیــــژاوی سورشـــــکم وەکــــو ئیکســــیری ســــوهەیلە
ڕوخســــــاری زەردم وەکــــو ئــــەو راقـــی خەزانــــە

مانای وشە:

تیژاو: تیزاب .شلەیەکی کیمیاییە زێڕی بێ گەردی لەناپاك پێ جیا ئەکرێتەوە.ئیکسیر: مادەیەکی کیمیایە گوایە ئاسن و مسی پێ ئەکرێ بەزێڕ. سوهەیل: ئەستێرەی گەشی سوهەیل کە نیشانەی پایزەو کە هەلاَت ئیتر گەلاَی دار دەست دەکا بە زەردبوون .ئەوراقی خەزان: گەلای پایز.[1]

((واتە: فرمێسکی سوێرو تیژم ئەڵێی ئیکسیری ئەستێرەی سوهەیلە. ڕووخساری زەرد هەڵگەڕاویشم ئەڵێی گەلای داری پایزانە چۆن ئەستێرەی سوهەیل بۆ گەلاَی دار ئەبێ بە ئیکسیرو زەردی ئەکا وەك ئیکسیر زیڕی

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٤٧٩

بێ گەرد دەربخا، فرمێسكی وەك تیزابیشم ڕووی وەك ژەنگاوی سوورم زەرد هەڵئەگەڕێنێ))[1]

سروشك و ئیكسیر، هەروەها ڕوخسارو ئەوراقی خەزان هەموویان شتی هەستین .

تیژاوی سروشك : چوینراوە.

ئیكسیری سوهەیل: پێ چوێنراوە.

روخساری زەرد:چوێنراوە .

ئەوراقی خەزان: پێ چوێنراوە.

ئەم چوێنراوو پێ چوێنراوانە كەلەم دێڕە شیعرە هاتوون هەموویان هەستین .

٢– چواندنی شتی ژیری بە هەستی :

شتی ژیری ئەوەیە: بەبیرو هۆش و لێكدانەوە بزانرێ ، وەك بڕواو،ئابڕو، درۆو، ڕاستی وزیرەكی و، هێمنی و هێوری و ئازایەتی و توورەیی.یا ئەو شتە ئەفسانەییانە كە تەنها بەخەیاڵ بوونیان هەیە .

مەحوی دەڵێ :

لەدنیا تا دەگاتە ئاخیرەت كارگەرە، تیری
وەكوتیری تەهەمتەن زامی پاك ئەم دیوو ئەودیوە

---

[1] هەمان سەرچاوە ل ٤٧٩

مانای وشە : تەهمتەن: ئازاو بەهێز .لەقەبی ڕۆستەمی زاڵە،کەدەڵێن تیری بۆ هەرکەس وەشاندبێ ئەم دیوو ئەو دیوی کردوە .

((واتە: تیری نەفس لە هەر کەس بدا، لەم دنیایەوە دەڕواو لەو دنیا دەردەچێ وتوشی سزا و دەردی دنیاو قیامەتی دەکا، وەك تیری تەهەمتەن کە لە هەرکەسی دابێ ئەم دیوو ئەو دیوی کردووە))[1]

تیری نەفس:چوێنراوە: ژیریە .

تیری تەهەمتەن : پێ چوێنراوە. هەستی یە.

وەکو: ئەوزارە .

ڕووی لێکچوون:کاریگری و کارلێکردنە

٣-چواندنی شتی هەستی بەشتی ژیری :

نالی دەڵێ:

زارم وەکو هیلال و نەحیفم وەکو خەیاڵ:
ئایا دەکەومە زارو بە دڵدا دەکەم خطور

مانای وشە: زار: لاواز. دەم . هیلال: مانگی یەك شەوە. نحیف: لەڕ.خطور: تێپەرین.[2]

من: چوێنراوە : هەستی یە

خەیاڵ: پێ چوێنراوە. ژیریە

وەکو: ئەوزارە

ڕووی لێ کچوون :بێ هێزیە

[1] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی/مەلاعبدالکریمی مدرس ل٢٨٨

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی/مەلاعبدالکریمی مدرس ل١٩٦

فەنایی دەڵێ :

کە کۆچی کردو ڕۆیی لەیلەکەم شێوا هەموو هێزم
وەکو (بازاڕی لەنگە) ئاگری تێچوو دڵ و فکرم

مەبەست لەبازاڕی لەنگە: بازاڕی کۆنە فرۆشانی شاری هەولێرە کەسێ جار ئاگری تێبەربووە زیانێکی زۆری ماددی گەیاندووە.[1]

فکر:چوێنراوە ژیریە .

بازاڕی لەنگە: پێ چوێنراوە هەستی یە.

هەرلەم دێرە شیعرەدا هەستی بەهەستیشی تیدایە

دڵ: چوێنراوە هەستی یە،

بازاڕی لەنگە: پێ چونراوە هەستی یە .

٤–لێکچواندنی شتی ژیری بەشتی ژیری .

حەمدی دەڵێ :

خەوالۆ بوو برابەختم، وەیا خۆ هەر لە خەو دابوو
سوپای شادی لەدڵدا تیپی تێك دابوو لە ڕەودابوو
کە فرست کەوتە دەست غەم،هێرشی هێناوەکوشە یطان
وەها ڕێکەوت کە ڕۆژ گیرانی ئەمجارە لە شەو دابوو

مانای وشە : ڕەو:بریتی یە لە کۆچێکی کۆمەڵی لەبەر بەلایەك بەسەر یانا بێت وەکو هێرشی دوژمن ، یان لافاو. تا..

---

[1] فەنایی مەلاعبد الله ی کاتب ل ١٠٧

ئەم چوارینە ئیشارەتە بە ڕوداوێکەوە، ئەویش ئەوەیە کە شەو لە ناکاو حەمدی هەواڵی ئەوە وەر دەگرێت کە شێخان هەواڵیان وەرگرتووە کە ئینگلیز بە پێچەوانەی مەرامیانەوە ئەجوولێتەوە و هەر ئەوشەوە بە ناچاری ڕەویان کردووە بۆ بناری گوێژە.[1]

( غەم) چوێنراوە. ژیریە .

(شەیتان ) پێ چوێنراوە . ژیریە.

**سێیەم : چواندن بە گوێرەی چوێندراو و پێ چوێنراو دووجۆرە :**

١- چواندنی ڕێکخەر (تشبیە التسویة) واتە: دووشت یان زیاتر بە یەك شت بچوێنی:[2]

مەحوی دەڵێ :

مە ثە لی عەهدو وەفا وەك مە ثە لی عەنقایە
پیاوەتی باسی لەکن کەس مەکە ئادەم بووە قات

عەنقا :باڵدارێکی وەهمییە.

((واتە::وەفاو پەیمان ڕاگرتن وەك عەنقای لێ هاتووە ،دەنگی هەیە ڕەنگی نییە.پیاویش نەماوە پیاوەتی لێ بوەشێتەوە، بۆیە باسی پیاوەتی لای کەس مەکە))[3]

لە نیوەی دێری یەکەم مەحوی( عەهدو وەفا)ی کە دووانن بە شتێك چواندووەکە(مە ثە لی عەنقایە)

---

[1] دیوانی حەمدی لێکۆڵینەوەی جمال محمد محمدأمین ل ١٧٧

[2] بەلاغةالعرب (علی سلوم.د) ل ١٧٥

[3] مەحوی دیوان لێکۆڵینەوەی/مەلاعبدالکریمی مدرس ل ٦٢

عەهدو وەفا : چوێنراوە.

عەنقا: پێ چوێنراوە.

٢– چواندنی کۆ ـ تشبیه الجمع :

واتە: چواندنی یەك شت بە دوو شت یازیاتر[١]

نالی دەڵێ :

((نـــالی)) مـــە ثـــە لی حـــاڵی لەئەشـــکەنجەیی غەمـــدا
وەك ناڵـــە لـــە نەیـــدا ، وەکـــو نالـــە لـــە قەلەمـــد ا

مانـــای وشـــە: مـــە ثـــە ل: نموونە.ئەشـــکەنجە:ئازار.ناڵە هـــاوار.
نەی:شمشال.نالە: تالەباریکەکانی ناو قەلەمی قامیش.

((واتە :نموونەی حاڵی نالی بە دەست دەردو ئازارو گیرو گرفتی خەم و پەژارەوە وەك نموونەی ناڵـەی شمشـاڵی لێ هـاتووە کـە هەمیشـە سـکاڵای دووری ئـەکاو هـەرگیز شـکاتی نابڕێتـەوە، یـاوەك ئـەو تالـە باریکـەی نـاو قەلەمدایەو هەر تاوێك قەلە مەکە دابڕێ ئەویش لێی ئەبڕێ))[٢]

نالی مە ثە لی حاڵی خۆی بەدووشت چواند ووە:( بەناڵە لەنەیدا)وبەنالە لە قەلەمدا)

(مەثە لی حاڵی): چوێنراوە.

(ناڵە لەنەیدا، نالە لەقەلەمدا): پێ چوێنراون.

---

[١] بلاغةالعرب (علی یلوم.د) ل١٧٦

[٢] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٣٨

**چوارەم :چواندنی چەند شتێك بەچەند شتێك بەگوێرەی بلاوی وپێچراوی :**

١- چواندنی بلاو (التشبیه المفروق): واتە هێنانی چەند چوێنراوو پێ چوێنراو لە یەکتر بەستراوو سەر بەخۆ و بە دووای یەکەوە[1]کەئەم دووجۆرەن :

أ/ هێنانی چەند چوێنراوو پێ چوێنراو بەستراو و سەر بەخۆ بە دووای یەکەوە چوێنراو لە پێش پێ چوێنراو بێ .

نالی دەڵێ :

دنـــدان گوهـــەرو، لـــەب شـــەکەرو،پەنجە بلـــورن
نـــازك بـــەدەن و، مووکەمـــەرو، ســـیم سریـنـــن

مانای وشە : دندان: ددان .گوهەر: گەوهەر.بلور: شووشە. موکەمەر : قەدباریك وەك موو.سیم : زیو. سورین: سمت.[2]

نالی لەم دێرە شیعرەیدا چەند چوێنراوو پێ چوێنراوی بە دووای یەکەوە هێناوە، ددانی یاری بە گەو هەر داناوە،لەبی وەك شەکەرو پەنجەی کردووە بەبلور. هەر لێکچواندنێکیشی لەمانە بە سەربەخۆیی هێناوەتەوە .

(ددان): چوێنراوە.
(گەوهەر): پێ چوێنراوە.
(لەب): چوێنراوە.
(شەکەر): پێ چوێنراوە.

---

[1] علم البیان (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود)ل٤٥
[2] دیوان نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٣٢٩

(پەنجە): چوێنراوە.

(بلور): پێ چوێنراوە.

ب/ هێنانی چەند چوێنراو پێ چوێنراو لە دووای یەکەوە، پێ چوێنراو لە پێش چوێنراو بێ.

وەك نیوەی دووەمی ئەم شیعرەی نالی (موو) پێ چوێنراوە لە پێش چوێنراو هاتووە کە (کەمەر)ە (سیم) پێ چوێنراوە لەپێش چوێنراو هاتووە کە سێرینە.[1]

یاوەك دەڵێ:

سیمین بەدەن و، سەرو قەدو،لەنجە تەذەرون
کافرنیگەهـ و، ڕەشك ، لە بتخانەیی چینن

مانای وشە: سیمین بەدەن لەش وەك زیو سپی. تەذرو:جۆرە چۆلە کەیەکە گۆشتی ئەخورێ، کلکێکی درێژو پەڕێکی جوانی هەیە، لە دارستان و کێلگە کانا ئەژی. هێلانە لە زەویدا ئەکاو بیست و چوار ڕۆژ بە سەر دە هێلکەوە ئەنیشێ تا هەڵیان دێنێ.کافرنیگەهـ: ئەوەی بێ ڕەحمانە بڕوانێتە یەکێك .ڕەشك: بەخیلی،ئیرەیی .

واتە: ((ئەم کچە شۆخانە ئەگەر لەچاوەوە بۆیان بڕوانی، وەك ئاسکی حەرەم وان کەس ناتوانێ دەستیان بۆ بەرێ و،حەرەمەکەشیان قیبلەگای برۆیانەو،ئەم یارە قسە خۆشە لێو وەك هەنگوینانە کە هەر یەکەیان بگری نازدارێکی چینە لە شیان وەك زیوو، بالآیان وەك سەرو و لەنجەیان وەك

[1] دیوان نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٣٣٩

قونــەی تــەذەرو لاکردنــەوە و تەماشــایان کافرانــەو حەســوودانەیە ،وەك لەبتخانەی چینەوە هاتبن وان)).[1]

٢-چواندنی پێچراوو کردنەوەی ڕێك (اللـف والنشـر المرتب):ئەمەشیان دووبەشە :

أ/ هێنانی چەند چوێنراوێك بەدووای یەکەوە ئینجا بە هەمان شێوە پـێ چوێنراو بهێنرێ. واتـە:چـوێنراوی یەکـەم بـۆ پـێ چـوێنراوی یەکـەم دووەم بۆدووەم تادوایی.

مەولەوی دەڵێ :

وەبـــۆی ئـــەو بـــالاو خـــەت و کـــولّم و فـــەم
ســـــەروو ســـــەوزەو گـــولّ غونچـــە بـــدۆدەم([2])

مانای وشە: خەت :زولف. فەم :دەم .بدۆ دەم: دەم بداتەوە.[3]

مەولەوی لـەم دێـڕە شـیعرەیدا هونـەری چـواندنی پێچـراوو کردنـەوەی ڕێکـی (اللـف والنشـر المرتـب)ی بـەکارهێناوە بەرامبـەر بـە بـالا سـەروو، بەرامبەر بەخەت سەوزە، بەرامبەر بەکولّم،گولّ، بەرامبـەر بەفـەم ،غونچە، لـە پێشـان چـوێنراوی هێناوەتـەوە ئینجـا دوا بـە دوای چـوێنراوەکان پـێ چوێنراوی هێناوەتەوە بەڕیز بەندی :

(بالا،خەت ،کولّم، فەم :چوێنراون)

(سەروو، سەوزە، گولّ ، غونچە : پێ چوێنراون)

---

[1] دیوان نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٣٣٨

[2] دیوانی مەولەوی لێکۆڵینەوەی/مەلاعبدالکریمی مدرس ل ٩٩

[3] دیوان مەولەوی لێکۆڵینەوەی/مەلاعبدالکریمی مدرس ل ٩٩

نالی دەڵێ:

کاسەوو کەوچك، حەسیرو بەڕ لەئاودا هەروەکو
کیسەڵ و ماسی و جلە دێن و دەچن پرژو بڵاو[1]

نالی لەم دیرە شیعرەیدا چەند چوێنراوەکی بە دووای یەکەوە هێناوە کە ئەمانەن(کاسە و کەوچك و حسیرو بەڕ)بە چەند شتێکی چواندوون کە (کیسەل و، ماسی و، جلە)چواندنە کەشی بەشێوەی چواندنی پێ چراوی ڕیك هێناوەتەوە کاسەی بەکیسەل چواندووە،کەوچکیش بە ماسی، حەسیرو بەڕیشی بەجلە چواندووە .

(کاسە،کەوچ ،حەسیر: چوێنراون )

(کیسەل،ماسی،جلە: پێ چوێنراون )

**ب/ هینانی چەند چوێنراوو پێ چوێنراو بە دووای یەکەوە.**

نالی دەڵێ:

نەرگس نیگەه و ساق و سەمەن، کورتە بەنەفشەن
موو سونبل و، ڕوومەت گول و، هەم لا لەگولاهن([2])

مانای وشە: نیرگس:ئەوەی بەچاوێکی وەك نەرگس مەستەوە بڕوانی.ساق: بالاَ.سەمەن گوڵی شینایییەکە پێی دەڵێن سێ پەڕە، زەردو سپی و شینی هەیە.

واتە:بالاَ سپی وەك زیو. کورتە بەنەفشە:کورتەکی بەریان وەنەوشەیی رەنگ، مەبەستی لەکەوای تاقەی شینە،کە ئەو خوڵاَمانە لەبەریان کردووە.

---

[1] دیوان نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٣٦٢

[2] هەمان سەرچاوە ل٣٤١

مووسونبول: ئەوەی تازە مووی لێ هاتبێ و مووەکانی ڕووی وەك سوونبول ناسك بێ. ڕوومەت گولْ ئەوەی ڕوومەتی وەك گولْ گەش بێ.لالەکولاە: کڵاو سوور وەك گوڵی لالە.[1]

نالی لەم دێڕە شیعرەیدا (نیگەه)ی بەنەرگس و (بالا)ی بە سەمەن و (سێ پەڕە) و کورتەکی بەریان بە وەنەوشە چواندووە، هەر وەها لە نیوەی دێڕی دووەمدا(پرچ) ی بە سونبول و(ڕوومەت)ی بەگولْ و(کڵاوە) ی بە لالە چواندووە .

**لەنیوەی دێڕی یەکەم :**

نیگەه : چوێنراوە .

نەرگس: پێ چوێنراوە.

ساق : چوێنراوە .

سەمەن: پێ چوێنراوە.

کورتەك: چوێنراوە .

وەنەوشە: پێ چوێنراوە.

**لەنیوەی دێڕی دووەم :**

موو: چوێنراوە .

سونبول: پێ چوێنراوە.

ڕوومەت :چوێنراوە .

گـول: پێ چوێنراوە.

کلاَ ه : چوێنراوە .

لالـە: پێ چوێنراوە.

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٣٤٤

٣–چواندنی پێچان و کردنەوەی ناڕێك : واتە: هێنانی چەند چوێنراوێك بە دوای یەکەوە بۆ هەر چوێنراوێکێش پێ چوێنراوێك بێنی و ڕێز بەندی لێوەنەبێ .

حەمدی دەڵێ :

مەشقی ئەبروو ڕوومەت و پڕشەنگی چاوی ئەو ئەکا
بەم گەلاوێژ و هیلالە بەدری ئەنوەر ئاسمان([1])

شاعیر لەنێوەی دێڕی یەکەم سێ شتی چواندووە بەسێ شت (برو ڕوومەت، پڕشەنگی چاو) ی چواندووە بە(گەلاوێژو هیلال و بەدری ئەنوەر) بەڵام بەرامبەری لە نێوان چوێنراو و پێ چوێنراو نییە ، ئەبرۆی بەهیلال و پڕشەنگی چاوی بە گەلاوێژو ڕوومەتی بە بەدری ئەنوەر چواندووە .

ئەبرۆ: چوێنراوە.

هیلال: پێ چوێنراوە.

پڕشەنگی چاو: چوێنراوە.

گەلاوێژ: پێ چوێنراوە.

ڕوومەت: چوێنراوە.

بەدری ئەنوەر: پێ چوێنراوە.

**پێنجەم : چواندن بە پێی پێچەوانە کردن و پەسندیدەیی و لە خوگری و لەناو یەکی :**

١–چواندنی پێچەوانە/التشبیه المقلوب :

واتە:چواندنی پێ چوێندراو بە چوێنراو،بەجێ گۆڕکێ و پێچەوانەکردنیان بۆ زیادەڕەوی لە مەبەست و مانا[1]

---

[1] حەمدی لێکۆڵینەوەی جمال محمد محمدأمین ل ٨٠

مەجزوب دەڵێ :

ڕۆ چـــۆن ڕووت سپی،شـــەو چـــۆن زولفـــت تـــار
ئـــاد دیـــن ئیـــد دنیـــام، بـــەردن وەئیـلغـــار
ئینـەكـــــەی ڕەوان شـــــای والا تـەبـــــار
خـــەمت هەرپـــەی مـــن، وەشـــیت پـــەی ئـــەغیار

مانای وشە : ڕۆ :ڕۆژ.ئاد: ئەو . ئید: ئەم .ئیلغار: هەڵمەت . والاتەبار: پایە بەرز. ئەغیار: بێگانە .

(واتە:ڕۆژ وەكو ڕووت سپیەو شەویش وەكو زولفت ڕەشە ئەو دین و ئەم دنیامی بە هەڵمەت برد ئەمە كەی ڕەوایە ئەی پاشای پایە بەرز.غەمت هەر بۆمن بێت و خۆشیشت بۆبێگانە))[٢]

شاعیر ڕۆژی بە ڕووی سپی شەویشی بە زولف چواندووە بۆ زیادەڕەوی و بەهێزی لە ڕێگای چواندنی پێچەوانە (ئاوەژوو).

ڕۆژ: چوێنراوە.

ڕوو: پێ چوێنراوە.

شەو: چوێنراوە.

زولف: پێ چوێنراوە.

نالی دەڵێ :

شـــەڕەڕو تابـــەش و بـــاڕەش لـــەدەمی ڕەعـــدی بـــەهار
ئـــەثـــــە ری ســـــۆزشی گریانەلـــــە ئەفغانـــــمدا

---

[١] بلاغة العرب علی سلوم (د) ل ١٨٣

[٢] مەجزوب بەشێك لەدیوانی مەجزوب لێكدانەوەی حەكیم مەلا ساڵح ل٤٠

مانای وشه : شەڕەر: بریسکە.تابەش: گڕسەندن. بارەش: بارین.دەم: کات. رەعد: هەور.گرمە. سوزش: سووتان. ئەفغان: هاوار.

((واتە :پزیشکەو گڕسەندن و بارانی سەردەمی هەورە بروسکە،لەدڵ هەڵقرچان و گریان و هاواری منەوەیە))[1]

نالی لەم دێرە شیعرەیداجێ گۆڕکێی لە نێوان چوێنراوو پێ چوێنراو کردووە چوێنراوی کردووە بەپێ چوێنراو، پێ چوینراویشی کردووە بەچوێنێراو(سۆزش و ئەفغان) کەچوێنراون کردوویە بە پێ چوێنراو (چەخماخەی هەورو بارانەشی) کردووە بە چوێنراو نالی بەم شێوەیە چواندنی پێچەوانەی درووست کردووە بۆ زیادەڕەوی لە چواندن.

ئەم جۆرەچواندنە بۆ بەهێزی لەچواندنی ڕەوان(التشبیە البلیغ )کەمتر نییە بۆ بەهیزی گەر زیاتر نەبێ هەر چەند ببینین ئەوزاریشی لێوە هاتبێ، بەلاّم دەبێ ئەوەش بزانین هەر وەك(إبن الأثیر)دەڵێ: ئەم جورەچوواندنە روبەڕێکی بەرفراوانی پێ دراوە و بە بالآترین چواندنی لێی دەرواندرێ و بووە بە دیاردەیەکی هونەری داهێنان و گوزارشت کردن، بەلاّم ئەم جۆرە چوواندنەش مەرجی خۆی هەیە، دەبێ بەشێوەیەك بێ داب و نەریت ڕێگای پێ بدا، هەر دووسەری چواندن لەیەك ئاست نەبن دەبێ بزانرێ کامەیان چوێنراوە کامەیان پێ چوێنراوە ،چواندنی پێچەوانەگەر بەم شێوەیە نەبوو دەبێ بە چواندنێکی ناڕێك.[2]

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٩٠

[2] (عبدالعزیز عتیق.د) علم البیان. ل ٦٩

مەولەوی دەڵێ :

گــــوڵ چـــۆن ڕووی ئـــازیز نەزاکـــەت پۆشـــان
وەفـــراوان چـــۆن ســـەیل دیـــدە ی مـــن جۆشـــان

ڕوومـەت ڕووی یـار بـەگوڵ ئەچوێنرێ،فرمیسـکی شـادیش کەسـاردە بەبـەفراو ئەچـوێنری،بەڵام مەولـەوی ئـەم لێکچـواندنەی هەڵگێڕاوەتـەوە بەپێچەوانە دەری بڕیوە. دەڵێ : نەزاکەت و نازکی گـوڵ وەکـو ڕووی یـاری خۆشەویست و ئازیزە، هاژەی بەفراوان هەردەڵێی بەفراوی چاوی منە.[1]

نەزاکەت و نازکی گوڵ: چوێنراوە.

ڕووی یار: پێ چوێنراوە.

هاژەی بەفراوان: چوێنراوە.

بەفراوی چاو: پێ چوێنراوە.

یاوەك

تنـــــۆکی خـــــوناو ڕۆژانـــــی بـەهـــــار
لـــــە ســـــەرگوڵی ســـــوور کـــــەدەبێ دیـــــار
لـــــە جـــــوانی دەڵێـــــی دانـــــەی فرمێســـــکە
تـریســـــک دەدا لـــــە کـولمـــــی نـــــازدار([2])

لەم دێڕە شیعرەدا تنـۆکی خونـاو لەسـەرگوڵی سوور،چـوێنراوە بەدانـە فرمێسك لەسەرکوڵمی نازدار، ئـەم جـۆرە چواندنە،چـواندنێکی پێچـەوانەیە دە بوایە دانەی فرمێسك لە سەر کولمی نـازدار بـە تنـۆکی خونـاو لـە سـەر

[1] دیوانی مەولەوی لێکۆڵینەوی مەلا عبدالكریمی مدرس ل٣٢٣

[2] موحسین ئەحمەد مستەفا گوڵزاری هۆنراوە دەستنووس

گوڵی سوور بچوێنرایە، بەڵام تنۆكی خوناو كە لە سەر گوڵی سوورە بە دانە فرمێسكی سەر كوڵمی نازدار چوێنراوە بۆ زیادەڕەوی لە چوێنراو،لەم چوارینە وا دەردەكەوێ چواندنی پێچەوانە بەشێوازی ئاوێتەییش دێ ڕووی چواندن لەچەند شتێك پێكهاتبێ .

تنۆكی خوناو ڕۆژانی بەهار لە سەرگوڵی سوور:چوێنراوە،دانەی فرمێسكە تریسك دەدا لە كوڵمی نازدار: پێ چوێنراوە.

لە جوانی : ڕووی لێكچوونە .

دەلێی : ئەوزارە

٢– چواندنی پەسندیدە/ تشبیە التفضیل)ئەوەیە: لەجیاتی ئەوەی شتێك بە شتێكی تری هاوبەش لە سیفەتدا بەیەكتر بچوێنی، هەستی چوێنراو لەپێ چوێنراو بە پەسند ترو باڵاتر بزانی.[1]

ئەم چواندنە لەلایان زیادەڕەوی و بەرزكردنەوەی بۆ سەرووی پێ چوێنراو زۆر لە چواندنی پێچەوانە نزیكە، بەلام هەریەك بەشێوازی خۆی.

نالی دەڵێ :

بێ قسەی غونچەی دەمت كاتی تەبەسسوم ڕووبەڕوو
هەتكی شوعلەی بەرق و نە ظمی دائیرەی پەروین دەكا

((واتە: غونچەی دەمت بێ ئەوەی هیچ بڵێ، هەر تەنها بەبەرەو ڕوو وەستان،لە كاتی زەردە خەنەدا،بەخڕی خۆی و بە دەرخستنی ڕیزی دانە

[1] علم البيان ( عبدالعزيز عتيق.د). ل٦٩

سپیەکانت،ئابڕووی ڕۆشنایی کاتی هەورە برووسکەو ڕیك و پێکی بارنەی دەوری ئەستێرەی پەروین ئەبا))[1]

نالی بۆ وەسفی جوانی دەمی یاری، ڕازی نەبووە لێوی بە بزەی بچوێنی، بە ڕووناکی هەورە برووسکە لە ڕۆشناییدا، هەروا ڕازی نەبووە دەرکەوتنی ڕێزی دانەکانی لەکاتی زەردە خەنە وەك بارنەی دەوری ئەستێرەی پەروین دابنێ لە ڕێکیدا. بۆ ئەوەی پلەی ئەم دوو چواندنە لە سەرووی پێ چوێنراو دابنێ دەڵێ:لێوی بەزەردە خەنەت بێ ئەوەی هیچ بڵێت ئابڕووی ڕۆشانایی هەورە برووسکە دەبات، ڕێزی دانە سپیەکانت ، لەکاتی زەردەخەنە ئابڕووی بارنەی دەوری ئەستێرەی پەروین دەبات.

٣-چواندنی لەخۆگر/التشبیه الضمنی:

ئەو چواندنەیە چوێنراو وپێ چوێنراوی ڕاستەو خۆ لێ دەرناکەوێ، بەڵکو بە ئاماژەو چەمکی مانا دەناسرێ و پێ چوێنراویش دەبێ بە بەڵگە لە سەر ڕاستی ئەوەی دراوەتە پاڵ چوێنراو.[2] بۆ لابردنی پەردەی گومان لە سەرشتی یەکەم .

نالی دەڵێ :

بۆچی نەگریێم، سەد کەڕەتم دڵ دەشکێنی!
مەی بۆچی نەڕژی، شوشە لە سەد لاوە شکاوە!

[1] دیوان نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل
[2] علم البیان (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ١٢٤

((واتە: ڕۆژێ سەد جار دەست بە ڕومەوە ئەنێی و دڵم ئەشکێنی ،ئیتر چۆن نەگریم؟ شەڕابی خوێنی دڵم چۆن لەچاوەکانمەوە نەرژێ و سەرنەکا؟ مادەم شووشەی دڵمت لە سەد لاوە شکاندووە!))[1]

نیوەی دێڕی دووەم بە لگەیە لە سەر نیوەی دێڕی یەکەم، مادام بگونجێ شووشە بشکێ مەیش دەبێ برژێ،کە واتە: دڵیش وەك شووشە وایە کە شکا دەبێ فرمێسکی چاو برژێ،چوێنراو و پێ چوێنراو لەم دێرە هۆنراوەیەدا ڕاستەوخۆ بەر چاو ناکەون، بەلام کە سەرنج بدەین دەبینین نالی لە کاتی دڵ شکانیدا ناچارە بگری و فرمێسك لە هەردوو چاوی برژێ. نالی ئەم حاڵەی خۆی چواندووە بە شووشەی شکاو کەمەی تێدابێ و لێوەی برژێ بۆ بەڵگە لەسەر ڕاستی قسەکەی.

حەمدی دەڵێ :

ئارەزووی تە لطیفە جانان بۆیە تەکدیرم ئەکا
کێ بە تەعمیر ئیحتیاجە تانە بێ خانە خراب

مانا ی وشە: تەکدیر: لۆمەو شکاندن. تەعمیر تازە ئاوەدان کردنەوە.[2]

واتە:((یار ئارەزووی ئەوەی هەیە ئاشتم کاتەوە بۆیە لۆمەم ئەکا چونکە عاجزم نەکات ئاشت بوونەوە پێك نایەت،چونکە مانای ئاشت

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٣٣٥

[2] دیوانی حەمدی لێکۆڵینەوەی (جمال محمد محمد أمین) ل٢١١

بوونەوە ئەبێت عاجزیەکی لەپێشەوە بووبێت هەر وەکو خانوو تا نەڕووخێ تازە ناکرێتەوە دیارە تا عاجزیشم نەکات ئاشت بوونەوە پێکنایەت))[1]

حەمدی کەدەڵێ یار بۆیە عاجزم دەکا تا لەگەڵم ئاشت بێتەوە بناغەی ئاشت بوونەوەی لە سەر عاجز بوون دامەزراندووە گەر عاجز بوون نەبێ ئاشت بوونەوەش نابێ، چۆن تا خانوو خراپ نەبێ و دانەڕمی چاك ناکرێتەوە.لەم گوزارشتەشی چواندنێکی لەخۆگرـ ضمنی ـ دروست دەبێ واتە: یەکەم کەعاجز بوونیەتی لەلایان یارەکەی چوێنراوە خانوو خراب بوون و چاك کردنەوەی پێ چوێنراوە .

یاوەك محسن دەڵێ :

گـەر یـەك ڕوو چـووبێ لـە گەنـدەڵکاری
کـاری لێ ناکـا هـیچ ئامـۆژگـاری
سـەر کـۆنەو جـوێن بـەلای هـیچ نییـە
بـریـن لـە مـردوو نیـیە ئـازاری([2])

لەم چوارینە چواندنێکی نادیارهەیە، بە ئامـاژەی ژێری مانا هەر دووسەری چـواندنەکە دەردەکـەوێ، واتـە:کەسـێك کـاری بـەردەوام گەندەڵکاری بێ، هیچ سەرکۆنەو ئامۆژگاریەك کاری لێ ناکات، بەڵگەش بۆ ئەمە وەك مردوو وایە هەر چەند جەستەی مردوو برینـدار بکەیت هیچ ئازارێکی نابێ .

---

[1] دیوانی حەمدی لێکۆڵینەوەی جمال محمد محمد أمین ل٢١١

[2] موحسین ئەحمەد مستەفا گوڵزاری هۆنراوە دەستنووس

ئەدەب دەڵێ :

خاڵ وخەتی ڕەنگینی بەر ئەو گەردەن و سینەت
شایستە یە،سەد تەعنەی لەخاڵ و خەتی کەودا ! ([1])

ئەدەب لەجیاتی ئەوەی خاڵ و خەتی یاری،بەخاڵ و ختی کەو بچوێنی، هەستاوە خۆی لەم چواندنە بەدوور گرتووە،چونکە خاڵ و خەتی یارەکەی خۆی بەلاوە جوانتر بووە، هەر بەوەش نەوەستاوە بە شایستەو لەجیی خۆشی زانیوە،خاڵ و خەتی یاری تەعنەلەخاڵ و خەتی کەوبدا .

٤– چواندنی لە ناویەك : ئەوەیە وشەیەك ببێ بە چوێنراو بۆ دوو پێ چوێنراو . (٦٥)

نالی دەڵێ :

مرواری ئەشکم وەکو یاقوتی، ڕەوانە
ساقی! بدە لەو لەعلە شەڕابێکی عەقیقی

مانای وشە: مرواری ئەشك: فرمێسکی وەك مرواری سپی . ڕەوان: ڕۆیشتوو.لەعل:بەردێکی گران بە های سوورە. عەقیق: ئاقیق، بەردێکی گران بەهای سووری ترە.

واتە:((فرمێسکم وەك مرواری بەسپیەتی و،وەك یاقوتیش بەسووری ئەڕوا بە چاوم.. مەبستی لەوەیە بڵێ چاوم مرواریش و یا قوتیشی لی دائەوەرێ.. دەسا تۆیش کاکەی مەی گێر، لەلەعلی لێوی سووری یار،

[1] دیوانی ئەدەب (دیوان مصباح الدیوان )لێکدانەوی(محمدسعید نەجاری ل٢١

شەرابێکی وەك عەقیق سوورم بۆ تێکە، بۆ ئەوەی ببم بەخاوەنی ئەم هەموو گران بەهایانە.[1]

(((نالی)لەم دێڕشیعرەیدا ئەشکی بە مرواری چواندووە،ئەشك چوێنراوە یاقوت پێ چوێنراوە واتا ئەشکم کەوەك مرواری وایە،لەیاقوتیش دەچێت ))[2]

ئەشك:چوێنراوە

مرواری: پێ چوێنراوە .

ئەشکی وەك مرواری:چوێنراوە

یاقوت: پێ چوێنراوە .

یاوەك دەڵێ :

تیزاوی سورشکم وەکو ئیکسیری سوهەیلە
روخسارەیی زەردم وەکو ئەوراقی خەزانە

مانای وشە: تیژاو: تیزاب. شلەیەکی کیمیاییە زێری بێگەردی لە ناپاك پێ جیا ئەکرێتەوە . ئیکسیر: مادەیەکە کیمیاییەگوایە ئاسن ومسی پێ ئەکرێ بەزێڕ. سوهەیل: ئەستێرەی گەشی سوهەیل کە نیشانەی پایزەو کە هەڵات ئیتر گەلای دار دەست ئەکات بەزەرد بوون. روخسارە: روخسار. روو. ئەوراقی خەزان: گەلای پایز.

((واتە: فرمیسکی سوێرو تیژم ئەڵێی ئیکسیری سوهەیلە.ڕوخساری زەرد هەڵگەراویشم گەلاداری پایزانە، چۆن ئەستێرەی سوهەیل بۆ گەلای دار ئەبێ

---

[1] دیوان نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٤٧٩

[2] عبدالسلام سالار هونەری ڕەوانبێژی لەشیعری نالی دا ل٧٣

بەئێکسیرو زەردی ئەکا وەك ئیکسیرێ زیری بێگەرد دەربخا، فرمێسکی وەك تیزابیشم رووی وەك ژەنگاوی سوورم زەرد هەلئەگرێنێ ))[1]

نالی لەم دێرە شیعرەیدا فرمێسکی بە تیزاب و ئیکسیر چواندووە واتە: فرمێسکم کەوەك تیزاب وایە لەئیکسیری سوهەیلیش دەچێت ،(فرمێسك) بووە بە چوێنراو بۆ دووپێ چوێنراو کەتیزاب و ئیکسیرە.

فرمێسك: چوێنراوە .

تیزاب: پێ چوێنراوە .

فرمێسکی وەك تیزاب: چوێنراوە.

ئیکسیری سوهەیل: پێ چوێنراوە.

## چواندنی وێنە/تشبيةالتمثيل

چواندنی وێنە: ئەوەیە چەند شتێکی ئاوێتەکراو بچوێنی بەچەند ئاوێتەکراوی تر لەبەر هاوبەشی لەسیفەتدا.[2]

ئەدیب لە وکاتە دەیەوێ گوزارشت لە مەبەست و مانای نێودڵی بکات بەشێوازێکی زۆر جوان ووەك تابلۆیەکی ناسك و نایاب نیشانی بدات، هەریەك لەچوێنراوو پێچوێنراو، لە چەند پارچەیەك دا دەڕێژی و، وێنەی چوێنراوەکان بەوێنەی پێچوێنراوەکان دەچوێنێ،بەشێوەیەك وەك بازنەیەکی بۆش نەزانرێ جەمسەرەکەی کەوتووە تەکوێ، جا ئەوەی هەژی گوتنە: ئەم جۆرە چواندنە دەریایەکی قوول و بەرفراوانی هونەری ڕوونبێژی یە،رووی لێکچوونی ئەبێتە وێنەیەکی ناسك و پێکهاتوو لەمرواری

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٦ ٦٥

[2] ألبلاغة الواضحة على الجازم ومصطفى أمين ل٣٥

وشەی نایاب، بۆ سەرنج ڕاکێشانی گوێگرو خوێنەر،بەلاّم خۆ نقووم کردن لە نێو ئەم دەریایە، دەریاوانی شارەزاو بە تواناو لێهاتووی دەوێ،چونکە ئەم جۆرە چواندنەچواندنێکە تایبەتمەندی و کاریگەری خۆی هەیەلە لایان بەخشینی ماناو مەبەست، ئەگەر گوزارشت بەم شێوەیە مەدح و پیاهەڵدان بێ، زۆر لێهاتووانەو بەڕێکوو پێکی جێگای خۆی دەگرێ، ئەگەر زەم و داشکان بێ، ئێش و ژان و ئازاری سەخت و دژوار تر دەبێ، ئەگەر بۆ بەڵگەو سەلماندن بێ دەبێ بە تەرازووی سەربەسەری چوێنراوو پێچوێنراو، جا بۆگەیشتن بەچواندنێکی بێگەردو ڕازاوەو قەشەنگ و پێکهاتوو لەچەند شتێکی جۆراجۆرو زۆر جوان و سەرنج ڕاکێش و وێنەی چوێنراوی بە ڕوون ئاشکرایی لێ دەربکەوێ،کەسانی ئەدیبِ پێویستیان بە بیرو ئەندێشەو وردەکاری زۆر هەیە بۆ گوزارشت کردنی بەم شێوازەوەك :

١–روونکردنەوەی ماناو مەبەست بەچواندنی وێنەیەك بە وێنەیەکی تر بگونجێ تاکەکانی بە یەکتر بچوێندرێ .

نالی دەڵێ :

گریانی من و خەندەیی تۆ ئێستا دەشوبهێ
بەو مەوسیمی بارانە کەوا غونچە دەپشکووت

((واتەگریان و فرمێسك ڕشتنی من لە دەردی دووری تۆ و گوێ نەدان و پێکەنینی بێ باکانەی تۆیش بە من لەو کاتە ئەچێ کە بەهاران باران ئەبارێ و غونچە ئەپشکوێ.. دیارە غونچەی دەمی تۆ بەبارانی گریانی من ئەپشکوێ.. دیارە ئەبێ دووری نێوان نالیی و یارەکەی ئەوەندەی دووری

نێوان هەورو زەوی بێ کە ئەویان بارانەکەی لێوەدێ و ئەم یان خونچەکەی تیائەپشکوێ ..لەلایەك شیوەن و گریان بێ و لەلایەك بەزم و پێکەنین!))[1]

نالی لەنیوەدێری یەکەمی ئەم شیعرەیدا دووشتی لەیەك جییای بەیەکەوە ناوە و ئینجا بەوێنەیەکی تری ئاوێتەکراوی چواندووە بەم شێوەیە دەبینین چواندنی وێنەی درووست کردووە. هەرلەم نموونەیەدا دەتوانیین تاکەکانیشی بەیەکەوە بچوێنین، بەلأم نالی مەبەستی چواندنی تاك بەتاکی نییە، بەڵکو مەبەستی وێنەیەکی تێکڕاییە کە لەچەند پارچەیەك پێك هاتبێ وەك لەشی کرنەوەکەدا دەردەکەوێ .

نالی لەم چواندنەیدا دوو وێنەی زۆر جوان و ناسکی هێناوەتە ڕوو:–

أ– چاوی کەفرمیسکی لێوە دەرژێ وای نیشان دەدا خونچەی دەمی یاری بەم فرمێسکە دەپشکوێ،دەبێ نالی لە یاری خوێ زۆر دووربێ، چونکە کەباران دەبارێ بەسەر زەوی و خونچە.دەپشکوێ ئەم هەورەی بارانی لێوە دەبارێ دوور لەزەوی و خونچەیە کەواتە نالیش دەبێ وەك هەور دوور بێ لە خونچەی دەمی یاری .

ب/ ئەم فرمێسك ڕشتنەی لەبەر دووری لە یارەکەیەتی،کەچی یاری لەبەر بێ وەفایی بەم فرمێسك ڕشتنەی پێدەکەنێ .

٢– بۆ ڕوونکردنەوەو پێشاندانی مەبەست و مانا، بەچواندنی تێکڕای وێنەیەك بە وێینەیەکی تر،لە هەمان کاتیشدا وێنەکان لەوانە نەبێ تاك تاك بە یەکتر بچوێنرێن:

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الكريمى مدرس ل ١٥٣

جزیری دەڵێ :

ذەڕەیـــەك بـــووم دە هـەوایـاتە دە وێـرانـەیـــەكی
میثلی ڕۆژێ بەشوعا عا خـووە تـە مـە مەشـهورکرین

واتە ((لەپێش ئەوەی تووش بم بەئـەڤینی تـۆ، تۆزقـالێكی نـەبینراوی عەشقت بووم، دەهاتوو دەچـووم لـە بۆشـایی شـوێنێكی وێرانـە، تیشـكی ڕۆژی ڕووت لە كەلێنێكی ئەم وێرانەیە بـەرم كـەوت و پێـی ناسـرام ، وەك تیشـكی ڕۆژ كەلـە كولانكەیەكـەوە بێتـە ژوورەوە لـە توزقالـەكانی بـداو بكەونە بەرچـاو بـە هـەمـان شێـــوە منـیش بەتیشـــكی ڕۆژی ڕووی تـۆ دەركـەوتم و ناسـرام ))[1]

جزیری لەم دێڕە شیعرەیدا مەبەستی ڕوونكردنـەوەی ئـەڤین و عیشـقی خۆیەتی كە چواندوویەتی بەو تۆزقالانەی كە لە ناو وێرانەیەك ڕۆژ لێی بـداو دەركەوێ، بەم شێوەیە دەبینین شاعیر وێنەیەكی جوان و سەرنج ڕاكێشـی چواندنی پێكهێناوە،لە هەمان كاتیشدا تاكەكانی ئـەم دێـڕە شـیعرە لەوانـە نییە بە یەكتر بچوێنرێن .

یاوەكو صافی دەڵێ :

عەشقت لــە دڵـم ثابیتـە نـەك عـاریـــضە قـــوربـــان
وەك طـــوڕەیـــی شـاهان كـە لەسـەر ڕووی نەمەكینـە

---

[1] ألعقد الجوهری فی شرح دیوان الجزری أحمد الزفنكی ب ٢/ل٤٦٠

مانای وشه: ثابت: نەگۆڕ.عاریض(عارض): دژی (ثابت)ە شتێك كە قابیلی گۆڕان و تێكچوون نەبێ. طورە : خەت و مۆر.نیشانە.نگین : ئەنگوستیلە .

((واتەعەشقی لە نێو دلمدا وە ها جێگیرو نەگۆڕە وەك ئەو مۆرەی كەجاران شایەكان لەسەر ئەنگوستیلە هەڵیان دەكەند و هەر بەهەمان ناوی سەر ئەنگوستیلەكەش نامەو نووسراویان مۆر دەكرد ))[1]

(صافی) لەم دێڕە شیعرەیدا خۆشەویست و ئەڤینی خۆی لەوێنە و تابلۆیەكی جوان و قەشەنگ دەر بڕیوە،عیشقی خۆی بە جێگیرو نەگۆڕ نیشانداوە، لە هەمان كاتیشدا بە وێنەیەكی تری چواندووە،كە مۆری شایانە لەسەر ڕووی ئەنگوستیلەكانیان واتە:چۆن

ئەم مۆرە جێگیرەو گۆڕانی بەسەر نایێ دڵی شاعیریش بە هەمان شێوە وایە. صافی لەم چواندنەیدا دووشتی لەیەكتر جیاو دووری بە یەك چواندووە كە تەنیا لەسیفەتی جێگیری و نەگۆڕی بەیەك دەگەن ئەمەش وێنەیەكی پڕ لەوردەكاری و ڕازاوەی بیرو هەستی صافی یە،لە هەمان كاتیشدا چواندن لە نێوان تاك بەتاكی وشەكاندا نییە .

## هەندێك لە مەبەستەكانی چواندن

ڕوونبێژی كەبەشێكی گرنگی ڕەوانبێژیە یەك لە بەنەڕەتەكانی چواندنە، كاریگەری ئەم بنەڕەتەش خۆی لەچەند مەبەستێك دبینێتەوە، ئەم مەبەستانەش هەر هەموویان بۆ (پێ چوێنراو) دەگەڕێنەوە تەنیا لەچواندنی پێچوانە(تشبیە المقلوب) نەبێ، بۆ (چوێنراو) دەگەڕێنەوە:

---

[1] ألعقد الجوهری فی شرح دیوان الجزری(أحمد الزفنگی) ب ٤٦٠/٢

١- بۆ زانینی باری چوێنراو(ألمشبه) بە براوردکردنی بە پێ چوێنراو:

هێمن دەڵێ :

خۆم دەسووتێنم، هەتا بەزمی خەلکی ڕۆشن بکەم([1])
کێ لە ڕێی خەلکا وەکو شاعیر دەسووتێ شەم نەبێ؟!

شاعیر لەدێڕی یەکەم کەدەڵێ (خۆم دەسووتێنم هەتا بەزمی خەلکی ڕۆشن بکەم) لەوانەیە بەسەیریان زانی بێت،بیانگوتبا شتی وا چۆن دەبێ ؟ هێمن بۆ ئەم مەبەستە هەستاوە خۆی بەشەم بە راورد کردووەو شەمی کردوووە بە نموونەی خۆی لە خۆ سووتاندن .

٢- بۆ دەرخستنی بار(حاڵ)ی چوێنراو:

هێمن دەڵێ:

لەناو بازاڕی ئەو ڕۆکەی ئەدەبدا شیعری (هێمن)
وەکوو پووڵی چرووکە، هیچ ڕەواجێکی نییە ناچێ!([2])

هێمن کەدەبێنی گرنگی بە کەسانی زاناو ڕوشنبیر نادرێ و، هەر کەسە بۆخۆی دهوڵێك لێدەداو لە زورنایێ دەژەنی، شیعری ویش بۆ ڕێگای سەربەستی و ئازادی یە کەس لێی ناڕوانێ و نای خوێننەوە، ئەم بێ ڕەواجیەی شیعری خۆی بەراود کردووە بەبێ ڕواجی پووڵی چرووك .

---

[1] دیوانی صافی لێکۆڵینەوەی محمدی مەلا مستەفا هیرانی ل ٢٠٦

[2] تاریك وروون هێمن ل١٣٢

٣– بۆ دەرخستنی ئەندازەی بەهێزی یان بێ هێزی چوێنراو:

خادیم دەڵێ :

وەکوسبحی سەعادەت فەیز بەخشە،شامی خووچاکان
سبەینەی خراپەکانیش، تاریکستانە وەك شامە[١]

سوبح :بەیانی. سەعادەت: خۆشی. فەیز:بەرەکەت. شام: ئێوارە. خووچاکان: پیاو چاکان،کردەوەچاکان[٢]

وا تە: ئیوارەی کەسانی چاك وەکو کاتی بەرەبەیان وایە، بۆ پڕ بەرەکەتی و دڵخۆشی. شاعیر لێرە ئاماژەی بۆ فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ)کردووە (تسحروا فإن فی السحوربرکة) واتە: کاتەکانی بەیانی مەلابانگدان بەرەکەتە.بەیانی کەسانی خراپیش تاریکستان و بێ ڕووناکیە.

ئەم چوواندنەی شاعیر بۆ دیاری کردنی ئەندازەی بەهێزی و بێ هێزی چوێندراوە کە دەڵێ:(فەیز بەخشە شامی خووچاکان) ڕاستە بەلام بۆ ئەوەی ئەندازەکەی دەرکەوێ و ئاستەکەی بزانرێ بە(سوبحی سەعادەتی) چوواندووە، سبەینەی کەسانی خراپیشی بەتاریکستان داناوە، بەلام تاریکیەکەی لەچ ئاستێك دایە بە پێ چوێنراو روونی کردووتەوە کەوەك ئێوارە وایە .

---

١ دیوانی خادیم/ لێکۆڵینەوەی جەمال موحەمەد ل٩٨

٢ هەمان سەرچاوە ل ١٣٥

٤- بۆ ڕازاندنەوەو جوان نیشاندانی چوێندراو:

ئەدەب: دەڵێ:

ئـــەبرۆیی کەشـــیدەت لـــە پـــەنا طـــورپـــی ســـەودا
مـــاهێکی نەوە،گۆشـــەیی کێشـــاوە لـــە شـــەودا

مانـای وشـە: کەشـیدە: کشـاو. طـورە: کـاکۆڵ. سـەودا: ڕەش . مـاه: مانگ.نەو: نوێ.

واتە((بڕۆکشاوەکانت لە پەنا کاکۆڵـە ڕەشـەکاندا، هـەر دەڵێـی مـانگی نـەوە،یان سـەری مـانگی تـازەن و لـە تـاریکی شـەودا وێنـەی کەوانـەییان کێشاوە))[1]

شاعیر برۆی کەشیدەیی یاری لە پەنا کاکۆڵی بەشتێکی چواندووە کە بەلایەوە جوانەو جێگای سەرسوڕمانە.ئەم چواندنەشـی بـۆ ڕازانـەوەو پێـدا هەڵدانی چوێنراوە کە یاریەتی،جۆری ئەم لێکچواندنەشی چواندنی وێنەیە.

٥-بۆ داشکاندن لە پلەو پایەی چوێنراو:

نالی دەڵێ :

خـــەلقی کـــە هـــەموو کـــودەکن و بەســـــتەزمانن،
بـــابێن و لـــە((نالی)) ببیـــەن شـــیعری ســـەلیقی

مانای وشە: کۆدەك : منداڵ.بەستەزوبان . زمان بەستراو.بێ دەسـەلات. سەلیقی: لە سـەلیقەوە هـاتوە ئـەوەی لەخۆیـەوە بیـت و خـۆ پێوەمانـدوو کردنی نەوێ .

---

[1] دیوانی ئەدەب ساغ کردنەوەی محمد حەمە باقی ل٣٠٤

واتە((ئەم خەلقە هەمووماناڵ و نەفامن و زمانیان بەیەکادێ، هیچ لە شیعری ڕاستەقینە تێ ناگەن .. بڵێن با بێنەلای (( نالی)) شیعری خۆی بۆیان بخوێنتەوە کەوەك ئاوی ڕەوانە لەخۆیەوە دێ، بەڵکو زمان و بیریان بکرێتەوەو فێری چەش کردنی شیعرو ئەدەب ببن))[1]

شاعیر ئاستی بیرو هزری کەسانی کەمەبەستیەتی بە لاوازو بێ هێزی نیشان داوە،چوێنراو کە(خەلقە) بە نەفام و بەستە زمانی داناوە بە هاوبەشی کردنی بە پێ

چوێنراو کە کۆدەکە بێگومان ئاستی هزری کودەکیش کە منالە تەواو پێ نەگەییوەو بە زۆری بێ هێزی پێوە دیارە.

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٦٥٧

# ڕاهێنان

جۆرو بنەڕەکانی چواندن لەم دێڕەشیعرانە دیاری بکە

١-سروو شکی من کەلێڵاوە غوباری کوە و هامونە
وەرە سەر چاوەکەم بنوارە، وەك ئاوێنە چەند روونە

نالی

٢-نالی وەکو لالە کە شەهیدی غەم و داغە
لەم باغە بفەرموو کەئەویش لێرە دەنێژم

نالی

٣-پەچەی پرچەمی پرچی سیا
هەر دەڵێی مانگەشەوە کوڵمی تیا

نالی

٤-تاکەی چوون مەجنوون وێڵی هەردانبم
تاکەی غەمزەدەی باری هیجرانبم

مەولەوی

٥-قەسری عومرم داتەپی،داری لەسەربەردی نەما
نانی تولی ئەمەل ئێستاکە، دەستی پێ دەکا

حاجی قادر

٦-برۆو ڕوخسارو زولفی ئاڵت
شەوو ڕۆژو هیلال و عەقدو مەرجان

طاهربەگی جاف

٧-دەڵێی چاوی منە هەوری بەهاری دەم بەدەم دەگری
دەڵێی ئاهی منە بەرقی دەرخشان ئاوری هێنا

وەفایی

## دروست : ألحقيقة

دروست/الحقيقة : بەکارهێنانی وشەیە لەمانای بنەڕەتی خۆی.[1]

فەنایی دەڵێ:

جەنـــــابی(پیشــــەوا قازی)خـەبـــــاتی
ڕەوابـــــوو،بۆ گـــــەل و خــــاکی و وڵاتــــی
لەپێنــــــاوی وڵات و ئــــــارەزوی گــــــەل
ســــەری دانـــا، هەتاگـــەل بـــێ نـــەجاتی[2]

ئێمەگـەر بـەوردی لەوشـەکانی ئـەم چـوارینە بـڕوانین، دەبیـنین هـەر وشەیەك بۆمانای تایبەتی خۆی بەکار هاتووە بێ کەم و زیادی، هەمان ئـەو مانایـە بەدەسـتەوە دەدەن کـە لەفەرهەنگـەکانی کـوردی هـاتوون، یەکێکشـیان نـەخوازراون بۆمەبەسـت و مانایـەکی تـر، ئەمـەش واتـە بـەکارهێنانی وشـە بـۆ ئەومانایـەی کـەبۆی دانراوە،بەکارهێنانیشـیان بـەم شێویە لەلایەنی ڕوونبێژی یەوە پێی دەوترێ دروست (ألحقيقة).

هەرلێرەوە دەبێ ئەوەش بـزانین وشـەی هاوبـەش لـەمانادا گـەڕلادان و گواستنەوەی تێدا نەبوو بۆ هەموو واتاکانی هـەر بەدروسـت دەزانـرێ .وەك وشەی(خاڵ) کەسێ مانای هەیەخاڵی ڕوو،برای دایك، خـاڵی نووسـین، ئـەم وشەیە لەبەر ئەوەی لادانی تێدانییە بـۆهەرسـێ مانـا بەدروسـت دادەنـرێ، ئەو وشانەی بۆمانا دانراون لەدوا کراون بـەناو، وەك کردنیـان بـەناوی مـرۆڤ بۆ نموونە وشەی بەهار واتـا وەرزێك لـەوەرزە کـانی سـاڵ کـە کـژوگیای لێ

---

[1] علم البيان (د. بيسيوني عبدالفتاح فيود) ل ١٣٧

[2] ديوانی فەنایی عابید عبدالله ی کاتب ل ٢٧٩

شین دەبێ،گەر کچێك ناو نرا بە(بەهار)، ئەم وشەیە نابێ بە خوازە، چونکە گونجاوی و پەیوەندی لەنێوان هەردوو واتادا نییە، تێبینی مانای بنەڕەتیشی لێ ناکرێ .

## جۆرەکانی دروست/ألحقیقة

١- دروستی زمانی/ألحقیقةاللغویة: ئەو وشانەن دانەرانی زمان کردویانە بەزاراوە بۆ دەربڕینی مانای ڕاستەوخۆی شتی مەبەست.[1]

گوڵ پێش دەم بکاتەوە غونچەیان بۆ داناوە،کردنی غونچە بەناو بۆئەم شتە دروست وحەقیقەتە،لادانی لەم مانایە بۆ مەبەستێکی تر دەبێ بەخوازە لەو کاتە شاعیر بۆ دەربڕینی جوانی و بچوکی دەمی یاری کەغونچە بەکار دێنی لەبەر هاوبەش بوونیانەلەم سیفەتە مەبەستی مانای بنەڕەت نییە،بەڵکو مەبەستی مانای خوازراوە .

٢- دروستی نەریتی تایبەت/ألحقیقة العرفیة الخاصة: واتە لادانی وشە لە مانای خۆی و بەزاراوە کردنی بۆ شتێکی تر.[2]

وەك بەکارهێنانی واژەی (کار، بکەر، بەرکار،...)کردنیان بەزاراوە لەلایان زانایانی ڕێزمانی کوردی بۆ ڕێزمان، یاوەك(چواندن، خوازە، درکە، تەوس) بەزاراوەکردنیان لەلایان زانایانی ڕەوانبێژی. یاوەك (شەپۆل،کەش،یەکە، پەستان ...) کردنیان بەزاراوە لەلایان تایبەت مەندەکانی کەشناسی .

---

[1] علم البیان (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ل ١٢٧

[2] هەمان سەرچاوە ل ١٢٩

ئەم وشانە هەریەکە مانای تایبەتی خۆیان هەیە، بەلاّم وەك زاراوە لەلایان تایبەت مەندەکان بەکار هاتوون بۆ ئەوەی تبێنی مانای بنەڕەتی لێ بکرێ .

٣- دروستی نەریتی گشتی/ألحقیقةالعرفیةالعامة: ئەوەیە واژەچەمکێکی گشتی هەبێ نەریتی زۆرینەی تایبەتی بکات بەتەنیا شتێك.[١]

نالی : دەڵێ:

گوێ درێژی بارو کورتان بەرزو، پالانی بەزێن
چوست و وریاتر لەگوێ کورتانی پالانی و گێژ([٢])

(گوێدرێژ)لەم دێرە دا هەرچەند چەمکێکی گشتی هەیە، بەلاّم هەموو ولاخێکی گوێ درێژ ناگرێتەوە،چونکە ئەم وشەیە تایبەت کراوە بەکەر.

٤- دروستی شەرعی و دستووری ألحقیقةالشرعیة والدستوریة: ئەو زاراوانەن کە زانایانی شەرع و دستوور بۆ مانای بەدەر لەمانای بنەرەتی خۆیان دایان بەکارهێن بۆ ئاماژە پێ کردنیان بۆ مانای مەبەست.[٣]

(خوێن بایی)ئەم وشەیە لەگەڵ ئەوەی کەلەمانای زمانەوانی خۆی دروست و حەقیقەتە بە هەمان شێوە کەکراوەتە زاراوەیەکی شەرعی بۆ ئەو سامانەی لەبری خوێن دەدرێ هەر بەدروست و حەقیقەت دادەنرێ چونکە

---

[١] هەمان سەرچاوە ل١٢٩

[٢] نالی دیوانی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٢٢٧

[٣] علم البیان (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ل ١٢٧

مانـــای زمانەوانیەکـــەی بـــەلاوە نـــراوە و تێبینـــی نـــەکراوە لـــەکاتی بەزاراوەکردنی.

## خوازە: ألمجاز

خوازەبەپێی بەکارهێنانی لەلایەنی ژیری و زماندا دابـەش دەبـێ بـۆ دوو جۆر :

یەکـەم: خـوازەی ژیری/ألمجـازالعقلی: ئەوەیەکـە وشـەیەك بدرێتـەپاڵ وشەیەك کـەمافی درانـە پـاڵی نـەبێ گـەر لەبـەربوونی پەیوەنـدی نێوانیـان نەبێ.[1]

ئەوەی لەم پێ ناسەیەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، تۆ کـەکارێك دەدەیتـە پاڵ ناوێك، دەبێ ئەو ناوە شیاوبێ بۆ ئەو دانەپاڵـە و ژیـری مـرۆڤیش دانـی پێدا بنـێ، ئەگـەر درانەپاڵەکـەش بـەم شـێوەیە نـەبوو وەك ئـەوەی کارێـك بدەیتە پاڵ ناوێك و بیکەی بەبکەر بەڵگەیەکی ژیـریش هـەبێ ئامـاژە بکـات کەئەم بکەرە بکـەرێکی ڕاسـتەقینە نییە،بـەڵکو درانـەپاڵ و بـوونی بەبکـەر هەر لەبـەر بـوونی یـەك لـەم پەیوەندیانەیـە کەلەمـەو دووا باسـی دەکـەین. دەبێ بەخوازەی ژیری. هەرلەم پێناسەیەدا ئەوەشمان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە خوازەی ژیـری لـە تـەنیا واژەو تاکەوشـە نییە،بـەڵکو لەتـەواوی پێکهاتـەی ڕسـتەکەدا دەبێ،لەگـەڵ تبینـی کردنـی ئـەو نیسـبەتەی کـە لـەنێوانیاد پەیـدادەبی، ئـەوەش تـەنیا ژیـری مـرۆڤ هەسـتی پـێ دەکـات. ئێمـە کەدەڵێین:(بەهار نێرگزی ڕواند)لەم ڕستەیەدا تۆ بـەهارت کـردووە بەبکـەر. بەڵام گەر بـەوردی لێـی بـڕوانین دەزانـین بـەهار کـەوەرزێکی سـاڵە بکـەری ڕاسـتەقینە نییـە: بـەڵکو بکـەرێکی ڕێزمانییـە تـەنیا لـەڕووی ڕێزمانـەوە

---

[1] شرح المختصر سعد الدين( التفتازاني) ل٥٨

بكەرە،چونكە ئەم وەرزە توانای ئەنجامدانی ئەم كارەی نییە،بەلاّم لەبەرئەوەی هاتنی ئەم وەرزە هۆیەكە بۆ دەركەوتنی كژوگیا كاری رابردووی( ڕواند)ی دراوەتەپاڵ و بەبكەر تەماشای دەكرێت،بكەری راستەقینە(خوای تاك و تەنیایە)كەوابێ هەر درانەپاڵێك بەم شێوازە بوو دەبێ بەخوازەی ژیری .

هەر لەم شوێنەدا پێویستە ئەوەش بزانین هەندێ جار خوازەی ژیری لە پاڵنانی ناو بۆ ناو(إضافة الإسم للإسم)دەبێ وەك بلّێین( ڕۆیینی ڕووبارەكە چەند جوانە)لەم ڕستەیەداخوازەی ژیری لەوشەی ڕۆیین دا نییە، چونكە ڕۆیین بۆ مانای راستە قینەی خۆی بەكارهاتووە،كەوابێ خوازە لەپاڵنان(إضافة) كەدێ ،چونكە ڕوبار شوێنە ناڕوا، ئەوەی دەڕوا ئاوی ڕووبارەكەیە،ئەم خوازەیەش لەدرانەپاڵنانی ئاو بۆ ڕوبار دروست بووە، پەیوەندی نێوان ئەم هەردووكەش شوێنایە تییە.

ئێمەكەدەڵێین( بەهار نێرگسی ڕواند)لەم ڕستەیە بەهار هەیە،نێرگسیش هەیە، ڕواندن هەیە(ڕواند)پاڵنراو(مسند)ە بەهار پالۆێنراوە(مسندإلیە)یە ئەمانە هەر دووكیان حەقیقەتی زمانن،چونكە چ ڕواندنەكەیە،چ بەهارەكەیە لەشوێنی خۆیان بەپێی دانانی زمانی بەكار هێنراون. بەلاّم كەبو وە بەخوازە لەبەر ئەوەیە نیسبەتی ڕواندنەكە دراوەتە لای بەهار،كەچی دەبوایە بدرێتە پاڵ خوا،چونكەخوا دەیڕوێنێ.لەم ڕستیە بەهار كە بووە بەبكەر بۆ كاری رابردووی(ڕواندن) هیچ كاریگەریەكی نییە لەڕواندنی نەرگس،بەلاّم هاتنی ئەم وەرزە بۆتە هۆی ڕواندنی.

**جۆرەکانی پەیوەندی درانە پاڵ ( ألاسناد ) لە خوازەی ژێریدا :**

١-دانە پاڵ کات(ألإسنادإلى الزمان)

مەحوی دەڵێ :

کەچـــــەرخ ئەســـــکەندەری دی دەردەدارە
وتـــی: ئـــەم هـــەم بـــووە هەمـــدەردی دارا

((ئەســـکەندەر: ئەســـکەندەری فیلیپـــی مەقـــدونیایی، ئـــەوەبوو بەلەشکرێکی چل هـەزار کەسیەوە، ڕووی کـردە ڕۆژهـەلات و لـە٣٣١پ زدا لـەلای هـەولێری ئێسـتادا داریۆشـی شـای ئێرانـی بەزانـدو دەولـەتی هەخامەنیشـنی ڕوخانـدو ئـاگری بەردایـە کۆشـك و تـەلارە پـڕ شـکۆکانی شاهەنشـاکانی ئێـران.دارا: داریـۆشی سـێهەم، دوای پـادشـای بنەماڵـەی هـەخامەنـشیی ))[1]

((واتە: کەچەرخی زەمانە ئەسکەندەری دی گرفتاری دەردبووە، وتـی: وائەمیش چوە پاڵ دارا کەئـەم خـۆی - دارای بەزانـد و- تـەخت و تـاجی لێ سەند.مەبەست لەوەیە دونیا بۆکەس نامێنێ و کەس خۆی لێ نەگۆڕی))[2]

مـــەحوی کەدەڵێ(کەچـــەرخ ئەســـکەندەری دی)لـــەدێڕی دووەمـــیش کەدەڵێ (وتـی) ئێمـە دەزانـین کەچـەرخ بـەهیچ شـێوەیەك توانـای بینینـی نییە، بەڵکو مەبەستی لەکەسانی ئەو چەرخ وسەردەمانەیە،(چەرخ کـەبووە بەبکەر بۆ کاری ڕابردووی (دی) لەنیوەدێڕی یەکەم، هەروا لەبوونی بەبکـەر بـۆ کـاری ڕابردووی(وتـی) لـەنیوەی دێـڕی دووەم بکـەرێکی ڕاسـتەقینە

---

[1] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٧
[2] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٧

نییە،بکەری ڕاستەقینە کەسانی ئەوچەرخەن، دەبوایە بدرابایەتە پاڵ کەسەکان، بەڵام لەبەرئەوەی کەسەکان لەو چەرخ و سەردەمە ژیاون دراوەتەپاڵ چەرخ

هێمن دەڵێ :

زەمانە هێمنی تۆی وێلی دەشت وچۆل وسەحراکرد
فەراموشی مەفەرموو، جاروبارە هەر بکەیادی([1])

لەم دێڕەدا هێمن کەدەڵێ(زەمانە هێمنی وێلی دەشت و چۆل و سەحراکرد)دەزانین زەمان کەبریتی یە لەم ڕۆژگارە و بە دووا داچوونی شەووڕۆژە هێمنی وێلی دەشت و چۆل و سەحرانەکردووە، بەڵکو ڕوداوەکانی زەمان بوون هێمنیان بەم شێوەیە وێل کردووە، کەوابی کاری ڕابردووی(وێل - کرد) کە دراوەتە پاڵ زەمان دەبوایە بدرایەتە پاڵ بکەری ڕاستەقینە،کەڕووداوە بەڵام لەبەر ئەوەی ڕووداو لەزەمان دەبی زەمانی کردووە بەبکەر، بەم شێوەیە خوازەکەمان دەبێ بە خوازەی ژێری .

٢- دانە پاڵ شوێن :

محسن دەڵێ :

کیمیای لێدا (عەلی)کیمیا، تاتوانی لەگوندو شار
شاری شەهید شاهدە، شەهیدی کرد بەچەند هەزار([2])

لەنیوەی دێری دووەم مەبەست لە(شاری شەهید)واتەکەسانی بریندارو شەهید بووی ئەم شارە (هەلەبجە) وەسفکردنی شار بەشاهد و کردنی

[1] تاریك وڕوون(هێمن) ل ١٠٣

[2] محسن أحمد مصطفی گوڵزاری هۆنراوە دەستنووس

بەبکەر، ڕاستەقینەو حقیقەت نییە،چونکە شارنابێ بەشاهد ئەوەی دەبێ بەشاهد کەسانی ناو براون کەوابێ پاڵنانی کاری ناتەواو(شاهیدە ـ ە) بۆ شارخوازەی ژیریە ،شار بکەری دروست و حەقیقەت نییە، بەڵکو توشبووان و کەسانی ئەم شارە بکەری ڕاستەقینەن، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم کەسانە دانیشتووی ئەم شارەن کارەکە پاڵنراوە بۆشار.

٣- دانەپاڵ هۆ/ الأسنادإلى السبب :

هێمن دەڵێ:

بەهـــار هـــات و تەبیعـــەت حـــوکمی مـــەلانی دا
لـــەکونجی قەفـــەز دیـــارە، ئێســـتە حـــاڵی مـــن!([1])

هێمن کەدەڵێ:(تەبیعەت حوکمی مەلانی دا)تەبیعەت ـ سروشت شتێك نییە بتوانی ئازادی مەلان بدا، بەڵکو ئەوەی ئەم ئازادیە دەبەخشێ خوایە. بەڵام لەبەر ئەوەی تەبیعەت لەبەهار گونجاوە بۆئازادی مەلان کاری ڕابردووی (دا)ی دراوەتەپاڵ تەبیعەت و کراوەبەبکەر .

ڕای هەندێ لەزانایانی ڕەوانبێژی عەرەبی لەبارەی خوازەی ژیری :

١-(عبدالقاهرالجرجانی٤٧١ھ) دەڵێ:(مەرج نییە لەخوازەی ژیری بۆ هەموو کارێك بکەری ڕاستەقینە هەبێ چونکە هێنانی ئەم جۆرە بکەرە بۆکار لەهەموو دەربڕینێك دەرناکەوێ.[2]

٢-(تەفتازانی٧٢٢ھ) بۆ پشتگیری کردن لەڕای جورجانی دەڵێ: ئەوەی جورجانی وتویەتی شتێکی ڕاستە) دوور نییە مەبەستی لەو

---

[1] تاریك وروون(هێمن) ل١٣٦

[2] دلائل الإعجاز عبد القاهر الجرجانی ل٢٠٢

كارانەبێ كە ئیعتیبار پێكراون،داب و نەریتی خەڵك وای كردووە بەكاربێن بۆ ئەو شتانەی بۆیان دانراوە، واتە ئەو كارانەن بۆ بكەری ڕاستەقینەی خۆیان بەكار نەهاتوون.[1]

٣–( رازی ٦٠٦هـ) لەبارەی خوازەی ژیری و پاڵنانی( كار) بۆ شتێك شیاوی ئەوەی نەبێ ببێ بە( بكەری) ڕاستەقینە دەڵێ:(دەبێ هەموو كارێك بكەری درووستی خۆی هەبێ، چونكە ئەگەر بوو بەبكەر بۆ كارێك توانای ئەنجامدانی كارەكەی نەبوو دەبێ بكەرێكی ڕاستەقینەی بۆ دابنێین.[2]

٤–(سكاكی ٦٢٦هـ )لە بارەی بكەری دروست و ڕاستەقینە پشتگیری لەڕازی كردووەو دەڵێ: ئەوەی ڕازی وتویەتی ڕاستەدەبێ هەموو كارێك بكەری هەبێ و بكەری ئەم كارانەش خوایە.[3]

هەروا دەڵێ:خوازەی ژیری بوونی نییە، بەڵكو خواستنێكی شاراوەیە،بكەری خوازراو دەچوێنرێ بەبكەریدروست،لەبەر بوونی پەیوەندی لە نێوانیاندا.ئینجا بكەری خوازراو باس دەكرێ،بكەری دروست و ڕاستەقینە ناوی ناهێنرێ،بەڵام پەیوەستێكی لێ وەردەگیرێ دەدرێ بەبكەری خوازراو.[4]

(بەهار نێرگسی ڕوواند)لەسەر ڕای سەكاكی بەم شێوەیە شی دەكرێتەوە،بكەری خوازراوی (بەهار)چواندووە بەبكەری دروست و ڕاستەقینە، بكەری خوازراو باسكراوە، بكەری ڕاستەقینە باس

---

[1] حاشیة (عبدالمتعال)علی شرح المختصر (سعد الد ین التفتازانی) ل ٥٨

[2] شرح المختصر سعد الدین التفتازانی ل ٥٨

[3] هەمان سەرچاوە/٥٨

[4] شرح المختصر سعد الدین التفتازانی ل٥٩

نەکراوە،پەیوەستێکی هاتووە دراوە بەبکەری خوازراو بۆ زیادەڕەوێی لەوێکچواند ندا. پاڵنان و نیسبەتی کاری(رواند)ی کردووە بەبەڵگەی خواستن بەم شێوەیەش خواستنەکەمان دەبێ بەخواستنێکی شاراوە.

## دووەم :خوازەی زمانی المجاز اللغوي

واتە: لادانی وشە لەمانای بنەڕەتی خۆی بۆ مانایەکی تر لەگەڵ بوونی پەیوەندی یەك لەنێوان هەردوو مانادا،نیشانەیەکیش هەبێ قەدەغەی مانای یەکەم بکات.[1]

لەم پێناسەیەدا کەدەڵێین (لادانی وشەلە مانای بنەڕەت) مەبەست تەنیا وشەی تاك نییەچونکە زور جار وادەبی وشەی لێکدراوو ئاوێتە دەبێ.کەدەڵێین( لەگەڵ بوونی پەیوەندی یەك لەنێوان هەردوو مانادا) واتە:پەیوەندی یەکی گونجاو بێ، بتوانین لە مانای یەکەم بیرلەمانای دووەم بکەینەوە.کە دەڵێین(نیشانەیەکیش هەبێ قەدەغەی مانای یەکەم بکات) ئەم نیشانە کەپێی دەوترێ نیشانەی خوازە(قرینة المجاز)یان بارودۆخ (ألحال والمقام) دەبێ بۆدیاریکردنی مەبەست و مانابێ وەك کەسێك لەناو کتێبخانەیەك بوو وتی:(شێرێك دەبینم)ئەم شوێنە نیشانەیە کەمەبەست لەشێر مرۆڤێکی ئازایە،چونکە کتێبخانەجێگای شێری ڕاستەقینە نییە،یان نیشانەکە وتراوە وەك (شێرێکم بینی لەکتیبخانە) وتنی کتێبخانە نیشانەیەکی وتراوە کەمەبەست شێری ڕاستەقینە نییە،بەڵکو مانا دووەمەکەیەتی کە کەسی ئازایە،چونکە ئەم جێگایە جێگای شێری ڕاستەقینە نییە.ئەم پەیوەندی یەش کە لەپێناسەکەد

---

[1] جواهر البلاغة ( احمد الهاشمی) ل ٢٩٢

هاتووەیان ژێری (عقلی)دەبێ، وەك مانای دووەمی شێر واتە:کەسی ئازا، هەروەك لەنموونەی پێشوودا باسمان کرد.یان هەستی دەبێ وەك

وەفایی دەڵێ:

گوڵەکەم دەڵێن:ئەوادێ هەموو وەختێ چاوەچاوم
ئەی خودا تۆ بڵێی وەهابێ بێتەوە ڕۆنایی چاوم ؟!([1])

وەفایی کەدەڵێ:(گوڵ) مەبەستی مانا ڕاستەقینەکە نییە، مەبەستی مانای خوازراوە کە یارەکەیەتی کەوەك گوڵە بۆ جوانی،کەواتە ئەم پەیوەندی یەی نێوان مانای یەکەم کەگوڵ خۆیەتی لەگەڵ مانای دووەم کەیارە، جوانیە، بەڵگەش بۆ ئەمە نیشانەی(دەڵێن ئەوادێ)یە،چونکە گوڵی ڕاستەقینە توانای هاتنی نییە، ئەوەی توانای هاتنی هەیە یارەکەیەتی.

بەپێی ئەم پەیوەندی یەی نێوان هەر دوو مانادا خوازەی زمانی دەبێ بەدوو بەش:

**بەشی یەکەم : خوازەی بەربڵاو( ألمجاز المرسل )** واتە: بەکارهێنانی وشە بۆ مانایەکی تری جیا لەمانای بنەڕەتی خۆی،بە هۆی بوونی پەیوەندی یەك لەنێوان هەردوو مانا دا،ئەم پەیوەندی یەش وێکچوون نەبێ، نیشانەیەکیش هەبی قەدەغەی مانای یەکەم بکات.[2]

[1] دیوانی وەفایی دیوان لێکۆڵینەوەی (محمد علی) قەرەداغی ل ٧٠
[2] ألمجاز المرسل والکنایة یوسف أبوالعدوس(د) ل ١٥

**هەندێك لە پەیوەندییەكانی خوازەی بەربلاو**

١- پەیوەندی گشتی العلاقة العامة: واتەناوهێنانی شت بەگشتی و مەبەست لێی هەندێكی تربێ :

نالی دەڵێ :

موسڵمانان دەپرسن حاڵی(( نالی ))
لەكونجی بێ كەسیدا مەهجوورەئەم شەو[1]

بەكار هێنانی(موسوڵمانان)لەسەرەتای ئەم دێرە شیعرەدا لەلایەن نالی، مەبەستی گشتی موسڵمانان نییە،بەڵكو مەبەستی هەندێكیانە چونكە ژیری مرۆڤ ڕێ نادا مەبەست هەموو مووسڵمانێك بێ، بەڵكوناو هێنانی هەموویانە مەبەست لێی هەندێكە.

٢- پەیوەندی هەندەكی العلاقة الجزئية: واتە ناوهێنانی هەندێك مەبەستت لێی گشتیبێ:

مەحوی دەڵێ :

مە ثە لی عەهدو وەفاوەك مە ثە لی عەنقایە
پیاوەتی باسی لەكن كەس مەكە ئادەم بووە قات[2]

بەكارهێنانی وشەی ئادەم لە نیوەی دێڕی دووەم لەلایەن مەحوی یەوە، مەبەستی گشتی یە واتە: هەموو بنیادەم، پەیوەندی یەكە تایبەتە مەبەست لێی گشتی یە،واتە: هەندێك بۆ هەموو بەكارهاتووە .

---

[1] دیوان نالی لێكۆڵینەوەی مەلا عبد الكریمی مدرس ل ٣٩٠

[2] دیوانی مەحوی لێكۆڵینەوەی/مەلاعبدالكریمی مدرس ل٦٢

٣–پەیوەندی شوێنی.العلاقة المحلية: ناوی شوێن بێنی مەبەستت لێی کەسێك یان شتێك جێی ئەو شوێنە بێت[١]

نالی دەڵێ :

ئەی خەلوەتی موڕائی، بێ ڕەنگی خـــــود نومائی
ڕەنگ زەردی عاشقی بە، نەك زەرد ڕوو شـــــەقی بە
ئەی خەلوەتی مـــــوڕائی، بێ ڕەنگی خـــود نومائی
ڕەنگ زەردی عـــــاشقی بە، نەك زەرد ڕوو شەقی بە

مانای وشە: خـەلوەتی: ئـەوەی بچـێتەخەلوەتەوە بـۆ خـوا پەرستی. موڕائی: ڕیاباز.خودنمائی: خۆ دەرخستن. زەرد ڕوو: شەرمەزاروو ترسنۆك. شەقی چارەڕەش .

((واتە: ئەی سۆفی خەلوەت نیشینی ڕیاباز..ئەی بە زۆرو ساختە خـۆت بەبێ ڕەنگ و ڕوو پێشاندەر، تاخەلك وابزانن لەخوا پەرستیدا والـەڕو لاوازیبـی ..بالەڕێگای پڕمەینەتی عەشقدا ڕەنگت زەردبێ نـەك لەشـەرمەزاری حـوزری خواو چارە ڕەشی ڕۆژی قیامەتدا لەبەر کردەوەی بەدت![٢]

نـالی کەدەڵێ:(ئـەی خـەڵوەتی مـوڕائی) مەبەسـتی ئەوەیـە بڵـی ئـەی سـۆفی خەلوەتنیشـینی موڕائی،بـەڵام هەسـتاوە لـەجیاتی سـۆفی نـاوی شوێنەکەی بردووە کەخەلوەتە .

---

١ جواهر البلاغة ( احمد الهاشمی) ل ٢٩٥

٢ دیوانی نالی لێکولینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٣٩٧

٤- پەیوەندی پەیوەست بوون : العلاقة اللازمیة

نالی دەڵێ :

شـــەوی یەڵدایـــە یـــادەیجووره، ئـــەم شـــەو ؟!
کەدیـــدەم دور لـــەتۆ، بـــێ نـــووره ئـــەم شـــەو!([1])

نالی لەجێی ئەوەی بڵێ(چاو دوور لەتۆ بێ نـووره..) وتوویـەتی( دیـده دوور لەتۆ بێ ..) چاوودیده پەیوەست و پەیوەسـتراون، نـالی پەیوەسـتی بەکارهێناوه کە(دیدەیە) لەجێی پەیوەسـتراو کە(چاوە)بۆیە شـێوازی بـەم شێوەیە دەبێ بە پەیوەندی پەیوەستی.

٥-پەیوەندی هۆیەتی:العلاقة السببیة:

مەحوی دەڵێ :

ئـــەربابی غینـــا ئەوەنـــدە غـــەرره بـــەزەڕن
بـــێ بـــۆنی بـــەهارو، دیتنـــی جـــۆ دەزەڕن
ئەمیانـــــە مـــــەقام و بەســـــتەیان ناشـــــوکریە
یـــەعنی دەوەڕن ئەگـــەر دەمـــێ بـــێ نـــەزەڕن

مانای وشە: ئەربابی غینا: دەولەمەندان .غەرره:مەغرور و بایی بوو .

((واتە :دەولەمەندەکان ئەوەندەبایی بوون بەو زێڕو زیوەی هەیانە. سروشت و ڕەوشتی نێرەکەری دابەسراویان وەرگرتـووه، بـێ ئـەوەی بـونی بەهاریش بکەن یادنکە جۆیـەکیان چاو پـێ بکـەوێ، هەمیشـە لەخۆیانـەوه دەزەڕێـنن، زەڕی نەکەشـیان لـەباتی مـەقام وتنیانـەو بەسـتەی پـاش

[1] هەمان سەرچاوه/٣٨٧

مەقامەکەشیان ئەوەتەدەست دەکەن بەناشوکری کردنی ئەو نازو نیعمەتەی خواپێی داون و بەکەمی دەزانن و زیاتریان دەوێ .))[1]

مەحوی لەجێی ئەوەی بڵێ (بێ بۆنی کژوگیای بەهار) وتوویەتی(بێ بۆنی بەهار) هۆیەکەی وتووە کەبەهارە چونکە کژوگیا بەهۆی هاتنی بەهار دەردەکەوێ، بەم شێوەیەخوازەی بەربلاوی بەکار هێناوە پەیوەندی یەکەش پەیوەندی(هۆی)یە.

٦– پەیوەندی ئامێری

نالی دەڵێ :

لەدوگمەی سوخمەدوێنێ نوێژی شێوان
بەیانی دا سپێدەی باغی سێوان([2])

نالی لەجیاتی ئەوەی بڵێ(لەو دیوی دوگمەی سوخمەی) وتوویەتی(لەدوگمەی سوخمەی) ناوی ئامێری هێناوەکە(دوگمەیە)لەجیاتی ئەودیوی کەبەهۆی بەکارهێنانی دوگمە بووە بەئەودیو، بەم شێوەیە پەیوەندییەکە بووە بەپەیوەندی ئامێری .

٧– پەیوەندی ژمارەیی :

ئەوەیە: بۆدەربڕینی زۆری وکەمی شتی مەبەست کەسی دەربڕ گوزارشت بەژمارە بکات.

ئەم جورە دەربڕینانە لەشیعرو پەندی پیشینان و دەقەکوردیەکان زۆر بەکارهاتووە.

---

[1] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ل٢٤٩–٢٥٠

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٣٢٠

نالی دەڵێ:

((نالی))بــەداوە شــەعری دەقیقــی خــەیاڵی شــیعر
بــۆ ئــەو کەســەی کەشــاعیرە صــەد داوی نــایەوە

واتە: نالی بەخەیاڵی شیعری پڕ لەوردەکاری خۆی کەئەڵێی تاڵـەمووی باریکە،صەد داوی ناوەتەوە بۆهەرشاعیرێك،[1] نالی لە جیاتی ئەوەی بڵێ زۆر داوی نایــەوە دەڵێ(صــەد داوی نایــەوە) صــەد ئامـاژەیــە بــۆ زۆر، پەیوەنـدی نێوان(صــەد) و زۆر، چـەندایەتیە ڕێـژەی ئـەو فرەییەکـە لـە نێوان یاندایە .

یـــاوەك لەپەنـــدی پیشـــینان هاتووە((قســـە هـــەزارە دووانـــی بەکارە))مەبەست لەهەزار ڕێژەی زۆریە.لەدوانیش کەمیە .

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٥٥٥

## ڕاهێنان

جۆری پەیوەندی خوازەی بەر بلاو لەم دێڕە شیعراندا دیاری بکە

١–نە ظەرم پڕە لە نوورو شەوو ڕۆژی طەلعەتی تۆ
کەبەڕوو شوعاعی شەمسی ، بەبرۆ خەمی هلالی

نالی

٢–نووکی خامەی من کەبێتە مەعنا ئارایی کەماڵ
خە ط بە خەط ئیظهاری نەقشی صورەتی مانی دەکا

نالی

٣–بۆچی نەگریم صەد کەڕەتم دڵ دەشکێنی !
مەی بۆ نەرژێ ،شیشە لەصەدلاوەشکاوە !

نالی

٤–چوومە جەرگەی ئەهلی دڵ جەرگێکی بێ داغم نەدی
نالەیی بولبول لەباغا بێ قڕەی زاغم نەدی

حاجی قادر

٥–واخستمی چاوی کەبەداو زولفی وەلآدا
شەو ڕۆیی، بەیان بەربوو،ئەمن هەر لەخەوا بووم

وەفایی

**بەشی دووەم: خوازەی وێکچوون/خواستن (ألإستعارة):**

خواستن بەپێی دابەشبوونی لەنێوان تاکە وشەو ڕستەدا دوو جۆری هەیە :

١- خواستنی تاك .

٢-خواستنی وێنە.الإستعارةالتمثیلیة.

خواستنی تاك/ألإستعارةالمفردة:واتە:گواستنەوەی وشە لەمانای بنەرەتی خۆی بۆ مانایەکی تر پەیوەندی وێکچوون بەیەکیان ببەستێتەوە، نیشانەیەکیش هەبێ قەدەغەی مانای یەکەم بکات.[1]

ئەوەی لێرە پێویستە بەئاماژە بۆکردن خواستن دامەزرانی لەسەرچواندنێکی کورت کراوەیە لە هەردوو سەرەکەی تەنیا هەریەکیان لە(چوێنراوو پێ چوێنراو) باسی دەکرێ، ئەوزاری چواندن و ڕووی لێکچوونی لێ باس ناکرێ بەکارهێنانی بۆزیادەڕەویە لەچواندن[2]

## بنچینەکانی خواستن

١-لێ خواستراو.ألمستعارمنه - پێ چوێنراو.ألمشبه به .

٢-بۆخواستراو .ألمستعارله - چوێنراو.ألمشبه

٣- خواستراو/ألمستعار: واژەی خواستراو(اللفظ المنقول)لە خواستن (کۆکەرەوە - ألجامع ) ی پێ دەڵێن:لەبەرئەوەی هەردووسەری خواستن

---

[1] علم البیان (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ل ٢٠٥

[2] جواهر البلاغة ( احمد الهاشمی) ل٣٠٢

لەشتێكا یان لەزیاتر بەیەكەوەیان كۆدەكاتەوە، لەمەش وادەردەكەوێ كۆكەرەوە لەخواستن لەجێگای ڕووی لێكچوونە لەلێكچواندندا.[1]

مەحوی دەڵێ :

وەنەوزێكم شەوێ داو گەییە سەرم و
وتی: هەستە هەتاوت وا لەسەركەوت([2])

مەحوی كەدەڵی(هەتاوت وا لەسەركەوت)مەبەستی لەهەتاو خۆشەویستەكەیەتی نەوەك هەتاوی ڕاستەقینە،ناوی پێ چوێنراوی هێناوەكەهەتاوە ناوی چوێنراوی‌نەهێناوە كە خۆشەویستە كەیەتی، بەڵگە شیاوی پێ چوێنراو نییەكەهەتاوی ڕاستەقینەیە،چونكە وەنەوزەو خەوالوبون و چاوچوونە سەریەك لەشەوا بووە، هەتاویش لەشەوا نییە، كەوابێ شیاوی خۆشەویستەكەیەتی كە وەك هەتاوە.كۆكەرەوەی نێوان چوێنراو پێ چوێنراویش درە وشانەوەو جوانییە .

ئەوەی پێویستە بەئامازەبۆ كردن ئایا خواستن بەخوازەی زمانی دادە نرێ یان بەخوازەی ژیری؟ زۆر لەشارەزایانی بواری ڕەوانبێژی عەرەبی بەخوازەی زمانی دادەنێن دەڵێن: چونكە هەڵسوكەتەكانی لێوەی ڕوودەدا هەڵسووكەوتێكی زمانەوانییە،گوڕان لەئامازەی واژەكاندایە بەگواستنەوەیان لەماناى بنەرەتی بۆ مانای تر. بەڵگەشیان بۆ ئەمە واژەی (پێ چوێنراو) لەخواستن بۆمانای خۆی دانەنراوە، لەبۆ(چوێنراو)و مانایەكی گشتیش دانەنراوە، ئامازە پێ كردنی لەبۆ چوێنراو لەڕێگای

---

[1] حاشية الانبابى على رسالەمحمدالصبان فى علم البيان( محمد الانبابى ) /٢٥١

[2] دیوانی مەحوی لێكۆڵینەوەی مەلا عبد الكريمى مدرس ل٨٧

چواندنە، تـۆ کـەدەڵێی چـاك وچـوێنیم لەگـەڵ مـانگ کـرد (مـانگ) لـەلایانی زمانەوانیدا واتە: ئەستێرەیەکی پڕشنگدار، بەرامبەر بەکەسێکی دەم و چاو جوان دانەنراوە، هەروا بـۆ مانایـەکی گشـتیش دانـەنراوە مـانگ و کەسـەکە بگرێتەوە، بۆیە وتنی بۆ(چوێنراو)کە(کەسە دەم وچاو جوانەکە)یە لەڕێگای چواندنە، واتە:گواستنەوەی مانـای مانگـە کەئەستێرەی پڕشـەنگدارە، بـۆ کەسـێکی دەم وچـاوجوان و نـورانی، ئەمـەش واتـە گواسـتنەوەی مانـای بنەڕەتی وشەیە بومانایەکی هاوشێوەی خۆی، واژەی (مانگ) لـە بنەڕەتـدا بەرامبـەر بـە مرۆڤـی جـوان دانـەنراوە، ئەگـەر بەرامبـەر بەومانایـە بایـە، ئەوکاتە مانایەکە لەریگای زمانەوانی دەبوو،نەوەك چواندن.[1]

ئێمەگەربڵێن رێوییێکم بینی گەندەڵی دەکـرد واتـە:کەسـێکی وەك ڕێـوی فێڵبـازم بێنـی گەنـدەڵی دەکرد،لـەم رسـتەیەدا دەبینین،کەسـەکە کەچوێنراوە لابراوە، ڕووی لیّ کچوونیش کەفێڵبازیە ئـەویش لابراوە،لەگـەڵ ئەوزاری چواندن کە (وەك)ە ، نیشانەش کەڕێوی بۆمانای ڕاست قینە نییە، ڕێنمـایی و دەلاڵـەتی ڕستەیە،چـونکە ڕیـویی نـاتوانی بـەم کـارە هەسـتی، بەڵکو بۆمانای تر بەکار هاتووە کەمرۆڤی فێڵبازە،پەیوەندی نێوان ڕێـوی و کەسی گەندەڵکار وێکچوونە کەلەفێڵبازی بەیەکەوە دەگەن.خواستن کەبـەم شـێوەیەبیّ دامـەزرانی لەسـەر چـواندن دەبـی، بـۆ ئـەوەی چـوێنراو و پـیّ چوێنراو بېن بەیەك لەسیفاتی واتایی (معنوی) .

بەلاّم هەندێکی تر لەزانایانی ڕەوانبێژی عەرەبی دەڵێن: خواستن خوازەی ژێری یە، واتە: هەڵسووکەوتێکە ئەنجامەکەی لـەژێری مرۆڤـەوە سـەرهەڵئەدا، خواستن بۆ چوێنراو بەکارنایێ،تـەنها لەوکاتـە نـەبیّ کەبچێتە ڕەگـەزی پـیّ

---

[1] علم البيان(د. بيسيونى عبدالفتاح فيود) ل ١٦

چوێنراوو بن بەیەك شت لەمانای بنەڕەتدا، چونکە گەر چوێنراو نەچێتە ڕەگەزی پێ چوێنراو وەك ئەوە وایە کەناوێك بۆ شتێك بگوێزیتەوە، بێ ئەوەی واتاو مەبەستەکەی لەگەڵ دابێ، بێگومان ئەمەش نابێ بەخواستن (هەڵگورد)کەناوی چیایەکی بەرزی کوردستانە گەر بکرێ بەناو بۆ کەسێك هیچ خواستنێکی تێدا نییە،چونکە خواستن بەم شێوەیە لەراستی(حقیقة) ڕەوانتر نابێ . تۆ کەدەڵێی: شێرێکم بینی قسەی دەکرد، شێر لێرە دوو مانای هەیە ناسراوو نەناسراو مانای ناسراوی، ئەو دڕندەیە کەئازاو بەهێزە و بەجەستەی تایبەتی خۆی دەردەکەوێ.مانانەناسراوەکەشی بەهەمان شێوە ئازاو بەهێزە،بەڵام وێنەکەی جیاوازی هەیە لەگەڵ ناسراوەکەی، لەم ڕستەیەدا، شێریەمانا کەسی ئازاو بەهێز و نەناسراوەچووتە ڕەگەزی ناسراو لەئازایەتی و بەهێزیدا، وێنەیەکی خەیاڵی شێری وەرگرتووە.لەم شێوە هەڵسووکەوتە ژیریانە دەردەکەوێ کە خواستن شێوازەکی ژیریەو بە خوازەی ژیری دادەنرێ.

بۆوەڵامی ئەم ڕایەی دوایی، وتراوە گواستنەوەی مانای پێ چوێنراو بۆ چوێنراو پڕوپاگندەکردنە، بوونیان بەیەك ڕەگەز تەنیا هەر بەخەیاڵەو بۆ مەبەستی زیادە ڕەویە،گواستنەوەی چوێنراو نییە بۆ پێ چوێنراو،لەسەربنەمای ڕاستیی وحەقیقەت. بوونی بەڵگە قەدەغەی مانای بنەڕەتی چوێنراو دەکات ببێ بە خودی پێ چوێنراو لەدەربڕینی بەم شێوەیە تاکەکانی پێ چوێنراو بووە بەدوو جۆر،جۆرێکیان ڕاستی و جورەکەی تریان خەیاڵ و پڕوپاگندەیە، ئەمەش شتێکە لەزمانی ئێمەوەك زمانەکانی تر بوونی هەیە، هەروەك لەگفت وگۆو شیعرو نووسینەکانمان دەرەکەوێ.[1]

---

[1] علم البیان(د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ل١٦٣-١٦٥

ئێمە کەسەرنج دەدەین لەگوزارشتکردنی بەم شێوەیە دەزانین دووشتی بەڕەگەز لەیەکتر جیاواز نابن بەیەك ڕەگەز، چوێنراو کەنەناسراوەکەیە بچێتە ناو ڕەگەزی پێ چوێنراو کەناسراوەکەیە بەهەمان ڕەگەز لەوانە نییە ببێ و بێتەجێ، تەنیا لەسیفەتێك یان چەند سیفەتێکی واتایی مەعنەوی نەبێ .

## جیاوەزیەکانی نێوان خواستن و چواندن :

١- چواندن لەسەر دووبنەڕت دادەمەزرێ کەچوێنراو(ألمشبه) وپێ چوێنراو(أ لمشبه به) یە، بەلآم خواستن تەنها هەریەك لەم دووبنەڕەتەی لێ باس دەکرێ چوێنراو یان پێ چوێنراو،لەوکاتەش کەچوێنراو وترا دەبێ پەیوەستێکی پێ چوێنراوی بۆ دیاری بکرێ .

٢- لەچواندن هەست دەکرێ کەپێ چوێنراو لەچوێنراو دیارترو گەشاوەترە.بەلآم لەخواستن بەیەك چاو سەیر دەکرێن.

٣- لەچواندن دەشێ ڕووی لێکچوون و ئەوزار بوترێ یا نەوترێ، بەلآم لەخواستن نابێ ڕووی لێکچوون و ئەوزار باسبکرێ.

## جیوازی نێوان خواستن و درۆ

١-لەخواستن چوێنراوو پێ چوێنراو بەیەك چاو سەیر دەکرێن ، چوێنراو دەچێتە ڕەگەزی پێ چوێنراو لەسیفەتی واتایی(معنوی)واتە تاکەکانی پێ چوێنراو دەبن بە دووچین: ناسراوو نەناسراو، شێرێکم بینی قسەی دەکرد(شێر) دوو واتای هەیە ناسراوو نەناسراو، ناسراوەکە واتە: شێری ڕاستەقینە کەگیانلەبەرێکی دوڕندەو ئازایە. واتایەکی نەناسراوشی هەیە مەبەست کەسێکەکەلەئازایەتی و بەهێزی دا چووبێتە ڕەگەزی ناسراوکە پێ چوێنراوە بەلگەش بۆ ئەوەی کەنەناسراو کەسێك بێ ئەوەیە

دەڵێ قسەی دەکرد شێر قسەناکات مرۆڤ قسەدەکات. بەلاّم لەدرۆ ئەم وێنە خەیاڵ یە بیری لێ ناکرێتەوە.

٢–لەخواستن دەبێ بەڵگەیەك هەبێ کە مەبەست مانای بنەڕەت نییە، بەڵگەکەش هەروەك لەڕستەکە هاتووە قسەکردنە.بەلاّم لە درۆ بەڵگە پێویست نییە،چونکە کەسی درۆزن بەڵگەی ناوێ بۆ ئەوەی بڵێ مەبەستم لەقسەکەم مانای بنەڕت نەبوو، بەپێچەوانەوە دەیەوێ بەڵگەیەکی هەبێ درۆکەی پێ بسەلّمێنی .[1] لەشیعرەکەی مەحوی کەلەمەوپێش باسمان کرد(هەتاوت وا لەسەرکەوت ) (هەتاو)دوو واتابەدەستەوە دەدات واتایەکی زانراوی ڕاستەقینە کەڕووناکی و تیشکی ڕۆژەلەگەڵ واتایەکی نەزانراو،کەخۆشەویستەجوان و پڕشەنگ دارەکەی مەحوی یە،واتا نەزانراوەکەچووتە ڕەگەزی پێ چوێنراوەکە،چونکەلەسیفەتی واتایی (معنوی) بەیەکەوەدەگەن کەتیشکدانەوەو جوانییە .بەڵگەش بۆ ئەمە کەمەبەست (خوشەویستی) مەحوی یە هەتاوی ڕاستەقینەی ناسراو نییەچونکە کاتەکەشەوبووە، هەتاویش لەشەوا نابێ هەروەك لەنموونەی خواستنی تاك باسمان کرد .

## جۆرەکانی خواستن

خواستن بەپێی هاتنی یەکێ لەهەردوو لاکەی کەبۆخواستراو(ألمستعارله) ولێ خواستراو(ألمستعارمنه)ە دووبەشی هەیە:

---

[1] علم البيان (د. بيسيوني عبدالفتاح فيود) ل١٦٣–١٦٥

**یەکەم: خواستی ئاشکرا/ألإستعارة التصريحية:**

خواستنی ئاشکرا:ئەوەیە:تەنیالێ خواستراوی بەئاشکرالێ باس بکرێ.[1]

جزیری دەلێ :

ئەو دلێ من: وەك کەبوتەر نابتن کەس لۆمەکەت
لەو دقێ تۆڕێ وە داکەفتی مەدین سەد شەهباز!

مانای وشە : کەبوتەر:کۆتر.نابتن :نابێ.لۆمە: سەرکۆنە. تۆڕ: داو. داکەفتی:کەوتەبەر.

**شاهباز: بازی سپی .**

واتە: باکەس سەرکۆنەی دلی من نەکات کەبەر تۆڕی ئەڤینی کەوتووە،دڵم وەك کۆترێکی بێ هێزە،چۆن کۆتر ناتوانی بەرگری لەخۆی بکات لەگیرۆدەبوونی بەداوەوە، دلی بێ هێزی منیش بەهەمان شێوەگیرۆدەی داوی ئەڤینی بووە،بەرکەوتنی من بەو داوەجێگای سەرکۆنەنییە، سەد نەبەردو ئازا، یان سەد شاباز دەبینین گیرۆدەی ئەم تۆڕەن و کەتونەتە پەلەقاژە، دلی بێ هێزی منی وەك کۆتر چۆن دەتوانی خۆی ڕزگابکات! ؟.[2]

جزیری بە شێوازێکی زۆرجوان و ناسك و پڕ لەهەست و سۆز لەم دێرە شیعرەیدا چەند مەبەست و مانای دەربڕیوە لەڕێگای جۆراوجۆری ڕوونبێژی، بۆئاشکراکردن و ڕوونکردنەوەی ئەندازەی بێ هێزی دەردی ئەڤینی خۆی، بۆ ئەومەبەستەشی لێکچواندن(التشبيه)ی بەکارهێناوە، بێ

---

[1] علم البيان(د. بيسيونى عبدالفتاح فيود) ل ١٦٧

[2] جواهر البلاغة ( احمد الهاشمى) ل ٣٠٥

هێزی دڵی خۆی بەراوردكردووە بەبێ هێزی كۆتر،كەبێ هێزی سیفەتێكی هاوبەشی نێوان هەردوكیانە، هەر لەڕێگای ئەم هونەرە پاساوی ئەوەشی هێناوەتەوەكەجێگای سەر زەنشت و سەركۆنە نییە چونكە كەسانی لەو بالآترو بەتواناتر نەیان توانیوەخۆیان لەتۆڕو داوی عەشق دەربازبكەن.بۆ ئەم مەبەستەشی شێوازی ڕوونبێژی خواستنی ئاشكرای لەدووجێگا بەكار هێناوە:

١-(تۆڕ)كەپێ چوێنراوە(لێ خواستراوە) ناوی هاتووە، چوێنراو(بۆخواستراو)كە عەشقە،ناوی نەهاتووەبەڵگەكەدەڵێ:(ئەودڵێ من...... لەو دڤێ تۆڕێ) شیاوی پێ چوێنراو نییەكەتۆڕە، چونكە دڵ گیرۆدەی تۆڕنابێ، شیاوی چوێنراوە كەعەشقە دڵ بەعەشق گیرودەدەبێ.

٢- (شەهبان) پێ چوێنراوە(لێ خوااستراوە)ناوی هاتووە(مرۆڤی ئازا) چوێنراوە(بۆ خواستراوە)ناوی نەهاتووە،بەڵگە لەڕەوت و ناوەرۆكی شیعرەكە دەردەكەوێ، شیاوی پێ چوێنراو نییە كەبازی ڕاستەقینەیە، شیاوی چوێنراوە كەمرۆڤی ئازایە،چونكە جزیری دەڵێ: باكەس لۆمەم نەكات كەدڵم بەر تۆڕی عەشق كەوتووە هەرمن بەتەنیا نیم سەدانی ئازای وەك شاباز بەر هەمانِ ئەم تورەِ كەوتوونە .

## دابەشكردنی خواستن بۆگونجاوی و نەگونجاوی لەگەڵ یەكدا

خواستنی ئاشكرابەگوێرەی گونجان ونەگونجانی هەردوو سەری خواستن لەگەڵ یەكتری دووجۆری هەیە:

١-خواستنی گونجاو:(ألإستعارةالوفاقية) ئەوەیە هەردووسەری خواستن لێ خواستراو بۆ خوستراو بشێ بەیەکەوە کۆببنەوە لەبەر گونجاوی نێوانیادا.[١]

خوا لەقورئانی پیرۆزدەفەرموێ:﴿فی قلوبهم مرض فزادهم الله مرضاولهم عذاب أليم بما كانوا يكذبون﴾ سوورتی بەقەرە/ئایەتی/١٠

واتە:(ئەوانە لەنێو دڵیان نەخۆشی دوو ڕوویی و ناپاکی هەیە خواش نەخۆشی یەکەی زورتر کردن بەناردنی قورئان ـ هەروا بۆ ئەوانە سزای سەخت دانراوە بەهۆی ئەو درۆیانەی کەدەیانکرد)[٢]

(مرض) واتە: نەخۆشی. بۆ دوو ڕوویی خواستراوە.(مرض)کەنەخۆشی یە لێ خواستراوە، دوو روویی کەناوی نەهاتووە، بۆ خوستراوە،ئێمەکەدەڕوانین دەبینین لەنێوان لێ خواستراو کەنەخۆشی یە، بۆ خواستراوکە دوو ڕوویە گونجاوی هەیە، چونکە نەخۆشی و دوو روویی دەبێ هەردووکیان لە دڵی مرۆڤ کۆببنەوە .

قانع دەڵێ:

ئەی کوردی خەفەت بارو، بریندارو پەرێشان
ئەی میللەتی بێ پشت و، بە بێ یاوەروعوریان
جێ ماوی لەگەڵ نەوعی بەشەر، تا قمی یاران
ماڵداری بەبێ ماڵ و، سەری بێ سەرو سامان
ڕاستۆ بە لەخەو،سەیرێ بکەعالەمی ئیمکان([٣])

[١] ألعقد الجوهرى فى شرح ديوان الجزرى أحمد الزفنگى ل ٢٦٦
[٢] علم البيان (د. بيسيونى عبدالفتاح فيود) ل ١٨٥
[٣] صفوة التفاسير ( محمدعلى الصابونى) ب١ل٣٧

(خەو) (لێ خواستراو، پێ چوێنراو)ە باسکراوە(بێ ئاگایی) (بۆ خواستراو، چوێنراو)ە

باس نەکراوە،نیشانەی خواستن ڕەوتی دێڕەکانی ئەم هۆنراوەیە، شیاوی مانای بنەڕەتی لێ خواستراو نییە کەخەوی بەمانا نووستنە شیاوی چو ێنراوە کە(بێ ئاگایی)

یە، بەم شێوەیە خواستنەکەمان دەبێ بەخواستنێکی ئاشکرا. لەبەرئەوەی خواستراوو بۆخواستراو گونجاون لەگەڵ یەکترو دەشێ بەیەکەوە کۆببنەوەخواستنەکە دەبێ بەگونجاو.کۆکەرەوەی گونجاوی نێوان(خەو) و(بێ ئاگایی)ئەو غەفلەتەیەکەبەسەر خاوەنەکەی دادێ هەست بەشت نەکات .

٢- خواستنی هاودژی/ألإستعارة العنادیة: ئەوخواستنەیەکەلێ خواستراوو بۆخواستراو بەیەکەوە نەگونجێن .[١]

نالی دەڵێ :

کەژاوەو دارو بارو تەختەیی لوختی لەسەر پوختی
دەناڵێنن لەشەوقی طیبە وەك ئەستوونی حەنانە

ما نای وشە : (( لوخت: ڕووت .بوختی: وشتری دوو کۆپارە.ئەستوونی حەنان:کۆلەکەیەك بووە لە مزگەوتی پێغەمبەرداله مەدینە، پێغەمبەر(د.خ) بەرلەوەی مینبەرو میحراب بۆ مزگەوتەکەی دروست بکا، ئەچوو پاڵی بەکۆڵەکەیەوە ئەدا خوتبەی ئەخوێندەوە، پاشان کەمینبەری بۆ مزگەوتەکەی دروست کرد،کولەکەکەی بەجێ هێشت کولەکەکە دەستی

---

[١] دیوانی قانیع کۆکردنەوەی بورهان قانع ل ١٨٥

بــەزیره زیــڕو گریــان کرد...پێغەمبــەریش باوەشــی پیــاکردو دڵــی دایەوە،ئەویش بێ دەنگ بوو لەزیڕ زیڕ کەوت.))[1]

واته((هــەموو پارچــەکانی کــەژاوەو تەختــە ڕووتەکــەی لەســەری دانراوەو،بەکولی حوشترەکەدا بەستراوە هــەموو لەبەر سۆزی گەیشتن بە مەدینە،وەك کۆلەکەکەی مزگەوتی پێغەمبەر ئەزیرێنن - جیڕەجیڕیان دێ - نالی ئەیەوێ مەعنای جیڕەجیڕو تەقەتەقی تەختە وقەوارەی کەژاوەکە بەکۆڵی حوشترەوەبەسۆزیگەیشتن مەدینە مەعنای لێ بداتەوە))[2]

((لەم دێڕ دا نالی جگە لـەوەی دارو تەختـەی سەرپشتی حوشـترەکەی چـواندووە بــە ئەســتوونی حــەنان ئــەو کۆلەکەیــە کەپێغەمبــەر(د.خ) لەمزگەوتەکەیــدا پــالی پێــوەدەداو خوتبــەی دەخوێندەوە)لــەجیڕەجیڕ کردنیاندا، ئەو دارو تەختانەی چواندووە بەمرۆڤێك، چونکە دەڵێ:دەنـالێنن نالأندنیش هەر بۆ مرۆڤە، بەلأم لێرە بۆ خۆشی بەکار هاتووە ،چونکە مـرۆڤ لەناخۆشیدا دەنالێنی ))[3]

بۆزیـاتر ڕونکردنـەوەی ئـەم خواسـتنە دەتـوانم بلێم: نـالی جیڕەجـیڕی ئەوشتانەی کەلەسەر حوشـترەکەبوون، بـەنالینی مرۆڤـی چـواندووە، بـەلأم چوێنراو کەجیڕەجیڕە باسـی نـەکردووە (نـالین) کـە پـێ چـوێنراوە باسـی کردووە،خواستنی پێ چوێنراو کەنالێنە بۆچوێنراو کە(جیڕجیڕ)ی شتەکانی سەرپشتی حوشترەکەیە، بۆ ئەوەیە ئەم جیڕەجیڕە وەك سۆزو نالینی ئـەو مرۆڤــە نیشــان بــدات کەخۆشــی دەردەبــڕێ بەگەیشــتنی بــەم

---

[1] علم البیان (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ل ١٨٦

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٥٠٠

[3] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٥٠٠

جێگایه،کەمەدینەی پیغەمبەرە(د.خ) واتە:ئەم جیرەجیرە جیاوازی نییە لەگەڵ ناڵینی پڕ سۆزی مرۆڤ بۆ ئەم شوێنە،ناڵینیش کەبۆ ناخوشیە،بۆ دەربڕینی خۆشی وشادی بەکاری هێناوە ئەم وردەکاریەی نالی لەم خواستنەدا بۆ ئەوەیە ئاستی پلەی خۆشی گەیشتنی نابراو بەم شوێنەپیرۆزە وەك ئاستی پلەی بەرزی زیرە و ناڵەی ئەم ستوونە وایە،کەپێغەمبەر(د.خ)لێی بەدوور کەوتەوە لەو کاتە کەمیحرابی بۆ مزگەو تەکەی دروستکرد،بەڵام ناڵینی پارچە شتوومەکەکان بۆ خوشی بوو،ئەوەی ستوونەکە بۆ دەربڕینی غەم و پەژارەو سووبوونەوە بوو، ئەم خواستنە کەخواستنێکی ئاشکراو هاودژە لەهەمان کاتیشداخواستنێکی پاشکۆییشە چونکە(دەناڵێنن) کە خواستراوە کەیە فەرمانە بۆکاری داهاتوو لەناڵین داتاشراوە.

## دابەشکردنی خواستن بە پێی کۆکەرەوە(ألجامع)بۆ گشتی وتایبەتی:

١– خواستنی گشتی/ألإستعارةالعامة: ئەو خواستنەیە لەبەر زۆر بەکار هێنانی کۆکەرەوە (الجامع)ی بەئاشکرا لێوە دیاربێ.[1]

ئەوەی لەم پێناسەیەدەردەکەوێ ئەم خواستنە لەبەر زۆربەکارهێنانی وێنەی خواستن و کۆکەرەوەی خواستراوو بۆ خواستراوی بەئاشکرا لێوەی دیارە. پێویست بەلێکدانەوەو وردەکاری زۆر ناکات .

مەحوی دەڵێ :

لەڕوژ ئاواوە ئیمشەو بێ نیقابە
مەهی من،ماهی عالەم بێ مەفەڕ کەوت

[1] هونەری ڕەوانبێژی لەشیعری نالی دا عبدالسلام سالارل٨٦

((واتــە:مانگی مــن کەیارەکەمــە ئــەم شــەو لــەڕۆژاواوە بــەبێ پەچــە دەرکەوت و هات، هەرکــە ئــەو درکــەوت وهــات مــانگی ئاسمــان کــە لــەرۆژە لاتەوە هەڵهاتبوو،لە شەرمان رای کــرد، جــێ نــەبوو خــۆی تیــا بشــارێتەوە. نەی دەزانی بۆکوێ هەڵبێ.[1]

(مــەهی) یەکــەم لــەنیوەدێڕی دووەم لێ خواســتراو(پێ چــوێراوە) (یــان) بۆخواســتراوە (چــوینراوە) نیشــانەی خواســتن ئەوەیــە دەڵــێ: مــەهی مــن شــیاوی بــۆ خواســتراوە کــەیارە شــیاوی لێ خواســتراو نییــە کــەمانگی ڕاستەقینەیە،چونکە بەمانگی ڕاستەقینەناوترێ مەهی من .

٢- خواستنی تایبەتی/الإستعارة الخاصة:

خواســتنێکە لەبــەر کــەم بــەکارهاتن کۆکــەرەوەی (الجــامع) بــۆ هــەموو کەس ڕوون و ئاشکرا نییە تەنها بۆ کەسانی شارەزاو لێ هاتووی ئــەم بــوارە نەبێ.[2]

حاجی قادردەڵێ:

تالەمەکتەب ئەو مەهــەم دی مەشــقی ئــەلف و بــێ دەکــا
چــاوەکەم بــوویتە دوێــت و گــریە ســـورخی تێ دەکــا([3])

مانای وشــە: دوێــت : مەرەکــەب دان. ســورخ:جورەمەرەکەبێکی ڕەنــگ ســـوورە و تریســـکە دارە بــە شــێوەیەکی تایبــەت لەچــەند رەنگێــك دروســت

---

[1] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلاعبد الکریمی مدرس ل ٨٨
[2] جواهرالبلاغة ( احمد الهاشمی) ل ٣٢٩
[3] دیوانی حاجی قادری کۆیی(هێرش بێتوشی) ل٣٤

دەکرێت، بۆ دیاری کردنی شوێنە گرینگەکانی کیتاب و خۆشکردنی لەقوتابخانە ئاینیەکان بەکار دەهێنرێ .

واتە: تا یاری ڕوو جوانی وەك مانگم لە هاتوو چۆی قوتابخانەبێ بۆ مەشق و پەروەردە وفێر بوون، هەردوو چاوم لەبەر گریان ناوەوەیان لەسووریدا وەك مەرەکەب دانیان لێ هاتووە کەسورخی تێدابێ .

لەم دێڕە شیعرەدا دووخواستنی ئاشکرا هەیە یەکەمیان خواستنێکی گشتی و ڕوونە دووەمیان خواستنێکی تایبەتە :

١– (مەهـ) لێ خواستراو،(پێ چوێنراو)ە باسکراوە یار بۆخواستراو(چوێنراو)ە باس نەکراوە(مەشقی ئەلف و بێ دەکا) نیشانەی خواستنە(قرینة الاستعارة) شیاوی پێ چوێنراو نییەکە(مەهە)لەبەر ئەوەی مەهی ڕاستی مەشقی ئەلف و بێ ناکات.شیاوی چوێنراوە کەیارە چونکە یار ئەتوانی ئەم مەشقەبکات.خواستنی (مەهـ) بۆ ڕووی یار خواستنێکی گشتی و ڕوونە چونکە بەکارهێنانی مەهـ بۆ ڕووی جوان، باوە و زۆر بەکار هاتووە.

٢–(سورخ)لێ خواستراو،(پێ چوێنراو)ە باس کراوە (فرمێسکی سوور) بۆ خواستراو،(چوینراو)ەباس نەکراوە(گریە)نیشانەی خواستنە، شیاوی فرمێسکە کەچوێنراوە،چونکەچاو بەفرێسك سوور دەبێ شیاوی پێ چوێنراو نییە کەسورخە، چونکە گریە بەداڕژانی فرمێسك چاوسوور دەکات نەوەك بەسورخ، ئەم خواستنە خواستنێکی تایبەتە،چونکەخواستنی(سورخ)بۆ سووری فرمێسك کەم بەکارهاتووە، پێ ویستی بەلێکدانەوەو بیرکردنەوە هەیە بۆ گەیشتن بەخواستراو.

**دووەم :خواستنی شاراوە/الإستعارة المکنیة :**

خواستنی شاراوە: ئەو خواستنەیە تەنها(چوێنراو)ی لێ هاتبێ لەگەڵ پەیوەستێك ئاماژە بکات کە پێ چوێنراو مەبەستە.[1]

مەبەست لەپەیوەست ئەو شتەیە کەسەر بەپێ چوێنراو بێ و تایبەتی بکەی بە (چوێنراو)، ئەم پەیوەستەش بەخواستنی ڕامانی(التخییلیة) ناو دەبرێ لەلایان زانایانی ڕوانبێژی عەرەبی .

ئەوەی لێرە بۆمان روون دەبێتەوە: خواستنی ڕامانی بەدوای خواستنی شاراوە دێت چونکە ئەم خواستنە دەبێ بەنیشانەو پەیوەست بۆ خواستنی شاراوە ئەم نیشانە یان ئەم پەیوەستە پێی دەوترێ خواستن،چونکە ئەم شتەی کەتایبەتە بەخواستراو (پێ چوێنراو) دراوە بە بۆخواستراو (چوێنراو)، هەر لەبەر ئەمەشە پێی دەوترێ ڕامانی - ئەندێشە- چونکە گوێگر بەهۆش و ئەندێشەی خۆی(چوێنێراو) لە(پێچوێنرو) دەچەسپێنی.[2]

مەحوی دەڵێ :

دڵی سووتا بەزەردەشت و بەکەسری کیسرەوی،گریا
ئەوەندە بەحری(ساوا) نم لەچاویدا بوە تانە

مانای وشە:کەسر: شکان.کیسرەوی:کیسرایی. بەحری ساوا : دەریاچەیەك بووە لەفەلەستین .

لەکتێبەکانی سیرەتدا نوسراوەکەوا لەشەوی لەدایك بوونی پێغەمبەرد (د.خ) وشك بووە.

[1] علم البیان ( عبدالعزیز عتیق.د) ل ١٢١
[2] حاشیة ضمن شروح التلخیص(الدسوقی) ب٢ل٤٧٠

واتە:((ئاوی ساوا ئەوەندە دڵی بە کوژانەوەی ئاگرەکەی زەردەشت و دەرز بوونی تاقی کیسرا سووتاو بەسەر یانا گریا،تەڕایی لەچاویا بڕا، بوو بەقوڕە ڕەشە وەك تانەی سەرچاو.[1]

لەنیوەی دووەمی ئەم دێڕە شیعرە دا دووخواستن هەیە :

١–خواستنی شاراوە: ئەوەتە(بەحری ساوا) چوێنراوە بەمرۆڤ واتە( بەحری ساوا) چوێنراوە باسکراوە مرۆڤ پێ چوینراوە باس نەکراوە (دڵی سووتا گریا ....) نیشانەی خواستنە،چونکی ئەمانە هیچیان شیاوی بەحری ساوانین، بەڵکو شیاوی مرۆڤن، مرۆڤ ، ئەم سیفەتانەی لێ دێتەجێ.

٢–خواستنی ڕامانی:(دڵی سووتا،گریا،نم...) هەریەك لەمانە دەبن بە خواستنی ڕامانی، چونکە خواستی ڕامانی ئەوەیە: بۆ خواستراو بەر هەستی ژیری نەکەوێ ، بەڵکو وێنەی خەیاڵێکی رووت بێت.لێرەدا دەبینین خەیاڵ وێنەیەکی بۆ بەحری ساوا دروست کردووە کە لەمرۆڤ بچێت، چونکە هەریەك لەدڵ سووتاو گریاو، نم لەچاویدا بوە تانە تایبەت بەمرۆڤن، دراون بە بەحری ساوا، لێرە خەیاڵ وای کردووە بەحری ساوا وەك مرۆڤێك بێتە بەر چاو کەدڵ سووتاوو چاو بەگریان و نم لەچاوبێ. بەم شێوەیە بۆخواستراو کەبەحری ساوایە وێنەیەکی خەیاڵی بۆ دروست کراوە کەوەك مرۆڤیکی بەم شێوەیە بێتە بەرچاو.

---

[1] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلاعبدالکریمی مدرس ل٤٢٥

## دابەش شکردنی خواستن بۆ نەژادی(ألأصلية) و پاشکۆیی(التبعية)

١- خواستنی نەژادی/الإستعارة الأصلية :

ئەو خواستنەیەلێ خواستراو(المستعارمنه) وشەکەی یاناوێکی نەژادی یا چاوگ بێ، بۆ مانایەك هاتبێ.(١)

ئەوەی لێرە دەردەکەوێ ئەم خواستنە تایبەت نییە هەر بەخواستنی ئاشکرا،بەڵکو لەخواستنی شاراوەش بوونی بەر چاوی هەیە هەر وەك باسی دەکەین .

صافی دەڵێ:

طه یری دڵ لەم ناوە دەرناچێت ئەو حەددی چیە
چونکە یارم بازەکە نەخچیری سەد شاهین دەکا(٢)

واتە: دڵی بێ هێزی وەك باڵندەم چۆن ئەتوانی لەو داوە خۆی ڕزگار بکات لەبەر دەستی دەربچی! ؟ نەخێر ناتوانی چونکەیارم وەك ئەو بازە بەهێزە وایە ڕاوی سەد دڵی بەهێزی وەك شاهێن دەکات.

شاعیر کەدەڵێ(یارم بازەکە) لەوانەیە مەبەستی شابازبێ، واتە:بازی سپی، بەهێزترین جوری بازە لەڕاوکردندا.

شاعیر شاهێنی خواستوەبۆ دڵی بەهێز کەواتە شاهێن لێ خواستراو(پێ چوێندراو)ە وشەیەکی نەژادی یە،لەوشەی تر دا نەتاشراوە بۆیە دەبێ بەخواستنی نەژادی لەهەمان کاتیشدا خواستنێکی ئاشکراو ڕاستەقینەشە،

---

١ علم البيان (د. بيسيونى عبدالفتاح فيود) ل ١٧٧

٢ دیوانی صافی لێکۆڵینەوەی محەمەد مستفا هیرانی ل١٤٤

نالی دەڵێ:

غـــەم دەڵێ:کـــەنالی غـــەم خـــواریم نـــەکا
ناعیلاجـــم مـــن بـــەنی ئـــادەم دەخـــۆم

واتە: ((خـەم دەڵـێ: ئەگـەر نالی خـەمم نـەخواو بـە تەنگمەوەنەیـەت و هەمووم نەگرێتە

ئەستۆی خۆی،ناچار ئـەبم دنیـا هـەموو بگرمـەوەو هـەموو ئـەم خەڵکـە بخۆم و گشتیان لەناوبەرم. بۆیە من خـۆم ئەکـەم بـەقوربانی ئـەم خەڵکـەو سەرپەرشتی خەم ئەکەم تا ئەم خەڵکەلەخەم ڕزگار بکەم )).[١]

لەبەر کاریگەری زۆری غەم لەدڵی نالی دا، ناچار بـووە غـەم بـەمرۆڤێك بچوێنی داوای هاوبەشـی لێ بکـات لەغـەم خواردنـدا، بـەلام ، نـاوی مرۆڤـی نەبردووە تەنها چوێنراو (بۆخواستراو) کەخەمە هاتووە، لەگەڵ پەیوەسـتی پێ چوێنراو (لێ خواستراو) کە(دەڵێ)یە،چونکە مرۆڤ توانای وتووێژی هەیە غـەم نییـەتی، ئـەم شـێوە خواسـتنە پێـی دە وترێـت خواسـتنی شـاراوە لەهـەمان کاتیشداخواسـتنێکی نەژادیشـە، چـونکە خواسـتراو کەمرۆڤـە وشەیەکی داتاشرا و نییە.لەوشەی ( دەڵێ)ش خواستنێکی ڕامـانی خـەیالی هەیە، چونکە خەیاڵ وێنەیەکی وەك مرۆڤی ڕاسـتی کەقسـەبکات بـۆ غـەمی درووست کردووە، چۆن مرۆڤ توانای وتنی هەیە ئـاوا بەخـەیاڵ وتنـی داوە بەغـەم، ئینجـا وتنـی غـەمی بـەوتنی مـرۆڤ چـواندووە،وتنی ڕاسـتەقینەی مرۆڤی بۆ وتنی وێنەخەیاڵیەکە خواستووە لەجێگای وی داناوە.

---

[١] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٢٩٨

٢- خواستنی پاشکۆیی(ألتبعیة):خواستنێکە وشەی خواستراوی وشەیەکی داتاشراوبێ .وەك كاری دیارو نادیارو هەموو جۆرەكانی تر.[1]

ئەوەی لێرەبومان دەردەکەوێ ئەم خواستنە بۆیەپێی دەڵێن پاشکۆیی، چونکە دەبێ بەپاشکۆی خواستنێکی تر ئەویش خواستنی نەژادی یە، نیشانەی ئەم خواستنەش یان (بکەر) دەبێ یان (جێگری بکەر) دەبێ، یان شوێن و ڕەوتی ڕستە ئاماژەی پێ دەکات .

نالی دەڵێ:

گوڵ بەدەم بادی صەباوە پێکەنی بولبول فڕی
یەعنی عاشق لازمە دووربێ لە یاری بێ وەفا

واتە((دوو ڕوویی و ناڕاستی نەوەك هەر لای ئادەمی زاد،بەڵکو لای گیان لەبەرانیش شتێکی ناپەسند و بێزراوە، نابینی کاتێ گوڵ بەدەم بای صەباوە پێ دەکەنی و ئەلەرێتەوە بولبول دڵگران دەبێ و هەڵئەفرێ، چونکە لای وایە یار پێویستە هەر یاری یەکێ بێ و عاشقیش ئەبێ خۆی لەیاری بێ وەفا دوور بگرێ.))[2]

لەم دێڕەشیعرەدا گەشانەوەی(گوڵ) چوێنراوە بەپێکەنین، سیفاتی هاوبەش و کۆکەرەوەی گەشانەوەو پێکەنین (دەم) کرانەوەیە، ئینجا لەم کاتەکەدیمان هەردووکیان هاوبەشن لەم سیفەتەدا، گەشانەوەمان دانا بەپێکەنین واتە:پێکەنینمان بۆ گەشانەوەخواست (گەشانەوە) کەناوی

---

[1] جواهر البلاغة ( احمد الهاشمي) ل ٣١٢

[2] علم البيان (د. بيسيوني عبدالفتاح فيود) ل ١٧٩-١٨٠

نەهاتووە،بوو بەچوێنراو پێکەنین بوو بە پێ چوێنراو،دەتوانین تاوتوێی ئەم خواستنە بەم شێوەیەبکەین:

(پێکەنین)چاوگە پێ چوێنراوە ئاماژەی بەکاری ڕابردووی (پێکەنی) بۆکراوە، چوێنراو باس نەکراوە کە (گەشانەوەی) بەمانا(گەشایەوە)یە،ئەمەش واتەگەشانەوەی بەمانا(گەشایەوە) مان چواند بەپێکەنینی بەمانا(پێکەنی)، یەکەم کەپێکەنینە بووبە لێ خواستراو، دووەم کەباس نەکراوەکەیە، بوو بەخواستراو نیشانەی خواستن (گوڵە) کەبکەرە بۆ کاری ڕابردووی (پێکەنی) شیاوی چوێنراوە کە(گەشانەوە)یە، شیاوی پێ چوێنراو نییەکە(پێکەنینە)بەم شێوەیەخواستنەکەمان بووبەخواستنی پاشکۆیی(ألإستعارة التبعیة)ئەوەی لێرە دەردەکەوێ(نیشانەی خواستن گەر گونجاونەبوو ببێ بەبکەر بۆ فەرمان(کار)ی خواستراو، دەبێ گونجاوبێ ببێ بەبکەر بۆفەرمانی بۆخواستراو،(گوڵ) لەم دێڕەشیعرەدا بکەرە بۆ کاری ڕابردووی (پێکەنی) بەمانا گەشایەوە بکەر نییەبۆ(پێکەنی)بە مانا ڕاستەقینەی خۆی.

حاجی قادر دەڵێ :

غەم مەخۆ قوربان لەبۆ قوربانی عیدی وەسلی تۆ
موددەیەکە بەو ئومێدە(حاجی)خۆی دا بەستووە ! ![1]

شاعیرلەم دێڕە شیعرەیدا ئامادە بوونی خۆی چواندووە بە(دابەستن)کە بۆمەڕو ماڵات دەوترێ، کۆکەرەوەی ئەم هەردوکەش دەست دانیەتی بۆ بوونی بەقوربانی،ئینجا لەم کاتە کەدیمان هەردوکیان هاوبەشن لەم سیفەتەدا،دەبینین حاجی لەجیاتی بڵێ(حاجی خۆی ئامادەکردووە)

[1] دیوانی حاجی قادری کۆیی پێدا هاتنەوەی (هێرش بێتووشی) ل ٨٨

وتوویتی (حاجی خۆی دابەستووە) تاوتوێی خواستنەکەش بەم شێوەیە دەبێ:-

(دابەستن)کەچاوگە لێ خواستراو(پێ چوێنراو)ە ئامـاژەی بە کاری ڕابردووی (دابەستووە) بۆ کراوە، بۆخواستراو(چوێنراو)باس نەکراوەکەچاوگی(ئامادەبوون)ی بەمانا کاری ڕابردووی(ئامادەکردووە) کۆکەرەوەی نێوان لێ خواستراوو بۆخواستراویش ، بەکەلك هاتن و دەستدانە بۆقوربانی .

(حاجی)لەم دێرە شیعرەدا بکەرە بۆکاری ڕابردووی (دابەستووە)ی بەمانا ئامادەکردووە،بکەرنییە بۆ(دابەستووە)ی بەمانا ڕاستەقینەی خۆی.

**بۆ خواستن لەفەرمان و داتاشراوەکان بەپاشکۆیی دادەنرێ ؟**

بۆئەم وەلآمە زانایانی ڕەوابێژی عەرەبی دەڵێن: خواستن دامەزرانی لەسەرچواندنە، لەچواندنیش چوێنراوو پێ چوێنراودەبێ لەوەسفکردن و لەرووی لێکچوون(وجه الشبه)دا هاوبەشبن،چونکە ڕووی وێکچوون وەسفێکە ئەم هەردوو سەرە بەیەکەوە کۆدەکاتەوە، بۆیە دەبێ وەسفێکی چەسپاوو جێگیربێ، بەلآم کارە داتاشرا وەکان جگیریان نییە نە لەدەرەوەو نەلە ژێری مرۆڤ ،بەهۆی ئەو گۆڕانکاریە کاتیانەی ڕوو لە فەرمانەکان دەکەن و پەیوەست دەبن بە داتاشراوەکان،[1] هەروا دەڵێن تاوتوێکردن(إجراء الاستعارة)لەفەرمان و داتاشراوەکان بۆ هەمان ئەو تاوتوێیە دەگەڕێنەوە کەلەچاوگەکانیان دا دەکرێ،چونکە فەرمان و دا تراشاوەکان لە مانای بنەڕەتی خۆیان جیا نابنەوە کەچاوگەکانن،کەمانای بنەڕە تەکانیشیان بەهۆی خواستن گۆڕانی بەسەر داهات، مانای لقەکانیشیان کەکاروو

---

[1] علم البيان (د. بيسيونى عبدالفتاح فيود) ل ١٧٩-١٨٠

داتراشاوەکانن گۆڕانیان بەسەر دادێ، بۆیە تاوتوێی خواستن لەچاوگەکان دەکەن پێش ئەوەی لەکارەکان و داتراشاوەکان بکەن، هەروا دەڵێن: چونکەچاوگ مانایەکی سەربەخۆی هەیە شیاوی ئەوەیە پێشتر چواندن و خواستن لەوەوە دەست پێ بکات و تاوتوێ بکرێ.[1]

بەلام ئەوەی شایانی باسە(سەککاکی)ئەم خواستنەی بەنیشانەی خواستنی شاراوە داناوە بۆ ئەوەی درێژە بەدابەشکردنی خواستن نەدات[2] بۆ نموونە ئەم دێرەشیعرەی نالی کەبۆخواستنی پاشکۆیی هێنامانەوە بەپێی ڕای سەککاکی بەم شێوەیە دەبێ.(گوڵ) بۆ خواستراوە باس کراوە(مرۆڤ) لێ خواستراوە باس نەکراوە(پێکەنی)نیشانەی خواستنە شیاوی لێ خواستراوە،چونکەگوڵ پێناکەنی ئەوەی پێدەکەنی مرۆڤە، بەم شێوەیەش ئەوەی پێمان وت خواستی پاشکۆیی بوو بەنیشانەی خواستنی شاراوە.

ئەوەی لێرەماوە پێویست بەئاماژە بۆ کردن بێ (هەموو خواستنێکی پاشکۆیی دەبێ بەخواستنی شاراوە، تاوتوێی خواستن (إجراء الإستعارة)لەهەر کامەیان کرا لەوەی ترناکرێ).

بەهەر حاڵ ئەوەی باسمان کرد، ڕای زۆری زانایانی ڕەوانبێژی عەرەبی بوو، هەرچەندە ئەمەش جێگای قسەو ڕەخنەی هەندێکی ترە، بەلام لەبەر ئەوەی هیچ سوودێکی لەدرێژە پێدانی ئەم باسە نابینم نامەوێ زیاتری لەسەری بڕۆم .ئەوەی لێرە پێویستە بەئاماژە بۆکردن ئەم شێوازە بوونی بەرچاوی لەئەدەبی کوردیدا هەیە. بەلام بۆ ئەوەی

---

[1] علم البيان (د. بيسيونى عبدالفتاح فيود) ل ١٨٠

[2] جواهرالبلاغة ( احمد الهاشمى) ل ٣٢٤

دوور کەوینەوە لە درێژە پێدانی تاوتوێ کردنی ئەم جۆرە خواستنە رای سەککاکی بەلامەوە پەسندە.

## دابەشکردنی خواستن بۆ :

١- خواستنی هاتنەدی/الإستعارة التحقيقية:

ئەوەیە: بۆ خواستراو لەشتەکی زانراو وەرگیرابێ لەوانەبێ لەڕێگای هەست و هۆشەوە ئامازەی پێ بکرێ.[1]

مەحوی دەڵێ :

غـــونچە دەمـــی لـــەباسی تـــۆ دا، صەبـــا
مشـــتێکی دالـــە دەمـــی، دەم قســـەی زلی شـــکا([2])

واتـە: غونچـە ویسـتی باسـی دەمـی تۆبکـاو دەمـی خـوی بـەدەمی تـۆ بچوێنی لەجوانی و بچووکیدا، بای بەیانی ئەم ویستەی غونچەی بەلاوە ناو، بەڕاستی نەزانی بەلای شتێکی سەیر بوو،چۆن دەمی یار بەو هەموو جـوانی و بچووکیەوە،خونچـە خـۆی لـە ئاسـت بـدات ؟ بۆیـە خـۆی پـێ نەوەسـتا مشتێکی دا بەدەمی پشکوواندی و دەمی پێ کردەوە، ئەم لێ دانەشی هـەر بۆ ئەمەبوو بیکا بەگوڵ و چیتر لاسای دەمی تۆ نەکاتەوەو، پاش چەند ڕۆژ یکیش بوەرێ و لەناو بچێ .

**خواستن لەم شیعرەدا :ـ**

١-(غونچـــە) چـــوێنراو (بۆخواستراو)ە،(مرۆڤـــ)پێ چـــوێنراو(لێ خواســتراو)ەباس نــەکراوە پەیوەسـتێکی هـاتووە ئەوەیـە دەڵێ:(دەمـی

---

[1] جواهر البلاغة ( احمد الهاشمی) ل ٣٢٤

[2] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلاعبد الكريمی مدرس ل ٢١

لەباسی تۆ دا) چونکە دەم لەباس دان پەیوستە بەمرۆڤ ، لەهەمان کاتیشدا ئەم پەیوەستە دەبێ بەنیشانەی خواستن، خواستنیش کەبەم شێوەیەبێ دەبێ بەخواستنی شاراوە، لەهەمان کاتیشدا خواستنێکی (هاتنەدی) ڕاستەقینەیە چونکە بۆخواستراو (غونچە) شتێکی بەرجەستەو هەست پێ کراوە.

٢-(صەبا) چوێنراو (بۆ خواستراو)ە،(مرۆڤ) پێ چوێنراو(لێ خواستراو)ە باس نەکراوە ، پەیوەستێکی هاتووە ئەوەیە دەڵێ : (مشتێکی دا لەدەمی ) هەر ئەم پەیوەستەش نیشانەی خواستنە، خواستنەکەشمان خواستنێکی شاراوەیە، لە هەمان کاتیشدا خواستنێکی هاتنەدیٚ یە.چونکە(صەبا) کەبایە شتێکی هەست پێ کراوە .

یاوەك حاجی قادر دەڵێ :

با لەهەردوو لا زولفت باوە شینی لێ نەکا

مێشی خاڵت نافڕێ، پابەندی شەهدی ڕائیقە([1])

شەهدی ڕائق: هەنگوینی ساف .

واتە: پێویست ناکات هەردوو لای زولفەکانت باوەشینە بکات بۆ ئەوەی ئەم خاڵەی کەوەك مێش وایە لەڕەشیدا لەسەر ڕووی ناسك و سپیت بە دووای تام و چێژی شیرینی لێوەکانت،خۆت ماندوو بکەی بۆ فڕینی،کارێکی بێ سوودە نافڕێ،چونکەپابەندو چاوەڕوانی تام و چێژی شیرینی هەردوو لێوی وەك هەنگوینی سافتە،

[1] دیوانی حاجی قادری کۆیی/ پێداهاتنەوەی هێرش بێتووشی/٨٠

خواستن لەم شیعرەدا

أ- (زولف)چوێنراو(بۆخواستراو)ە،بەمرۆڤ چوێنراوە(مرۆڤ) پێ چوێنراو(لێ خواستراو)ە باس نەکراوە پەیوەستێکی هاتووە ئەوەیە دەڵێ:(باوەشێنی لێ نەکا) نیشانەی خواستنیش هەر ئەم پەیوەستەیە،خواستنەکەمان شاراوەیە لەهەمان کاتیش خواستنێکی هاتنەدی یە.چونکە زولف شتێکی هەست پێ کراوە .

ب-(شەهد)پێ چوێنراوە،(لێ خواستراو)ەباس کراوە(شیرینی) چوێنراوە، (بۆخواستراوە) باس نەکراوە، نیشانەی خواستن ئەوەیە دەڵێ(مێشی خالت نافڕێ) چونکەخالی دەم و چاو لەوانە نییە بفڕێ و لەدەم و چاو جیاواز بێتەوە، بەم شێوەیە ئەم خواستنەدەبێ بەخواستنێکی ئاشکرا، لەهەمان کاتیشدا خواستنێکی هاتنە دێ یە، چونکە بۆخواستراو (شیرینی) شتێکی هەست پێ کراوە .

نموونەیەکی تربۆئەوەی بۆخواستراولەڕێگای هۆشەوە بزانرێ وەك حەمدی دەڵێ :

(إهدنا) بۆ ڕێی (الصراط المستقیم) تۆ بێ خودا
بۆ ئیراڵەی ڕێی (صراط الذین) ڕەحمەتێ[١]

(الصراط المستقیم) ڕێگای ڕاست پێ چوێنراوە،(بوخواستراو)ە هاتووە مەبەست ئایینی ئیسلامە،ئایینی ئیسلام چوێنراوە(بۆخواستراوە)،نیشانەی خواستن (إهدنا)یە، چونکە مەبەست لەداوای هیدایەت و ڕێ نیشاندان ئایینی ئیسلامە، بەم شێوەیە ئەم خواستنە دەبێ بەخواستنێکی ئاشکرا، لەهەمان

---

[١] دیوانی حەمدی لێکۆڵینەوەی جمال محمد محمد أمین ل ٦٠

کاتیشدا خواستنێکی هاتنەدیٚ یەچونکە بۆخواستراو ئایینی ئیسلامە بەهۆش و ژیری مرۆڤ دەزانریٚ .

٢–خواستنی ڕامانی/ئەندێشە/الإستعارةالتخييلية:

جێگیرکردنی پەیوەستی پیٚ چوێنراوە لەچوێنراوکەلەهەست و ژیری مرۆڤ بوونی نەبیٚ.[١]

نالی دەڵیٚ :

دەس بەندیانە دێن و دەچن سەرو و نارەوەن،
یاحەڵقەیانە صوٚفی مل خوارو مەندە بوٚر([٢])

(نالی) لەم دێڕە شیعرەیدا(سەروو نارەوەن)ی بەکوڕە لاوان چواندووە لەکاتی هەڵپەرکیٚ و دەست بەندیان،چونکە کۆکەرەوە(ألجامع) ئەو جوولەو بەلادا چوونەیە کە لەنێوان هەردووکیان داهەیە، واتە:چۆن (کوڕەلاوان) لەکاتی هەڵپەرکیٚ دا بەولا بەولا دادەچن، بەهەمان شێوە(سەرو و نارەوەن )کە با لێیان دەدات هەمان جولەیان هەیە(کوڕە لاوان ) بەخەیاڵ بۆ (سەرو ونارەوەن) خواستراون، باس نەکراون بەپەیوەستێك ئاماژەیان بۆ کراوە کەهاتن و چوونە کەوابیٚ(سەروو نارەوەن) چوێنراو (بۆخواستراو)ن (کوڕەلاوان) پیٚ چوێنراو(لیٚ خواستراو)ن باس نەکراون، نیشانەی خواستن ئەوەیە دەڵیٚ (دەس بەندیانە دێن و دەچن، بەم شێوەیە ئەم خواستنە دەبیٚ بەخواستنێکی شاراوە،لە هەمان کاتیشداخواستنێکی ڕامانی( ئەندێشە)یە واتە: بەخەیاڵ (سەرو ونارەوەن) بەکوڕە لاوان دانراون،دەس

١ علم البيان (د. بيسيوني عبدالفتاح فيود) ل ١٧٢

٢ دیوانی نالی لێکوڵینەوەی مەلاعبد الکریمی مدرس ل١٩١

بەندی و هاتن و چوونیان بۆ لەبەر چاوگیراوە، پەیوەستی پێ چوێنراو بەخەیاڵ لە چوێنراو کە (سەرو و نارەوەن) ن جێگیرکراوە، بەم شێوەیە ئەم خواستنە بوو بەخواستنێکی ڕامانی،چونکە (دەس بەندی و هاتن و چوون بۆ(سەروو نارەوەن) نەبەهەست و نەبەژیری درکی پێ ناکرێ .

یاوەك ئەبوو ذوئەیب دەڵێ :

وإذا المنية أنشبت أظفارها          ألفيت كل تميمة لاتنفع[1]

منیش بەوەرگێڕانەوە بەکێش و بڕگەی کوردی دەڵێم :

گەر مردن چنگی لەهەرکەس گیربێ ــ بێ سوودە هەر جۆر نووشتەی پشت گیربێ (مردن) لەم دێڕدا بەدڕندە چوێنراوە،چونکە کۆکەرەوە(ألجامع)کە لەناو بردنە، لە هەر دووکیان داهەیە،واتە:چۆن دڕندە توانای لەناو بردنی هەیە،بەهەمان شێوە مردنیش توانای لەناو بردنی هەیە،(دڕندە بەخەیاڵ بۆ مرۆڤ خواستراوە، باس نەکراوە، بەپەیوەستێك ئاماژەی بۆکراوەکە(چنگ)ە کەوابێ مردن بۆ خواستراوە چوێنراوە(دڕندە)لێ خواستراوە پێ چوێنراوە،باسی نەکراوە، نیشانەی خواستن (چنگ)ەبەمەش خواستنەکەمان دەبێ بەخواستنێکی شاراوە، لەهەمان کاتیشدا خواستنێکی ڕامانییە واتە: بەخەیاڵ مردن بەدڕندە دانراوەچنگی وەك چنگی ڕاستی بۆ لەبەر چاوگیراوە، پەیوەستی پێ چوێنراو(لێ خواستراو)بە خەیاڵ لە(چوێنراو، بۆخواستراو) جێگیرکراوە، بەم شێوەیە خواستنەکەبوو بەخواستنێکی ڕامانی،چونکە(چنگ) بۆ مردن نە بەهەست و نەبەژیری درکی پێ ناکرێ.

---

[1] جواهر البلاغة (أحمد الهاشمي) ل ٣٠٩

**دابەشکردنی خواستن بە پێی چەند جۆرێکی جیای لێ خواستراو و بۆ خواستراو:**

١– خواستنی ڕازاوە/ألموشح : خواستنێکە لێ خواستراو بەگونجاوێك یابە زیاتر لەگونجاوێك ڕازابێتەوە.[1]

مەبەست لەگونجاو ئەوەیە: لێ خواستراو لەڕستەدا بەشێوەیەك وەسفی بکرێ و برازێتەوە گوێگر و خوێنەر بتوانن دەست نیشانی بکەن.ئەم خواستنە بە(پالێراو، ألمرشحة)ش ناوبراوە، ئەوەی شایانی باسە خواستن چ ئاشکرابێ یان شاراوە بێ بە خواستنی ڕازاوە ناونابرێ تانیشانەی خواستنی خۆی وەرنەگرێ، ئەم نیشانەیەش چ و تراوبێ لەڕستەدا،یان نەوترابێ لەڕەوتی ڕستە دەرکەوێ.[2]

مەلا طاهیر بەحرکەیی دەڵێ :

دەڵێی زانست گوڵستانەو نەزانین تاریکستانە
سەیرکە باغ و بستانە،نەزەرگەی لاوو مەردانە([3])

لەم دێڕە شیعرەدا خواستنێکی ئاشکرا(الإستعارة المصرحة)هەیە(باغ وبستان) پێ چوێنراو( لێ خواستراو)ەباسکراوە، زانست (بۆخواستراو)ەچوێنراوە باس نەکراوە، نیشانەی خواستن نیوەدێڕی یەکەمە شیاوی چوێنراوە کەزانستە، شیاوی پێ چوێنراو نییە کەباغ و بستانە لەهەمان کاتیشدا ئەم خواستنە خواستنێکی ڕازاوەشە،چونکە ڕازاوەتەوە بەشیاوو گونجاوی(لێ خواستراو) پێ چوێنراو.

---

[1] علم البیان ( عبدالعزیز عتیق.د). ل ١٢٨
[2] هەمان سەرچاوە /١٣٢
[3] دیوانی مەلا طاهر (بەحرکەیی) ل ٧٨

هێمن دەڵێ:

شـــاعیرێـــکی ڕاســـــت و یەکـــڕۆم فیـــداکـــارو نەبـــەز
کوردە موحتاجی مەحەك نیم زێری بێ غەلل و غەشم[1]

مەحەك: بەردێکە بۆ زانینی عەیاری زێرو زیو بەکار دەهێنرێ

واتـە: مـن شـاعیرێکی پـاك و بێگـەردو گیـان بـەخش و چـاو نەترسـم لەهـەمان کاتیشـدا وشـەی شـیعرم تـەنها بـۆ دەربڕینـی ڕاسـتی و گەیشـتن بەئامانجی ڕاستەقینەی کوردو کوردستان بووە،شاعیرێکی دوو ڕوو نەبوومە هەر ڕۆژێك بۆ بەرژەوەندی خـۆم وشـەکانم لەشـتی نـاڕەواو بەرزکردنـەوەی کەسانی خاوەن دەسەلات بێ،کەوابێ برای کـوردم مـن جێگـای گومـان نـیم وەك ئەو زێرە وام کەفێڵ و غەشی لەگەلا نەکرابێ، زێریش کەبـەم شـێوەیە بـێ پێویسـت بەمەحـەك نـابێ، منـیش بەهـەمان شـێوە پێویسـت بـەتاقی کردنەوە نیم .

(مەحــــــەك)لێ خواســــــتراوە، پــــــێ چــــــوێنراوە(تاقیکردنەوە) بۆخواستراوە،چــــوێنراوە، خواستنەکەئاشــــکرایە لەهــــەمان کاتیشــــدا ڕازاوەیە(پالێراو)ەچــونکەدەڵێ(زێڕی بــێ غــەلل و غەشــم ئــەم هــەردوو سیفەتەش شیاوی لێ خواستراوە.

٢-خواسـتنی ڕووت: پـەتی(ألمجـردة)ئـەو خواسـتنەیەجگە لەنیشـانەو پەیوەسـتی خواسـتن گونجاوێـك یـان پـتر هـاتبێ سـەر بە(چـونێراو) بۆخواستراوبێ.[2]

---

[1] تاریك وڕوون( هێمن) ل ١١٥

[2] علم البیان (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ل ١٨٩

ئەم خواستنە بۆیە پێی دەوترێ ڕووت چونکە لەو کاتە بەدووای لێ خواستراو دێ سەر بەبۆخواستراوە،لێ خواستراو رووت دەکاتەوە لە هەندێك زیادەڕەوی، (چوێنراو)لە(پێ چوێنراو) دوور یەکی بەخۆیەوە دەبینی، دەبێ ئەوەش بزانین پاش ئەوەی خواستن نیشانەی خۆی وەرگرت و گونجاوی ترمابوو، سەر بەبۆخواستراو بوو ئینجا پێی دەوترێ (خواستنی ڕووت)[1]

نالی دەڵێ:

گەنجینەیی نێوسینە،ڕەنگینەبەصەد کینە
ئەی لەککەیی ئایینە،یارەبی بەغارت چی

لەککە: پەلە.ئایینە: ئاوێنە.

((واتەگەنجینەی ناوسنگت کەدڵتە صەد پەڵەی چڵکنی ڕقینەی لەدڵدارانت لێ نیشتووە و ،وەك ڕەنگی بەسەرا کرابێ پێی ڕەنگاوی بووە .. دەسائەی کینەی ناو دڵی یار کە بووی بەپەڵە بەسەر ئاوێنەی دڵبەرەوە، لەخوام دەوێ بەتاڵان بڕۆیت و، دڵی یار پاك بێتەوە لێت !))[2]

(نالی لەم دێڕەدا(گەنجینە)ی بۆ دڵ خواستووە دڵ : بۆ خواستراوە و گەنجینە لێ خواستراوە(نێوسینە)پەیوەستی بۆ خواستراوە، هەروەهادەر بڕینی(بەصەد کینە)لەگەڵ بۆخواستراو گونجاوە، ئەم جۆرە خواستنە پێی دەوترێت خواستنی ڕووت.

---

[1] جواهر البلاغة ( أحمد الهاشمی) ل ٣٣٠-٣٣١

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٦٤٤

٣-خواستنی ئازاد:

ئەو:خواستنەیە بۆ خواستراو و لێ خواستراو هیچ گونجاوێکیان بەدووادا نەهاتبێ یان گونجاوی هەردووکیان بەیەکەوە هاتبێ وینەی یەکەم کەگونجاویان نەهاتبێ.[1]

حەمدی دەڵێ :

بۆ دڵم لەت لەت نەبێت؟! بۆ نەچی عومرم بەباد؟!
من پەرێشانی زولف بم شانەیی شمشاد شاد!([2])

مانای وشە: شمشاد: دارێکەلەناوچەی هەورامان بەزۆری شانە لەو دارە دروست دەکرێت، چونکە دارێکی بێ گرێ یە.[3]

واتە: دڵم چۆن پارچەپارچە نەبێت و تەمەنم بانەیبا، من پەرێشانی زولفی یار بم و داری شمشادیش بەشانە کردنی ئەم زولفە شادبێ بەڕاستی سەیرە !؟

لەم دێرەشیعرەدا دوو خواستن هەیە:

١-(عومر) چوێنراوە بەپل و پووش، واتە(عومر)بۆخواستراوە چوێنراوە، پل وپوش لێ خواستراوە پێ چوێنراوە(بەباد) پەیوەستی لێ خواستراوە دراوە بە بۆ خواستراو لەهەمان کاتیشدا نیشانەی خواستنە، شیاوی لێ خواستراوە،چونکە با شتی وەك پرش و پەلاش دەبا، شیاوی بۆخواستراو نییە چونکە(عومر) شتێك نییە با بیبا، بەم شێوەیە

---

[1] علم البیان (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ١٨٨

[2] دیوانی حەمدی لێکۆڵینەوەی جمال محمد أمین ل ٢٤١

[3] هەمان سەرچاوە ل ٢٤١

خواستنەکە دەبێ بەخواستنێکی شاراوە، خواستنێکی ئازادیشە چونکە گونجاوی هیچیان نەهاتووە لەچوێنراووپێ چوێنراو.

٢–(شـــانەی شمشـــاد)بەمرۆڤ چـــوێنراوە واتە(شـــانەی شمشاد)بۆخواســتراوە چـوێنراوە،مرۆڤ (لێ خواســتراو) پـێ چـوێنراوە نەهاتووە،(شاد)پەیوەسـتی لێ خواسـتراوە دراوە بەبۆخواسـتراولەهەمان کاتیشدا نیشانەی خواستنەو شیاوی لێ خواستراوە ، چونکەمرۆڤ شاد دەبێ شیاوی بۆخواسـتراو نییـە چـونکە داری شمشـاد شـادنابێ بـەم شـێوەیە خواستنەکەدەبێ بەخواستنێکی شاراوە، هەرواخواسـتنی ئازادیشـە چـونکە گونجاوی هیچیان لەچوێنراوو پێ چوێنراو نەهاتووە.

نموونـەی خواسـتنی ئـازاد کـەگونجاوی هـەردوکیان بۆخواسـتراوو لێ خواستراو هاتبێ وەك :

مەحوی دەڵێ:

مـــاهی مـــن ڕۆژی لـــەڕوو لادا نیقـــاب
شـــەو مەگـــەر هـــەڵبێ لەشـــەرمان ئافتـــاب

مانای وشە: نیقاب: سەرپۆش. ئافتاب:خۆر .

واتە(( یارەکـەی مـن مانگە،بـەلآم مـانگیکی وایـە ئەگـەر ڕۆژێ لـەڕۆژان پەردە لەڕووی هەڵماڵێ تیشکی خۆر بێ بایەخ دەکاو ئیتر خۆر لەشـەرمان مەگـەر هـەر بەشـەو هەڵبێ کـەکـەس نەیبینێ))[1]

[1] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلاعبد الکریمی مدرس ل ٤٥

مەحوی یاری خۆی لەجوانی و تیشك دانەوە بەمانگ (ماە) چواندووە (ماە) لێ خواستراوە (یار) بۆخواستراوە، نیشانەی خواستن (من)ە چونکە شاعیر دەڵێ(ماهی من) خواستنەکەمان خواستنێکی ئاشکرایە لەهەمان کاتیشدا خواستنێکی ئازادیشە، چونکە کەدەڵێ لەڕووی لادا نیقاب لەگەڵ یاردا دەگونجێ و شیاوی ئەوە، شیاوی لێ خواستراو نییەکەماهی ڕاستەقینەیە ماهی ڕاستەقینە سەرپۆش لانادا.وشەی (ئافتاب) کەلەدێڕی دووەم هاتووە شیاوی لێ خواستراوە کەماهە، چونکە لەنێوان مانگ و ڕۆژدا گونجاوی هەیە.

صافی دەڵێ :

جوێباری چاوەکانم ڕووی زەمینی گرتووە
بۆیە صەحرای سینەکەم سەبزە غەمی شین کردووە

مانای وشە: جوێبار: جۆبار- جۆگای ئاوی زۆری لێبێت .

واتە((چاوەکانم هێندە بەگوڕ ئاو دەپێون و دەبارێنن، تاوایان لەسینەی من کردووە گیاو گژ دەربکات هێندەی ئاو بدرێ، بەلأم لەبەر ئەوەی ئاوەکە فرمێسکەو، فرمێسکیش لەئەنجامی گریان و غەم پەیدا بووە، بۆیە ئەو گیاوکژەی سینەی من گیای غەمە،نەك گیای شادی و بەختەوەری))[1]

شاعیر لەم دێڕە شیعرەیدا فرمێسکی چاوەکانی بەڕووبار چواندووە کەواتە فرمێسك بۆ خواستراوە(چوێنراوە)(جوێبار)لێ خواستراوە(پێ چوێنراوە) نیشانەی خواستن ئەوەیە دەڵێ:(چاوەکانم)،چونکە چاو

---

[1] دیوانی صافی لێکۆڵینەوەی محمد مصکفی هیرانی ل ٢١٥

فرمێسکی لێ هەڵدەقوڵێ نەوەک ئاو، بەمەش خواستنەکە دەبێ بەخواستنێکی ئاشکرا، لەهەمان کاتیشدا خواستنێکی ئازادە دووگونجاوی لێوە هاتووە یەکیان سەر بەلێ خواستراوە ئەوەیە دەڵێ ڕووی زەمینی گرتووە،چونکە ئاوی ڕوبار ڕووی زەوی دەگرێ نەوەک فرمێسک، ئەوەی تریان سەر بەبۆخواستراوە ئەوەیە دەڵێ:( سەحرای سینەکەم سەبزە غەمی شین کردووە) گونجاوی بۆخواستراوە چونکە فرمێسک پەیوەندی بەغەمەوە هەیە.

## خواستن بە پێی هەستی و ژیری

خواستن بەپێی هەستی و ژیری لێ خواستراوو،بۆخواستراو: وەك ئەم شێوانەیەی خوارەوە دەبێ :

١– خواستنی هەست پێکراو بۆ هەست پێکراو :

مەحوی دەڵێ :

مەگەر تۆ عەرضی حاڵم کەی لەکن یار
قەلەم ساغی قسە من نیمە یارا

یارا: توانا.

واتە:(ئەی قەلەم من خۆم ناتوانم،مەگەر تۆحاڵم لای یار باس بکەیت و حاڵی دەردمی بۆ بنووسی و داوای لێ بکەی جارێ ناوم بهێنی.))[1]

مەحوی لەم دێڕە شیعرەیدا قەڵەمی بەمرۆڤی خاوەن توانا چواندووە،(قەلەم) بۆ خواستراوە چوێنراوە( مرۆڤ) لێ خواستراوە پێ

---

[1] دیوانی مەحوی دیوان لێکۆڵینەوەی مەلاعبد الکریمی مدرس ل٩

چـوێنراوە، باسـی نـەکراوە پەیوەسـتێکی هاتووەکەعـەرضـی حـاڵ و قسـەکردنە، ئەمـەش بـۆ مـرۆڤ دەبـێ نـەك بـۆ قەلـەم ، ئـەم خواسـتنە کەخواستنێکی شاراوەیە خواستنێکی هەستیشـە بـۆ هەسـتی، بۆخواسـتراو کە (قەلەمە)و لێ خواستراو کەمرۆڤە هەردوکیان هەست پێکراون .

٢-خواستنی هەست پێکراو بۆ ژیری:

مەحوی دەڵێ :

بـرافــکری چـــرا کیبریتــی فرصــەت تــا لەدەستـــایە
شــەوی یەلــدا لەپێشــە، ڕۆژی عـومرت وەختـە ئـاوابێ

کبریت: شقارتە. یەلدا: تاریکی .

واتە((بـــرا تـــا شـــقارتەی هەڵـــت بەدەســـتەوەماوە ودنیـــات جـــێ نەهیشـتووە، بـیر لەداگیرسـاندنی چـرای چـاکەکاری بکەرەوە،بەتیشـکی کردەوەی جوان پێش ڕۆیشتنت گۆڕەکەت ڕووناك بکە، بزانـە زۆرت نـەماوە شەوی تاریکت لەپێشە ڕۆژی تەمەنت لەسەر ئاوابوونە))[١]

مـەحوی لـەم تابلۆیـە جوانـەی پـڕ لـە ئامـاژەی ئامۆژگـاری و ئاگـادار کردنـەوە،کردەوەی جـوانی بەچـرا چواندووە،(چـرا) لێ خواسـتراوە پـێ چـوێنراوە (کـردەوەی چاك)بۆخواسـتراوە چـوێنراوە بەڵگـەی خواسـتن ناوەڕۆکی شیعرەکەیە لەپاڵ ئەوەی کەخواسـتنەکە ئاشـکرایە خواسـتنێکی هەستیشە،چرا کەهەستی یە بۆ کردەوەی چاکی خواستووە کەژیری یە.

---

[١] دیوانی مەحوی دیوان لێکۆڵینەوەی مەلاعبد الکریمی مدرس ٢٩٦

یاوەك دەڵێ:

وتم: عیشـــــق ئـــــاگری بەردایــــــە وجـــــودم
وتـــــی: هـــــەر بابـــەتی ســـــووتانە خاشـــاك[1]

خاشاك:پل و پووش .

مـەحوی لـەتابلۆی ئـەم دێـرە شـیعرەیدا دەڵـێ: بـەیارم وت سـۆزی عشقت ئـاگری تـێ بـەرداوم یاریش وتـی: بـونی تـۆ وەك پـل و پـووش و خاشاك وایە خاشاكیش هەر بۆ سوتان باشـە،كەوابێ مـەحوی تـۆش هـەر بۆ سووتان باشی .

(عیشـــق) بـۆخواســـتراوە چوێنـراوە(مـــرۆڤ) لێ خـــواستراوە ، پـــێ چـوێنراوە نـاوی نـەهاتووە، پەیوەسـتێكی هـاتووە كەئاگرە،چـونكە مرۆڤ توانای ئاگر تێ بەردانی هەیە نەوەك عیشق، لەپاڵ ئەوەی كەئەم خواسـتنە خواستنێكی شـاراوەیە لەهـەمان كاتیشـدا خواسـتنێكی هەسـت پـێ كـراوە كەمرۆڤە بۆ ژیری كەعەشقە .

٣–خواستنی ژیری بۆ هەستی

مەحوی دەڵێ :

زاهیـــد ئـــــەو زولفـــــەی لەســــــەر ڕوو دی وتــــی:
كـــوفری وا ڕووپۆشـــی ئـــەم ئیمانـــە بـــۆچ ! ؟[2]

---

[1] هەمان سەرچاوە ل١٨٧
[2] هەمان سەرچاوە ل٩٧

لەنیوە دێڕی ئەم شیعرەدا دوو خواستنی ئاشکرای ژێری بۆ هەست پێکراو هەیە:

أ- (کوفر) لێ خواستراوە، پێ چوێنراوە باسکراوە (زولف) بۆ خواستراوە، چوێنراوە

باس نەکراوە، نیشانەی خواستن نیوەدێڕی پێشووە، شیاوی لێ خواستراو نییەکە کوفرە، شیاوی بۆ خواستراوە کە(زولفە)لەگەڵ ئەوەی کەئەم خواستنە خواستنێکی ئاشکرایە لەهەمان کاتیشدا خواستنێکی ژێریە،کوفر کەژێریە بۆ هەست پێ کراو خواستراوە کەزولفە.

ب-(ئیمان)لێ خواستراوە، پێ چویتنراوە(ڕوو) بۆخواستراوە. چوێنراوە باس نەکراوە، نیشانەی خواستن نیوە دێڕی پێشووە، شیاوی لێ خواستراو نییە کە(ئیمانە) شیاوی بۆخواستراوە کە(رووە)،لەگەڵ ئەوەی کەئەم خواستنە ئاشکرایە لە هەمان کاتیشدا خواستنێکی ژێریە،(ئیمان) بۆ هەست پێ کراو خواستراوە کە(ڕووی یارە).

٤- خواستنی ژێری بۆ ژێری :

مەحوی دەڵێ :

بە ئوغرکردنی من بوومە قەقنەس

کەئەوچوو بۆ سەفەر،من بۆسەقەر چووم

مانـــای وشـــه: قەقنـــەس:دەڵێن: پەلەوەرێکــە ئەوەنـــدە دەفـــڕێ و بەرزدەبێتــەوە تــاتینی خــۆر دەیســووتێنی و دادەکــەوێ. ســەقەر: دۆزەخ .مەبەست ئاگری دووریە))[1]

واتە: لەوکاتە یارم لاڕۆیی و گەشتی کرد، مـن وەك باڵنـدە ی قەقنـەس بەرز بوومەوە تاتینی خۆر سوتاندمی و چووم بۆ ئاگری دۆزەخی دووری.

لــەم دێـــڕە شـــیعرە دا (ســـەقەر) کەدۆزەخـــە لێ خواســـتراوە، پـــێ چـــوێنراوە(ئاگری دووری) بۆخواســـتراوە، چـــوێنراوە نیشـــانەی خواســـتن نـــاوەرۆکی شـــیعرەکەیە، ئـــەم خواســـتنەمان خواســـتنێکی ئاشـــکرایە.لێ خواستراو کە(سەقەرە) بۆخواستراو کە(ئاگری دووریە) هەردووکیان ژیرین.

**دابەشکردنی خواستن بە پێی گیانداری و بێگیانی بۆخواستراوو لێ خواستراو :**

بەکارهێنانی هونـەری ڕوونبێـژی سـنووری تایبـەتی بـۆ نییـە، هـەروەك دەبینین ئەدیب و شاعیری مەزن و راستەقینە، دەتوانی لە هەموو مەیـدانێك سوارچاکی خـۆی ئـەنجام بـدات، تـابلۆی شـیعری سـەرنج ڕاکـێش دروسـت بکات،بەوشـەی پـڕ لـە هەسـت و سـۆزو خـەیاڵ ، وینـەی وا بەرهـەم بێنـی جێگای سەرسووڕمان و بـیر لێ کردنـەوە بـێ، بێگیـان وەك گیانـدار نیشـان بـدات،مانگ و ڕۆژو دارو درخـت و گـوڵ ...وەك مـرۆڤ تەماشـابکات و بیـان دوێنـێ ، تایبەتیەکانی مرۆڤیان پـێ بـدات، پۆشـاکیان لەبـەربکات، پـەڕوباڵ بۆ بێ باڵ درووست بکات،کەئەمانە هیچیان بوونیان بۆ نییە تەنها بەخـەیاڵ نەبێ وەك :

---

[1] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلاعبد الکریمی مدرس ل٢٢٦

١ – خواستنی گیانداربۆ بێگیان :

نالی دەڵێ :

مووی سپی کردم بەشوشتن ئاوی عەینی شۆڕە شەط
شۆڕە شەط یەعنی کەتێدا خودبەخود قەل بوو بەط

مانای وشە : شوشتن: شۆردن. عین:چاو.کانی. وەك .شۆڕە شەط : سوێرەچەم ، فرمێسك . خود بەخود: لەخۆیەوە. قەل: قەلەڕەش.مەبەست ڕشێنەی چاوە.بەط : مراوی، مەبەست سپییە.[1]

((واتەئاوی فرمێسکی چاوم ئەوەندەی ڕووبارێکی سوێری زۆرە، بەهۆی گریانی زۆر مەوە،ئەوەندە بەسەر ڕیشما هاتووەتە خوار، ڕەنگەکەی شتووتەوە و سپی کردووەتەوە. ڕووباری سوێری فرمێسکم،ئەو ڕووبارەیە ئەوەندە سوێرە کەئەگەر قەلەڕەشی تێ بچی، لەبەر زۆری خوێ، هەر لەخۆیەوە تیاسپی ئەبێتەوە و ئەبێ بەمراوی، وەك چۆن ڕەشێنەی چاوی منی تیاسپی بو وەوە وکوێر بوو ترووسکەی لێ بڕا.))[2]

نالی لەم دیڕە شیعرەیدا دوو خواستنی ئاشاکرا(ألإستعارة المصرحة) ی بەکارهێناوە لە هەر دووکیشیان خواستنی گیاندارە بۆ بێگیان :

١- (قەل)پێ چوێنراو(لێ خواستراو)ە باسکراوە،(ڕەشێنەی چاو)چوێنراوە (بۆ خواستروە)باس نەکراوە نیشانەی خواستن(عەین)ە. بەم شێوەیە خواستنەکەمان دەبێ بەخواستنێکی ئاشکرا،لەهەمان کاتیشداخواستنی گیاندارە کە(قەلە) ڕەشە بۆ بێگیان کە(ڕەشێنەیە)

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٢٤٢

[2] هەمان سەرچاوەل ٢٤٢

٢–(بەط)مراوی پێ چوێنراوە (لێ خواستراوە)باسکراوە (سپی چاو)چوێنراوە (بۆ خواستراوە)باس نەکراوە نیشانەی خواستن (مووی سپی یە) لەهەمان کاتیشدا خواستنی گیاندارە بۆبێگیان .

٢–خواستنی بێگیان بۆگیاندار :

نالی دەڵێ :

ماهی من تەنها مەهێکە صەد نجوومی مەحو کرد!
یاری من تەنها گوڵێکە صەد هەزاری گرتووە!

واتە((یاری دڵبەری من مانگێکی تاقانەیە، بەڵام ڕوناکییەکەی سەد ئەستێرەی لەناو بردووە و فەوتاندووە.تاقە گوڵێکە بەڵام سەد گوڵی گرتووە و بۆ هەر کوێیەکی ئەڕوانی گوڵێکە بۆی. یاخود سەد دڵداری گیرۆدە کردووە))[١]

(ماه)لێ خواستراوە پێ چوێنراوە(یار) بۆخواستراوە چوێنراوە باس نەکراوە نیشانەی خواستن ئەوەیە دەڵێ:(یاری من) کەشیاوی بۆخواستراوە بەم شێوەیەش خواستنەکەمان دەبێ بەخواستنێکی ئاشکرا، لەهەمان کاتیشدا خواستنی بێگیانە کەماهە بۆ گیاندار کەیارە.

٣–خواستنی بێگیان بۆ مانای واتایی :

نالی دەڵێ:

گەر نییە ئاور لەسینەمدا بەتاو
بۆچ لەبەر قولقول غەریقی ئاوم ئەز؟!

مانای وشە:ئاور:ئاگر. قوڵقوڵ: قوڵەقوڵ دان. غەریق: خنکان .

---

[١] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٥٣٩

واتە :گەرئاگری عیشق لەدروونمدا بەتاو نییە بۆچی لەبەر قوڵدانی مەنجەڵی سینەم لەئاودا نوقم بووم؟!مەبەستی لەفرمێسکی چاوە کانیەتی))[1]

نالی لەم دێڕەدا(ئاوری) بۆ سۆزی عیشق خواستووە (ئاور)لێ خواستراوە پێ چوێنراوە(سۆز)بۆخواستراوە چوێنراوە باس نەکراوە،نیشانەی خواستن ئەوەیە دەڵێ: (لەسینەم) شیاوی بۆخواستراوە،چونکە ئاگری ڕاستەقینەلەسینەنابێ سۆز لەسینە دەبێ، ئەم خواستنە کەڕاستەقینەیە لەهەمانکاتیشدا خواستنی بێگیانەکەئاگرە بومانای واتایی کە(سۆزە)

٤-خواستنی بێگیان بۆبێگیان

حاجی قادردەڵێ :

تالەمەکتەب ئەو مەهەم مەشقی ئەلف و بێ دەکا
چاوەکەم بویتە دوێت و گریەسورخی تێ دەکا([2])

(سورخ) لێ خواستراوە،پێ چوێنراوە باسکراوە(فرمێسکی سوور) بۆخواستراوە چوێنراوە، نیشانەی خواستن (گریە)یە شیاوی چوێنراوە کەفرمێسکە.لەوکاتە کەخواستنەکە ئاشکرایەخواستنی بێگیانیشە بۆبێگیان.

---

[1] دیوان نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٢٢١

[2] دیوان حاجی قادری کۆیی پیداهاتنەوەی هێرش بێتووشی ل ٣٤

٥–خواستنی گیاندار بۆ گیاندار:

جزیری دەڵێ :

ئەودڵـــێ مـــن نابـــتن، کـــەس لومەکـــەت
لـەودفی تـوری وە، داکـەفتی مـەدین سەدشـەهباز([1])

(شـەهبان)ڵێ خواسـتراه پـێ چـوێنراوە ،هـاتوە (پیـاوی ئـازا) بۆخواسـتراوەپێ چـوێنراوە نـەهاتووە نیشـانەی خواسـتن ڕەوتـی ڕسـتەکەیە،لەوکاتە کەخواسـتنەکەمان خواسـتنێکی ئاشـکرایە،لەهەمان کاتیشدا خواستنی گیاندارە(کەشەهبازە بۆگیاندار کەپیاوی ئازایە

## خواستنی وێنە /الإستعارة التمثيلية:

خواستنی وێنە:بەکارهێنانی پێکهاتـەی وێژەیەکـە بۆمەبەست و مانـای پێکهاتەیەکی تر پەیوەندی وێکچوون بەیەکیان ببەستێتەوە، نیشانەیەکیش هەبێ قەدەغەی مانای بنەڕەت بکات.([2])

ئەوەی لەم پێناسەیە دەردەکەوێ ئـەم جـۆرە خواسـتنە پێکهاتەیـەکی وێژەییە (ترکيب کلام)ی یە بـۆ واتـاو مەبەسـتی پێکهاتەیـەکی تـر دەخـواز رێ،بەمـەرجێك هاوبەشـی وێکچـوون لـەنێوان ئـەم دوو پێکهاتەیـە هـەبێ، هـەروەها بەڵگـەو نیشـانەش هـەبێ قەدەغـەی مانـای بنـەڕەتی پێکهاتـەی یەکەم بکات.پێکهاتەی یەکەم کەباسـکراوەکەیە دەبـێ بـەپێ چوێنراو (لێ خواستراو) پێکهاتەی دووەم کەباس نەکراوە دەبی بەچـوێنراو (خواسـتراو) ئەم جۆرە خواستنەلەبەر ئەوەی لە هەردوو سەرەکانی تـەنیا پـێ چـوێنراو

---

[1] ألعقد الجوهری فی شرح دیوان الجزیری(احمد الزفنگی ) ل٢٦٦

[2] علم البيان (د. بيسيونی عبدالفتاح فيود) ل٢٠٥

(بۆخواستراو) دێ هەردەم دەبێ بەخواستنی ئاشکرا . بەزۆری لەپەندی پێشینان بەرچاو دەکەوێ، دەربڕینی بەم شێوەیەش لەلایان کورد زۆر بەکارهاتووە. وەك(چەپڵە بەدەستێك لێ نادرێ) شێوەی ئەوکەسەی بیەوێ بەتەنیا کارێك ئەنجام بداو لەتوانای دانەبێ چوێنراوە بەشێوەی کەسێك بیەوێ بەیەك دەست چەپڵە لێ بدات،کۆکەرەوە (الجامع) بۆ ئەم دووانە، بێ تواناییە،ئەو پێکهاتەیە کەبۆپێ چوێنراو دانراوە،بۆچوێنراو بەکارهاتووە. (چەپڵەبەیەك دەست لێ نادرێ)لی خواستراوە، پێ چوێنراوە باسکراوە،(کەسەکە) کە توانای ئەنجامدانی کاری نییە، بۆخواستراوە چوێنراوە باس نەکراوە،کۆکەرەوەی نێوان هەردوو سەرـ خواستراو و بۆخواستراو- بێ تواناییە، بەم شیوەیەخواستنەکە دەبێ بەخواستنێکی ئاشکرا نیشانەی خواستنیش بارو دۆخە .

ئەدەب دەڵێ:

دوهەناری نەورەسن هەر یەك بەیەك گوڵنارەوە
یادوو نارنجی ڕەسیدەن لەبەهاری پارەوە( [1] )

هەناری نەورەس: هەناری تازە پێ گەیشتوو، مەبەست مەمکەکانی دڵبەرە. گوڵنار: گوڵە هەنار.(مەبەست لەگۆی مەمکە)ڕەسیدە: پێگەیشتوو.

واتە:((ئاخۆ ئەوانە دوو هەناری تازە پێگەیشتوون؟!کەهەریەکەیان هێشتا گوڵەکانیان بەدەمەوەیە، یان ئاخۆ دوو نارنجن کەلەساڵی پارەوە گەیی ون ؟!))[1]

---

[1] دیوانی ئەدەب مصباح الد یوان محمد سەعید (ئاسۆ/٩٣.

لەم دێڕە شیعرەدا دووخواستنی وێنەهەیە:

١– پێکهاتەی نیوە دێڕی یەکەم خواستراوە بۆ دوو مەمکی تازە پێ گەیشتووی یار، واتە:ئەم پێکهاتەیە لێ خواستراوە، پێ چوێنراوە (دوو مەمکی تازە پێگەیشتوو) بۆخواستراوە،چوێنراوە) ڕەوت وباری شوێن بەڵگەیە کەمەبەست مانای بنەڕەت نییە، بەڵکو مانای دووەمە کەیەتی.

٢– پێکهاتەی نیوە دێڕی دووەم خواستراوە بۆ دوو مەمکی پێگەیشتووی یار لەساڵی پاروە،کەوابێ پێکهاتەی دووەم لێ خواستراوە پێ چوێنراوە، دوومەمکی پێ گیشتووی یار لەپارەوە، (بوخواستراوە)،چوێنراوە، ڕەوت و باری شوێن بەڵگەیە کەمەبەست مانای بەنەڕەت نییە،بەڵکو مانای دووەمە کەیەتی .

یاوەك مەحوی دەڵێ :

وتی: میوەی بەهەشتە شیعری مەحوی

خودا نەبڕێ لەباغم داری بەردار

(واتە:یەکێك وتی: شیعری مەحوی ئەوەندە جوان و خوشە وەك میوەی بەهەشت وایە. سا خوایە داری بەبەری توانای شیعر وتن لەباغی ژینی من نەبڕی بۆ ئەوەی هەمیشەشیعری جوانی وەك میوەی بەهەشت خۆش بڵێم )[٢]

مەحوی کەدەڵێ:(خودا نەبڕی لە باغم داری بەردار) مانا ڕاستەقینەکەی پاڕانەوەیە بۆئەوەی خودا داری بەردار لەباغەکەی

---

[١] دیوانی ئەدەب/لێکۆڵینەوەی عبد الباقی/٧٧٩

[٢] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکرمی مدرس ل١٢٠

نەبڕی)بەلاّم ئەم مانایە راستەقینەوبنەڕەتە مەبەست نییە،بەلّکو مانا بۆخواستراوەکەی مەبەستە واتە:خوایە شیعری جوانی پڕ لە ڕەوانبێژم لیّ نەبڕی. دەربڕینی خواستن بەم جۆرە دەبیّ بەخواستنی وێنە تاوتوێی خواستن بەم شێوەیە مانای یەکەمی بنەڕەت پیّ چوێنراو (لیّ خواستراو)ە مەبەست نییە، بەلّکو مانای دووەمی چوێنراو(خواستراو) مەبەستە کە شیعری جوانی پڕ لە ڕەوانبێژیە پەیوەندی نێوان چوێنراووپیّ چوێنراو،جوانی و سوود بەخشینە نیشانەی خواستنیش ڕەوتی ڕستەکەیە.بەم شێوەیە خواستنەکەمان دەبیّ بەخواستنی وێنە .

## ڕاهێنان

جۆرو بنچینەی خواستن لەم دێڕەشیعرانە دیاری بکە

١–چاوەکم ئەمڕو لەگوڵشەن گوڵ بەعیشوە خۆی نواند
نەك نمەك گیربم بەمەرگی تۆ قەسەم هیچ نەمدواند

حەریق

٢–من غەمم خواردوغەمیش خوێنی جیگەری خواردمەوە
بۆیێ گریام چەند بەچەند فرمێسکی خوێنینم نەهات

سالم

٣–تانێرگسی تۆ نازی هەبێ ،غەمزە نوومابێ
شەرمەندە نەبێ،چی نییەئاهۆیی خەتابێ

وەفایی

٤–ئەی نەفسی مورائی گرانباری تەکالیف
بۆ خەڵقی دەکیشی دەهەڕو ریش و جەدەوبە

نالی

٥–لەسەر ئەوظولمتە ئابادی شەوی کوفرە کەطالیع بوو
سەلا هەستا لەئینس و جان کەڕژی نووری ئیمانە

نالی

٦–لەم فەیضی نوورە هەرچی نارە مردووە
بەم نەفخی سوورە هەرچی کەخەڵکە ژیایەوە

نالی

٧–چوەچوو ، خۆ نەهاتوو نادیارە ،حاڵە ماڵت بێ
بەس ئەم نەقدە بکە صەرفی غەمی موستەقبەل وماضی

مەحوی

## درکە : کنایة

درکــە:(کنایــة) دەربڕینــی وشــەیان رســتەیە لــەپاڵ مانــای بنــەڕەت مەبەستت لێی مانای پەیوەست بێ.[١]

ئەوەی لەم پێناسەیەبۆمان ڕوون دەبێتەوە دەبێ وشەیان ڕستە مانای بنەڕەتی خۆی هەبێ لەهـەمان کاتیشـدا مانایـەکی پەیوەستیش بگـەیێنێ. مەبەسـتیش پەیوەسـتەکەبێ، مانـا بنەڕەتەکـەش قەدەغـە نەبێ،ئەمـەش واتــە: مانــای پەیوەســت دەبــێ بەمەبەســتی ســەرەکی لــەدەربڕینی بــەم شــێوازە، مانـــای بنـــەڕەت دەبـــێ بە(پێوەســـتراو)دووەمیش دەبـــێ بە(پەیوەست)یەکەم مانایای فەرهەنگی خۆی لەدەست نادات، پەیوەندیش لەنێوان هەردوو مانا تەکنیشی(ألمجاورة)دەبێ .

ئەوەی لێرە هەژی گوتنـەو پێویسـتە بـەئاماژە بـۆکردن، هەنـدێك جار مانای بنەڕەت لەدرکە قەدەغەدەکرێت لەبەر تایبەتمەندی بابەتێك نەتوانرێ مانای بنەڕەتی بۆ دابنرێ خوای تاك و تـەنیا لـەقورئانی پـیرۆز دەفـەرموێ (الرحمن علی العرش استوی ) سوور تی طه ئایەتی/٥

مانـای بنـەڕەتی ئـەم ئایەتـە قەدەغەیە،چـونکە خـوای تـاك و تـەنیای خاوەن توانا بەم شێوەیە بـیری لێ ناکرێتـەوە کەلەسـەر کورسـی دابنیشـێ کــەوابێ دەبــێ مەبەســت لەچــەمکی ئــەم ئایەتــە پەیوەســتەکەی بــێ کەنیشاندانی توانای لەڕادە بەدەری خوایە.[٢]

کە دەڵێین لەدرکە مانای بنەرەت قەدەغە ناکرێت ئەمە دەبێ بەجیاوازی نێـوان درکـەو خوازە،چـونکە لـەخوازە(ألمجاز) مانــای بنــەڕەت قەدەغـە

---

[١] ألكناية أساليبها محمد الحسن ل٤٢

[٢] جواهر البلاغة (احمد الهاشمی) ل ٣٤٧

دەكرێت، ئێمە گەر لەباسی شاعیرچاكی نالی بڵێین: دیوانی نالی چەند جار چاپ كراوە، ئەم ڕستەیە دركەیە لەوەی كەنالی شاعیرێكی بەتوانایە، بۆگەیشتن بەم مانایە دەتوانین بەپەیوەستەكانی دابچین. دیوانی نالی زۆرچاپ دەكرێ ، زور دەكڕێ، خوێنەری زۆرە، شیعرەكانی لەئاستێكی بەرزی ڕەوانبێژی دان،كەوابێ نالی شاعیرێكی بەتوانایە. بەلأم لەهەمان كاتدا كەمانای پەیوەست مەبەستە،مانای بنەڕەتی فەرهەنگی یەكەشی قەدەغەناكرێ، چونكەمانای پەیوەست قەدەغەی مانای بنەڕەت ناكات. بەلأم گەركەسێك بڵێت گفتوگۆم لەگەڵ شێراكرد دەبێ بەخوازە، مانای بنەڕەت قەدەغە دەبێت،چونكە وتووێژ لەگەڵ شێری ڕاستەقینە ناكرێ كەوابێ پەیوەستی مانا مەبەستە كەكەسێكی ئازایە.

### پوختەی جیاوازی نێوان دركەو خوازە

١– بەڵگەی دركە قەدەغەی مانای بنەڕەت ناكات، بەڵگەی خوازە قەدەغەی مانای بنەڕەت دەكات .

٢– بەڵگەو نیشانە لەدركە زۆر بەپێویست نازانرێت، چونكە مانای بنەڕەت لەدركە قەدەغە نییە،بەلأم بەڵگەو نیشانە لەخوازە دەبێ بوونی هەبێ.بۆ قەدەغەكردنی مانای بنەڕەت.

### دابەشكرنی دركە

دركە لەڕەوانبێژی كوردیدا بەهەمان شێوەی زمانی عەرەبی سێ بەشی هەیە :

#### یەكەم : دركەلەسیفەت ( الكناية عن الصفة )

لەم دركەیەدا تەنها وەسفكراو باسی لێوەدەكرێ سیفەت باس ناكرێ: دركە لەم بەشە دوو جۆری هەیە:

أ‌-درکەی نزیك: ئەوەیە گوێگر یان خوێنەر بەئاسانی لە پەیوەستەوە بۆ پێوەستراو بچێت و ڕاستەوخۆ بەمەبەست بگات و وەری بگرێ.[1]

نالی دەڵێ :

مل عەلەم شیرین قەلەم ئاهوو شکەم، مەیموون قەدەم
سم خڕو کلك ئێسترو،مەنزل بڕۆ عارەق نەڕێژ([2])

(نالی)لەوەسفی کەرەکەیدا لەبری ئەوەی بڵێ ماندوو نابی وتوویتی :(عارەق نەڕێژ) ڕاستەوخۆ نەی وتووە ماندوو بوونی بۆ نییە،بەڵکولەڕێگای پەیوەستێکی(ماندوو نەبوونەوە)کەعارەق نەرێژە مەبەستی خۆی راگەیاندووە،چونکە کەرێك خاوەنی ئەم هەمووە سیفەتەبێ کەلەم دێڕەشیعرەدا هاتووە دەبێ ماندووش نەبێ. بەم شیوەیە عارەق نەڕێژ درکەیە لەماندوو نەبوون.پێویست بەلێکدانەوەی زۆریش ناکات بەئاسانی لە مانای بنەڕەتەوە(پەیوەست) بۆ پێوەستراو دەچین کەماندوو نەبوونە .

نالی دەڵێ :

قانیعی بابی ریضا و ڕاضی بەپوش و درك و داڵ
سالیکی صەبرو تەحەممول، بوردەبارو هیچ نەوێژ([3])

(نالی)لەوەسفی کەرەکەی لەبری ئەوەی بڵێ(ڕازی یە) وتوویەتی (هیچ نەوێژ) ڕاستەوخۆ نەی وتووە (ڕازی یە)،بەڵکو لەرێگای پەیوەستێکی ڕازی بوون کەهیچ نەوێژە مەبەستەکەی ڕاگەیاندووە،چونکە کەرێك ئەم

---

[1] علم البیان (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ل ٢٣٣

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ل٢٢٥-٢٢٦

[3] هەمان سەرچاوە ل ٢٢٧

هەمووشـــتەی لێ هـــات بێتـــەجێ کەلـــەم دێـــڕە شـــیعرەدا هاتووەدیـــارە ڕازیشـــە،بەم شـــێوەیە هـــیچ نەوێـــژ درکەیەلـــەڕازی بوون.پێویســـتیش بەلێکدانـــەوەی زۆر ناکـات بەئاسـانی لـەمانای بنەڕەتەوە(پەیوەسـت) بـۆ پێوەستراو دەچین کەڕازی بوونە.

ب– درکـەی دوور: ئەوەیـە گـوێگر یـان خوێنەر،ڕاسـتەوخۆ بـە مانـاو مەبەسـت نـەگات، بـەڵکو لـەڕێگای چـەند هۆیێکـەوە لەپەیوەسـت (مانـای بنەڕەت )بۆپێوەستراو بچێت.[1]

ئەحمەدی خانیێ دەڵێ:

ئـــەو ئەگـــەر چـــی بەیـــەك هـــەبوون بـــەهیڤی
ئـــەمان نـــە دەچـــــوون قـــەوی نشێـــــڤی([2])

واتە: مەم و زین هەرچەند خۆشەویستی یەکتربوون و بەهیوا بوون ڕۆژێك لە ڕۆژان بەیەکتر شادبن و بەیەك بگەن، بـەڵام لـە هـەمان کاتیشـدا لەبـەرزی سـنووری ئـەدەبی نێوانیانـدا دانەبـەزین، هەڵسـووکەوتی ڕەوشـت بـەرزی خۆیانیان بەرەو نەزمی ونشێوی نەبرد. توانیان پاکی خۆیان ڕابگرن.

(نشـــێڤی)درکەیە لەڕەوشـــت پـــاکی و دەرنەچـــوون لەســـنووری ئەدەب،چونکەباوەکەسـانێك وەسـفیان بـەم شـێوەیە بکـرێ دەڵـێن سـەر بەرزەکەوابێ کەسێك هەلسووکەوتی بەپێچەوانەبێ دەبێ لەلوتکـەی بـەرزی ڕەوشت دابەزی بێ بۆ نشێوی بێ ڕەوشتی. بۆ لێکدانەوەی ئـەم درکەیـەش پێویستیمان بەچەند هەنگاوێـك دەبـێ لـەپەیوەسـتـەوە بـۆ پێوەسـتراو

---

[1] علم البیان(د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ل ٢٣٤

[2] مەم و زین ئەحمەدی خانیێ(جان دوست)ل٣٨٤

بچـین لـە( قـەوی نشـێڤی)دەڵێین:ئەم هەردووکـە ڕۆژێـك لـە ڕۆژان قسـەو هەڵسـوو کـەوتی ناڕەوایـان لەنێوانـدا نەبووە،عیشـقی نێوانیـان عیشـقێکی ڕاسـتەقینەبووە، عیشـقی ڕاستەقینەش،لەسـەر ڕەوشـت پـاکی دادەمەزرێ،کەسـانێکیش ڕەوشـتیان پـاك بێ،لەسـنووری ئـەدەب دەرناچن،کەوابێ دەبێ مەم وزینیش بەم شێوەیەپاك بن و لەپلەی بەرزی ئەدەب دابن و نشێڤی یان بەخۆوە نەبینی بێ.

## دووەم : درکە لەخودی وەسفکراو:ألكناية عن الموصوف

ئەوەیـە:خـودی وەسـفکراو مەبەسـت بـێ و باسـی لێوەنەکرێت،یـەك سیفەت یان چەند سیفەتێکی پەیوەست(لازم)ی بۆ بهێنیەوە لـەڕێگای ئـەم سـیفەتانە بـۆ وەسـف کـراو بچـی. ئـەم درکەیـەش وەك ئەمـەی پێشـوو دووجۆری هەیە :

١-درکەی نزیك ئەوەیە گوێگر یان خوێنەر بەئاسانی و بێ لێکدانـەوەی زۆر واتای درکـە کـەی بـۆ ڕوونبێتـەوە:[1] وەك چـۆن لەپەنجـە شـکاندنەوە بۆپەشیمانی و لەگەردن کێلی بۆ بالا بەرزی بچیت.

نالی دەڵێ:

چەنـد پێـم خـۆش بوو زوبـانی حـاڵی دەیـوت((نـالیا))
هەردوو حەیوانین ،ئەتۆ گوێ کورت و ئەمنیش گوێ درێژ[2]

واتـە: نـالی دەڵـێ: کەرەکـەم بـەزوبانی حـاڵی خـۆی بـەمنی ڕاگەیانـدو وتی:نـالی مـن و تـۆ هـەردوکمان گیانـدارین جیاوازیمـان ئەوەیـە تـۆ مرۆڤـی

---

[1] علم البيان (د. بيسيونى عبدالفتاح فيود) ل ٢٣٤

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الكريمى مدرس ل ٢٢٨

منیش پێم دەڵێن کەر.لەجیاتی ئەوەی بڵێ: تۆ مرۆڤی، دەستە واژەی گوێ کورتی بۆ بەکارهێنا،لەجیاتی ئەوەی بەخۆی بڵێ منیش کەرم وتی: گوێ درێژم ،کەوابێ(گوێ کورت وگوێ درێژ) هەردووکیان درکەن،یەکەمیان لەمرۆڤ و ئەوەی تریان لەخۆی. ئەم درکەیەش بەنزیك دادە نرێ چونکە بێ لێکدانەوەی زۆرو بەئاسانی لەڕێگای سیفەتەوە دەگەین بەمەبەست کەخودی وەسفکراوەکەیە.

یاوەك محسن لەهۆنراوەیەك لەوسفی کۆمپیوتەر دەڵێ :

وردبین ونیگارکێشە، بێ دەست و بێ زوبانە
ئەندازیارو نووسەرە، هەم ژیرە بێگیانە

بەئاسانی لەڕێگای ئەم سیفاتانە دەزانین مەبەست کۆمپیوتەرە.

٢–درکەی دوور: ئەوەیە لەسیفەتێك یان لەچەند سیفەتێك نەتوانین بەئاسانی و ڕاستەوخۆ بگەین بەخودی وەسفکراو، بەڵکو لەڕێگای ئەم سیفەتە یان ئەم سیفەتانە بگەین بەخودی شتەکە کەوەسفکراوەکەیە.[1]

مەولەوی دەڵێ :

ئێمە گشت فانی، هەرئەوەن باقی
نازوون وە بازووی پڕ نەیرووی ساقی
خەلاصیش دا پێت وە یەك پەیمانە
ئازاد بیت جەبەند بەستەی پەیمانە

---

[1] علم البیان (د. بیسیونی عبدالفتاح فیود) ل ٢٣٣

مانـای وشــە : نـازوون: بنـازم. پـــڕنەیروو: بـەهێز. پەیمانـە: پیاڵـەی شەڕابی مەرگ.بەستەی پەیمانە: پەیمانی لەگەڵ خودا بەستراو .

واتە:((ئێمە هەموومان ئەمرین و مانەوە هەر بۆخوا خۆیەتی، سا بنـازم بەشـان و قـوڵی بـەهێزی ساقی(مەبەسـت قـودرەتی خوایە)کـە بەپیاڵـەی شەڕابی مەرگ ڕزگاری کردیت و لەبەندی پەیمانی لەگەڵ خوادا بەسـتراوی ئازادی کردیت کەدەبوو بەپێی ئەمرو نەهی ئەو بجوڵێتەوە)[1]

((پڕنەیرووی ساقی)بەهێزی ساقی، مەبەست قودرەتی خوایـە، درکەیـە لەخودی وەسفکراو کەخوایـە لـەجیاتی ئـەوەی بڵـێ: بنـازم بـەهێزی خـوا، لەڕێگای سفەتێکەوە باسی کـردووە، ئێمـە گـەر لـەو سـیفەتە ورد بینـەوەو سەرنج بدەین، دەزانین مەوسـوفی ئـەم سـیفەتەخوایە، بەڵگـەش بـۆ ئەمـە کەمەبەستی لەبەهێزی ساقی خوایە دێڕی دووەمە، بولێکدانەوی ئـەم دێـڕە هۆنراوەو گەیشتن بەخودی مەوسوف دەڵێین: خاوەن وەسف توانـای هەیـە بەیەك پیاڵە شەرابی مـەرگ مرۆڤ ڕزگار بکات لەبەنـدی ئـەو پەیمانـەی کـە پێوەی پەیوەستە، هیچ ساقیەکیش نییە خاوەنی ئەم سیفەت و توانایەبێ، کەوابێ دەبی مەبەسـت لەبـەهیزی سـاقی قـودرەتی خـوابێ، بـەم شـێوەیە ئێمە لەڕێگای ئەم سیفەتە کەبەهێزی ساقی یە دەگـەین بـەخاوەن وەسـف کەتوانای خوای مەزنە.

---

[1] دیوانی مەولەوی لێکۆڵینەوەی مەلاعبدالکریمی مدرس /٧٥

**سێیەم درکەلەدرانەپاڵ: ألكناية عن الصفة**

دەرخستن و جێگیرکردنی سیفەتە لەکەسێك یان لەشتێك لەدوایێ ئەم سیفەتە بدەی بەشتێکی تری سەربەو کەسە یان ئەوشتەی یەکەم ،جێگیربونیشی لەوەی دوایی ببێ بەجێگیرکردن لەوەی پێشوو.[1]

مەحوی دەڵێ:

ئەسیرو صەیدی قەیدی کەیدو شەیدی نەفسی ئەممارەم
لەدەست ئەم مارە بەدچارە، چیە چارم،خودا چارەم

صەید:نێچیر.قەید:کوت و زنجیر.کەیدو شەید: فڕوفێڵ.نەفسی ئەممارە: نەفسی داواکەری خراپە.ئیشارەتە بۆ ئایەتی (إن النفس لأمارة بالسوء)[2]

مەحوی دەیەوێ بڵێت من ئەسیری(دیل)و صەید (زنجیر)ی نەفسی ئەممارم،بەلاّم ڕاستەوخۆ ئەمانەی نەوتووە،بەڵکو ئەم سیفەتانەی داوەتە پاڵ شتێکی تری سەر بەنەفسەوە،ئەویش قەیدی کەیدو شەید(فڕوفێل)ە کەپەیوەندی بەنەفسەوە هەیە،کەسێك فێڵبازبوو ئەم فێڵبازیەی لەڕێگای نەفسی ئەممارەوە دەبێ،گوزارشت کردنیش بەم شێوەیە دەبێ بەدرکە لەسیفەت لەڕێگای درانەپاڵ (ألإسناد).

ئەوەی لێرە شایانی باسەو بەپێویستی دەزانم ئامارەی پێ بکەم،ئەم سێ بەشەی درکە کەباسمان لێوەکردن(عبد القاهر)ی جورجانی تەنها باسی لە دووان کردووە درکە لەسیفەت و درکە لەدرانەپاڵ(الكناية عن

---

[1] علم البيان (د. بيسيونى عبدالفتاح فيود) ل ٢٣٠

[2] دیوان مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلاعبد الكريمى مدرس ل ٢٢٨

النسبة)درکەی لەخاوەن وەسف، باس نەکردووە،بەلاَم(سەککاکی)· هەستاوە بەدابەش کردنیان بۆ ئەم سێ جۆرەی ناومان بردن،(خە طیب)ی قەزەوینیش بەهەمان شێوەی سەککاکی دابەشی کردوون و لەگەڵ دیاری کردنی چەند وردەکاری و رەخنەیەك ،لەهەمان کاتیشدا درکەی بەگوێرەی پەیوەست(وسائط)دابەش کردووە بۆئەم جۆرانە :

ا- نیشاندان/تەلویح : ئەوەیە بەبێ تەوس لەڕێگای پەیوەستی زۆرەوە بگەی بەمەبەست:[١]

مەحوی دەڵێ :

خیطابت هەرعیتابە،ئەو لەبە بێتەقسە، هەرکەس
موخاطەبتە،دەکا دەردەم زوبانی گفتوگۆ غایب

مانای وشە: خیطاب:گفتوگۆ.عیتاب:لومەو سەر زەنشتکردن.دەردەم: دەس بەجێ.یاخود لەناو دەمدا

واتە:((قسەت هەر سەر زەنشت کردن و بەسەر داهاتنە.لەگەڵ هەر کەسیش بێیتە قسە دەست بەجێ زمانی دەشکێ و زمانی گفتوگۆ لەناو دەمیدا ون دەبێ.))[٢]

مەحوی لەجیاتی بڵێت ناتوانم وەلاَمت بدەمەوە دەڵێت (زیانی گفتوگۆ غایب) ئێمە لەڕێگای چەند پەیوەستێکەوە دەتوانین بڵێین واتە:بێ دەنگ دەبێ،کەبێ دەنگیش بوو، بی وەلاَم دەبێ ،بەدەنگ بوونیش واتە نەمانی زمانی گفتوگۆ .

---

[١] الكنايةوأساليبها محمد الحسن ل ٩٦

[٢] دیوان مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلاعبد الكريمي مدرس ل٥٢

مەحوی دەڵێ :

نەقشی خودا ببینە ،لە خەلقی خودا گەرێ
گەر ئەهلی ئیحتیرازی،لەکەس مەگرە ئیعتراض

((واتە: کەچاوت بەجوانان دەکەوێ کەدڵی دڵدار ڕادەکێشن، بیر لەخۆیان مەکەرەوە ئەوە بینە بە رچاوی خۆت کە خوا چی دروست کردووە،ئەگەر لەخوا ترسی ڕاستەقینەشی واز لەو خەڵکانە بێنە کەدڵیان لەو جوانانە چووە، ڕخنەی ئەوەیان لێ مەگرە بۆچی وا گرفتاری ئەو نازدارانە بوون ))[1]

مەحوی لەم دێرە شیعرەیدا دەیەوێ چەند شتێکمان نیشابدات بۆ ئەو مەبەستەش دەیەوێ بلێت کەچاوت بەجوانان دەکەوێ بیر لە خودی خۆیان مەکەوە بۆ ئارەزووی نەفست،بیر لەو نەقش و نیگارانە بکەرەوە کەخوا خاوەن چ توانایەکە ! چی دروست کردووە،رەخنەش لەکەس مەگرە،کەبەدەردی جوانان گرفتارن، عاشقی خودی جوانی جوانان نین،عاشقی ئەو نەقش و نیگارانەن کە گەورەیی و توانای خوای لێوەدیارە، بەلاّم ئەم شتانەی ڕاستەو خۆ دەر نەبڕیوە، بەڵکو لەڕێگای دوو درکە نیشانی داون و گوزارشتی لێوەکردوون :

أ/ کەدەڵێ: (نەقشی خودابیبنە) واتە: لەڕێگای ئەم نەقش و نیگارانە بیرلە خوا بکەوە، بەبیرکردنەوەت لەم نەقشە دەزانی،کەخوا خاوەن چ توانایەکی لەڕادە بەدەرە و کەس توانای وەك ئەوی نییە، ئەم نیگارەبەم

---
[1] هەمان سەرچاوە ل ١٥٧

شێوەیە بکێشی، ئەمەش واتەسەلماندنی گەورەیی و بێ هاوتایی خوا لەڕێگای چەند پەیوەستێکەوە.

ب/ئەوەیە دەڵێ: (لەخەلقی خواگەڕێ) واتە: لە دووای خودی جوانان مەگەڕێ بۆ ئارەزوی نەفس،پەیوەست بوونت بەخودی جوانان،پەیوەست بوونە بە ئارەزووی نەفس، ئەمەش واتە گرتنەبەری ڕێگای ناپاکی و دوور کەوتنەوە لەبیرکردنەوە لەتوانای نیگارکێش .کەخوای خاوەن توانایە .

یاوەك دەڵێ :

بیکەیتە بەر دەیکەیتە بەر ئیستەبرەقی بەهەشت
مەحظوظ ئەبی بەحیفظی لە هەولی عەذابی هوون

ئیستەبرەق: جۆرە کوتاڵێکە تان و پۆی لەتالی ئاوریشمی زێڕە لەقورئانیشدا هەیە کەوا ئەهلی بەهەشت ئیستەبرەق لەبەر دەکەن .
مەحفوڤ :بەختەوەر. هول: ترس .هوون:سووکی وسەر شۆڕی .

((واتە: ئەگەر ئەم شیعرانە لەبەر بکەی ، دیارە بۆیە لەبەریان دەکەی کەبە گوێرەیان

بجووڵێتەوە.کەبەگوێرەشیان جولاێتەوە، بەهەشت جێت دەبێ و پۆشاکی ئیستەبرەق لەبەردەکەی و بەختەوەر دەبی))[١]

مەحوی لەدێڕی یەکەم کەدەڵێ:( بیکەیتەبەر، دەیکەیتەبەر ئیستەبرەقی بەهەشت)

---

[١] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلاعبد الکریمی مدرس ل٤٠٠

گەیشتن بەلەبەر کردنی ئیستەبرەق لەبەهەشت لە ڕێگای ئەوپەیوەستانە دەبی هەروەك لەم شەرحەکە هاتووە .

٢- هێمانەوەیە: لەڕێگای پەیوەستی کەم و شاراوە بگەی بەمەبەست:[1]

جزیری دەڵێ :

عارف حەتا نەنۆشیێ، ژدەستێ مەی فرۆشیێ
غائب نەبێ ژ هۆشیێ، پەیدا نەکر ویلایەت([2])

جزیری لەم وینەیەدا دەیەوێ بڵێت (عارف) خواناس.تالەڕێی پیری تەریقەت نەبێ و هەرلەم ڕێیە خۆی لەبیر نەچێتەوە ناگات بەپلەی بەرزی دۆستانی خوا.(مەی فرۆش)لەم دێڕەدا درکەیە لەپیری تەریقەت، شەڕابی پیری تەرقەتیش واتە: فێرکردنی ئەوینی خوایی،کەوابێ کەسێك لەدەستی پیری تەریقەت بخواتەوە و خۆی لەبیر بچێتەوە، ئەوسا ئومێدی دەبێ بگات بەپلەی بەرزی دۆستانی خواوە،جزیری لەبری ئەوەی بڵێ تاعارف ڕێی پیری تەریقەت نەگرێتەبەر ناگات بەویلایەت دەڵێ:(عارف حەتا نەنۆشیێ ژدەستی مەیفرۆشیێ) مەی فرۆش دەبێ، بەدرکە لەپیری تەریقەت، چونکە پیری تەریقەتە شەڕابی عیشقی حەقیقی بەخواناسان دەدات و دەیان هێنێتە سەر ڕێگای ڕاست .لەبەر ئەوەی پەیوەست لەم درکەیە شاراوەیە پێویست بەلێکدانەوەو بیرکردنەوەیە پێی دەوترێ (هێما)

---

[1] الكناية أساليبها محمد الحسن ل ٩٦

[2] ألعقد الجوهرىبشرح ديوان الجزرى أحمد الزفنگى ل ١٣٨

نالی دەڵێ :

دەخیلـــــت بم نەخیـــــلی یـــا ڕوطـــابی؟!
وەهـــا شـــیرین و ســـینەنەرم و دڵ ڕەق!([1])

نالی لەم دێڕە شیعرەیدا ڕاستە وخۆ نەی وتووە یارم بێ بەزەیە، وتوویەتی(دڵ ڕەق)کەوابێ مەبەستی لەدڵ ڕەقی مانای فەرهەنگی نییە کەمانا بنەڕەتە کەیەتی، بەڵکو مەبەستی مانای پەیوەستی ئەم مانایەیە، ئەمەش واتە بەکار هێنانی مانای بنەڕەت بۆ مانایەکی تر کەبێ بەزەیی یارەکەیەتی، ئەوەی لێرە بەبیر دادێ نالی لەڕێگای خۆ بێ ئاگا نیشاندان و چواندەن لەبارەی دەرخستنی وەسفی جوانی یاری کەدەڵێ: (نەخیلی یاروطابی) لەڕێگای درکەش ویستوویەتی ڕابگەینی کەیارەکەی زۆر بێ بەزەیە بەم شێوەیە دەبینین نالی مانای بۆ مانا بەکارهێناوە.لەبەر ئەوەی شاراوەیی لەمانای پەیوەست دا هەیە ئەم شێوازە پێی دەڵێن(هێما ـ ڕمز )

نالی دەڵێ:

شـــوکر نـــالی ســـەری خەصـــمت وەکـــو گـــۆ
بـــەخواری، نـــەك بـــەیاری،کەوتـــە بەرشـــەق

مانـای وشە:((خەصـم: دوشمن.گۆ:جـۆرە تـۆپێکی دارینـە بـە دارێـك لێیانداوەو یاریـان پـێ کـردووە، بەدارەکـەیان وتوەچـەوگان واتـە گۆچـان. خواری:ذلیلی.یاری:دۆستایەتی.یاری کردن.

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٢٥٢

نالی لەم شیعرەیدا زولفی یاری بەدوژمنی خۆی داناوە،چونکە مادەم ئەو زولفە دەست وپێی یاری بەستوو وەتەوە و لەملی ئالاوە و،بەشۆڕبوونوەشی بەسەر سنگ و ڕووی یارا ڕێگای لەنالی تەنیوە،کاری دوژمنانەی کردووە، چ لەگەڵ نالی خۆی و چ لەگەڵ دۆستەکەی،کە ئەمەش هەر وەك ئەوەیە کاری دوژمنانە لەگەڵ نالی خۆی کردبێ... نالی بەخوی ئەڵێ شوکری خوا بکە کەوا سەری دوژمنەکەت کەسەری زولفی یارە،وەك گۆی مەیدان کەتووەتە بەرپێی یار.کەوتنە بەر پێ کەشی بەزەلیلییە،نەك بەدۆستایەتی و لەحاڵی یاری کردنا وەك گۆی ڕاستتەقینە))[١]

نالی لەوکاتە ویستوویەتی گوزارشت لەوەسفی زولفی یاری بکات ، هەستاوە سەری زولفی بەسەری دوشمن داناوە(سەری خەصم ) لێ خواستراوە(پێ چوێنراوە) باسکراوە (سەری زولف) بۆخواستراوە(چوێنراوە)باس نەکراوە،بەڵگە کەچەمك و ڕەوتی ڕستەیە شیاوی لێ خواستراو نییە کەسەری (خەصمە)، شیاوی بۆخواستراوەکەسەری زولفە،بەم شێوەیە خواستنەکەمان دەبێ بەخواستنێکی ئاشکرا و خواستنی گیاندارەکەسەری خەصمە بۆ بێ گیان کەسەری زولفە لەهەمان کاتیش خواستنێکی ڕازاوەیە، چونکەنیوەدێری دوایی گونجاوو شیاوی لێ خواستراوە.نالی لەو کاتە کەسەری زولفی یاری بەسەری دوژمن وخەصمی خۆی داناوە ئینجا بەگۆشی چواندووە لەو کاتە سەری دوژمنەکەی بەزەلیل و ڕیسوایی لەبەرپێی یار بەشەق و بە تێ هەڵدان دیوە.(سەری زولف) چوێنراوە(سەری خەصم) پێ چوێنراوە(وەکو) ئەوزارە رووی بەیەکتر چوونیش کەوتنە بەر پێیە.

---

[١] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل٢٥٤

لەپاڵ ئەم خواستن و چواندنەش (نالی مەبەستەکی تریشی هەبووە ویستوویەتی ناڕاستەوخۆ لەڕێگای درکە- هیما- نیشانی بدات ئەویش درێژی زولفی یارەکەیەتی، زولفی یاری کە وەکو گۆ لەبەر پێ و پێی تێ هەڵ بدری دەبێ دریژ یش بێ. لەبەر ئەوەی پەیوەست لەم درکەیە شاروەیەو پێویست بەلێکدانەوەو بیرکردنەوەیە پێی دەوترێ (هێما)

٣-ئامازە/ألآيماء : ئەوەیە بێ تەوس بەواتاو مەبەست بگەی بە چەند پەیوەستێکی کەم و ڕوون و ئاشکرا.[١]

مەحوی دەڵێ:

لەپێ کەوتووم و نەفسم بۆ هەوا دەشنێ وەکو منداڵ
لەبەر پیری، سەرم خۆی ناگرێت و تازە پێ دەگرم

واتە:(لەبەر پیری و نەخوشی پەکم کەوتووە و لەپێ کەوتووم،کەچی نەفسم وەکو منداڵ بەدەم ئارەزووەوە دەشنێ.. لەبەر پیری سەرم بۆ ڕاناگیرێ،کەچی لەڕووی نەفس و ئارەزو وەوە دەڵێی: تازە پێ دەگرم و سەرەتای ژیانمە))[٢]

مەحوی دەیەوێت بڵێ من کە پیر بوومە سەرم لەبەر لەرزین خۆی پێ ناوەستێ، بەلآم لەلایان ئارەزووەوە تازە سەرەتای ژیانمە.دەڵێ: تازە پێ دەگرم تازە پێ گرتنیش پەیوەستی سەرەتای ژیانە.لەبەر ئەوەی پەیوەست لەم گوزارشتە روون و ئاشکرایە لەلایانی رەوانبێژیەوە پێی دەڵێن ئامازە .

---

١ الكنايەأساليبها محمد الحسن ل٩٦

٢ دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلاعبد الكريمي مدرس ل٢٢١

## تەوس:التعريض

تەوس: ئەو دەربڕینەیە مەبەستت لێی شتێکی تر بێ ڕەوت و باری ڕستە ئاماژەی پێ بکات.[1]

ئەوەی پێویستە بە ئامارە بۆکردن ئایا هونەری تەوس هونەرێکە سەر بەخۆیە یان هونەرێکە سەر بە درکە وەیە، زانایانی ڕەوانبێژی عەرەب لە لێکدانەوەکانیاندا بۆ دیاری کردنی ئەو مەبەستە دابەش بوونە بۆ ئەم سێ چینە :-

١- دەڵێن: تەوس جۆرێکە لەجورەکانی درکە، بەڵام هەندێ جار ڕێڕەوی خۆی بەردەدا و دەبێ بەخوازە،ئەوانەی پشتگیری لەو ڕایەدەکەن(سەککاکی و خەتیبی قەزوێنی و ئەبوو یەعقووبی مەغریبین)[2]

٢- دەڵێن: تەوس و شەیەکە بەکار هاتووە لەمانای دروستی خۆی بۆ ئەوەی شتێکی تری پێ نیشان بدەی.ئەوەی پشتگیری لەم ڕایە کردووە(التاج السبكى)یە.[3]

٣-دەڵێن: تەوس هونەرێکی سەر بەخۆیە، بەشێك نییە لەهونەری درکە بەڵگەیان بۆ ئەمە ئەوەیە دەڵێن:

أ/ ئامارە ی تەوس لەمانای دروستی وشە یان خوازە نییە، بەڵکو لەڕێگای مەفهوم و چەمکەوەیە کە لەڕەوتی وێنەکە دەردەکەوێ، بۆ ئەمەش دەڵێن: تۆ گەر بەکەسێکت وت من پێویستم، ڕوتم، سەرما ئازارم

---

[1] الكناية وأساليبها محمد الحسن ل٩٦

[2] هەمان سەرچاوە ل١٠٤

[3] هەمان سەرچاوە ل ١٠٤

دەدات ، ئــەم ڕســتەیە دەبــێ بەتــەوس و داواكــاری ناڕاســتەوخۆ ،چونكەچەمكی داواكاریەكە لەدەرەوەی وشەكانەوەیە، ئەو ڕستەیەی كەسە پێویستەكە وتوویەتی،بۆ داواكاریەكەی، مانای ڕاستەو خۆی ڕستەكە نییە، واتا داوا كاریەكە لەرستەكە وەرنەگیراوە نە لەلایانی دروستی (ألحقیقة)و نەلەلایانی خوازەیی(ألمجاز)، بەڵكو چەمك و مەفهومێكە لە دەروەی ڕستەكە هەستی پێ دەكرێ.[1]

ب/تەوس شاراوە ترە لە دركە، چونكە ئامـاژەو دەلالەتی دركە لەو شەوە بۆی دانراوە، بەلاّم دەلالەتی تەوس لەدەرەوەی ڕستەیەو لەڕەوتی وێنەكەوە دەزانرێ .

ج/دركە دەشێ لەوشەی تاك و لەوشەی ئاوێتەبێت ، بەلاّم تەوس تەنیا لە ڕێگای ڕستەوە دەبێ. ئەوانەی ئەم بۆچوونەیان هەیە ((ابن الأثیر وعلوی))ن[2]

ئەوەی من بوی دەچم چەمكی تەوس لەڕەوتی وێنە دەردەكەوێ و هەروا واتاكەی نەبەستراوەتەوە بەپەیوەست و لە دركەش شاراوە ترەو لەیەك وشە نابێ بۆیە بە بەشێك لەدركە دانانرێ .

نالی دەڵێ :

ئێمە مەردین هەموو شێری خەشین پۆشی مەصاف
كرمی قەز هەرچی تەنی، بۆ نیسوانی تەنی

---

[1] هەمان سەرچاوە ل ٧٧-٧٨

[2] المجاز والكنایة یوسف أبو العدوس (د) ل ١٨١

((واتـــه: ئێمـــه پیـــاوین شـــێری پـــه‌لاس له‌به‌ركـــه‌ری جـــه‌نگین .. له‌وخاووخلیسـكانه‌نین كه‌بـه‌رگی ئاوریشـم له‌بـه‌ر ئه‌كـه‌ن كرمـی ئاوریشـم، هه‌رچی ئاوریشمی ته‌نیوه بۆ لاشه‌ی ئافره‌تی ته‌نیوه)).[1]

ده‌سته‌واژه‌ی ئـه‌م دێـڕه شـیعره تـه‌وس و پـه‌لاره ناڕاسـته‌خۆ نـه‌فی پیـاوه‌تی لـه‌میرزا شـیرازی ده‌كـات (نـالی): پێـی ده‌ڵـێ ئه‌گـه‌ر پیـاو بـێ له‌به‌ركه‌ری به‌رگی ئاوریشم نابێ كه‌تایبه‌ت به‌ئافره‌ته .

مه‌حوی ده‌ڵێ :

شێـخی هه‌مـــــه‌وه نـدێكی ده‌دا په‌نـدو نه‌صیحـه‌ت
ئه‌و قوڕ به‌ســـــه‌ره‌ی دابوه به‌رفه‌حش و فه ضیحه‌ت
خۆش هاته‌جه‌واب و وتی: تـــۆ حه‌قتـه فه‌قـه‌ط مـن
قوططـاعی طـه‌ریقـم ، نـــــه‌كو قوطـاعی طـه ریقـه‌ت

((واته‌شـێخێك كابرایـه‌كی هه‌مه‌وه‌نـدی ڕاگرتبـوو ئامۆژگـاری ده‌كـرد كه‌بێته سه‌رڕێگه‌ی ڕاست و قسه‌ی خراپـی پـێ ده‌وت له‌سـه‌ر ئـه‌و كرده‌وه خراپانه‌ی ده‌یكرد.

كابرای هه‌مه‌وه‌ندیش وه‌لآمێكی جوانی دایـه‌وه، وتی:یاشێـخ تۆحه‌قتـه ئامۆژگاری من ده‌كه‌ی و ئه‌و ڕێگایه به‌خـراپ داده‌نێی كه‌من گرتوومه‌ته به‌ر ، به‌لآم بیشیزانه هه‌ر چۆن بـێ هـه‌ر مـن لـه‌تۆ باشـترم ،به‌س نییـه كـه‌من به‌ئاشكرایی دزوو جه‌رده‌یی ده‌كه‌م و ڕی ده‌گرم، خۆ تـۆ بـه‌ناوی ئایینـه‌وه جه‌رده‌یی ده‌كه‌ی و ڕێگای طه ریقه ت ده‌بڕی و له‌سـه‌ره ڕێـی طـه ریقـه‌دا دانیشتووی هه‌رده‌ر وێشكت بێته به‌رده‌ست ڕووتی ده‌كه‌یته‌وه)).[2]

---

[1] دیوان نالی لێكۆڵینه‌وه‌ی مه‌لا عبد الكریمی مدرس ل ٦٧١ ـ٦٧١

[2] دیوان مه‌حوی لێكۆڵینه‌وه‌ی مه‌لاعبد الكریمی مدرسل ٣٣٥

لـەدێڕی چـوارەمی ئـەم چـوارینەکەدەڵێ:(قوطـاعی طـه ریقـم ، نـه کوقوطاعی طه ریقـه ت) تـەوس و پـەلاره ناڕاسـتەوخۆ بەشـێخ دەڵـێ، مـن بەئاشکرایی ڕێگری دەکـەم بـەلاّم تۆلـەمن خـراپ تـری تـۆ بـە شـاراوەیی و بەخۆحەشاردانت لەبەرگی ئایینەوە جەردەیی دەکەی و ڕێگای طه ریقـه ت دەبڕی دەروێشەکانت ڕووت دەکەیتەوە .

## ڕاهێنان

**درکه وجۆرەکانی و تەوس لەم دێڕەشیعرانەی نالی دەربێنە**

١–له نووری موعجیزەی تیغی نەما قەت ظولمەتی شوبهەت
کەڕووناکی شەوی میعراجی ڕۆژی بەدری بورهانە

٢–دوور لەتۆ دڵ هێندە بێ ئارام و بێ حاڵ کەوتووە
ئەی مەسیحای عەصر! لەو لێوانە دەرمانی دەوێ

٣–شەرابی لەعلی ڕومەمانی لەنالی
حەرامە بێ مەزەی ماچێکی لێوان

٤–ئەگەر خەلوەت نیشین بێ جانی جانان بێ ئەنیسی ئەو
وەگەر هیجرەت گوزین ،ڕۆحی عەزیزان باری غاربێ

٥– ئەم عومرە عەزیزە کە لەبۆت نەقدو دراوە
صەد حەیف و دریغا کە موسڵمانی نەماوە

# جوانکاری

له جۆرەکانی جوانکاری واژەیی :

١– هاوبێژی/الجناس.

٢– دووابەسەر:ردالعجز علی الصدر

٣– سەروادار:السجع .

٤– پەیوەست بوون به پێویست:لزوم مایلزم .

٥– پەیوەست بوون بەناپێویست: لزوم مالایلزم .

٦– گێڕانەوە/الترديد:التفريع .

٧– پاتکردنەوە:التكرا ر .

٨– کەرتکردن :التشطير.

٩– پاشکۆدار:المستزاد .

١٠– لێ وەرگرتن:ألإقتباس.

١١– تێهەڵکێش: التضمين.

## جوانکاری (ألبديع) :

جوانکاری :(ألبديع) زانستێکە بەکاردێ بۆ ناسینی جوانی واژەو واتا،لەدووای گونجانی لەگەڵ باری پێویستی گوێگرو خوێنەر.[1]

ئەوەی لێرە بەشیاوی دەزانم ئاماژەی پێ بکەم، جوانکاری وەك هەردوو بەشەکەی تر - واتاناسی و ڕوونبێژی - بەشێکی زانستی ڕەوانبێژیە، کوردیش بەپێی تایبەت مەندی زمانی خۆی لەم هونەرە بێ بەش نەبووە، دەربڕین و گوزاریشتەکانی خۆی پێ ڕازاندووتەوە، بەتایبەتی شاعیرە دەست ڕەنگینەکانی سەردەمانی پێشوومان، توانیویانە زۆر شارەزایانە لەدەرگای باغی ئەم هونەرە بچنە ژوورەوە، لەچەپکی گوڵی ناسکی وشە شیعری جوان و پڕ واتاکانیان بهۆننەوە، بێ ماندوبوون وبێ ئەوەی هیچ کەم و کوڕیەك لەواتاو مەبەستەکانی دا هەبێ،جوانکاری لەشیعرو پەخشان کەبەم شێوەیەبێ، پێویستە زانینی ببێتە بەشێك لە بابەتەکانی ڕەخنە بۆحوکم پێ کردن و حوکم لەسەرکردن .

زانای بەناوبانگی ڕەوانبێژی عەڕبی (أبوهلال العسکری ٣٩٥ ه) دەڵێ:(ئەم جۆرە - جوانکاری - لەقسەو گوزارشتدا ئەگەر خۆ ماندووکردن و کەم و کوڕی پێوە دیار نەبوو لەوپەڕی جوانی دایە)[2]

---

[1] جواهر البلاغة ( احمد الهاشمی) ل ٣٦٠

[2] أبوهلال العسکری کتاب الصنعتین ل٢٦

## هاوبێژی ( ألجناس ) :

هاوبێژی: واتە وەك یەكی لەشێوەی وشە،جیاواز لەمانادا.[١]

ئەوەی لەم پێناسەیەدا پێویستە بەئاماژە بۆكردن، هاوبێژی لەدوو وشەیان لەچەند وشەیەك دابێ، دەبێ وشەكان بەیەك بچن،بەلاّم دەبێ هەریەكەیان مانای تایبەتی خۆی هەبێ،لەپێناسەكردنی هاوبێژی گەر لەبەر زیادەڕوونكردنەوە نەبێ پێویست ناكات بڵێین جیاواز بن لەمانا چونكە، ئەگەر لەمانا وەك یەك بن دەبن بەیەك وشە .

هاوبێژی ئەگەر بەشێوەیەكی سروشتیانەو ماندوبوونی پێوەدیارنەبێ و كار لەمانای بنەڕەتی دەقە هونەریەكان نەكات بەشتێكی جوان دادەنرێ، مرۆڤ لەو كاتە دوو وشەی وەك یەك لەشێوە جیاواز لەمانا دەبینی یا گوێی لێ دەبێ تام و چێژكی خۆشی لێ وەردەگرێ و پێوەی سەرسام دەبێ ئەگەر بەشێوەیەكی سروشتی و بێ ماندووبوون بوو ، ئەمەش وەك (إبن سنان الخفاجی ٤٦٦ هـ ) دەڵێ: (هاوبێژی) لەو كاتەجوانە كەبێ ماندوبوون دەستەبەربێ، شتێ نەبێ بكرێ بەمەبەست و جوانیەكەی خزمەت بەمانا نەكا)[٢]

ئەوەی لێرە بەپێویستی دەزانم ئاماژە ی پێ بكەم من كە ناوی(هاوبێژ)م هەڵبژاردووە بۆ ئەم هونەرەلەجیاتی (ڕەگەزدۆزی)چونكە: ((ئەوەی كەمەبەستەلە (ألجناس)دا، لەزمانی عەرەبی وتراوە ((جنس الأشیاء: شاكل

---

[١] جواهرالبلاغة (احمد الهاشمی) ل ٢٩٦

[٢] بلاغة العرب علی سلوم(د) ل٢٤

بين أفرادها وجانسه، أی شاکله)) لێرەدا واتای لێکچوون لەنێوان ئەو وشانەدا دەگەیەنێ و مەبەست لە لیکچوونی شێوەیە،(جنس ) ))[1]

ئەمە لەلایەك لەلایەکی تریش گەر مەبەست لە(ڕەگەزدوزی) دیاری کردنی ڕەگەزی وشەکان بێ لەگەڵ چەمکی پێناسەکەی ناگونجێ چونکە دەڵێین:وشەکان وەکو یەك بن ناڵێین: لە یەك رەگەزبن.

حاجی قادردەڵێ :

زۆر سەگم دیوە فەقەت ئەمدی ڕەقیبی هەندەسە
وەزعی نامەوزوون دەبێ وەك خانوویی بێ هەندەسە([2])

(هەندەسە) لەنیوە دێری یەکەم بەمانا هەندەسەگ (هەندەسە) لەنیوەدێری دووەم واتە: بێ ئەندازیاری، هەندەسەی یەکەم لەگەڵ دووەم هەر چەند لەجۆری پیت وەکو یەکن بەڵام بەهیچ شێوەیەك لەڕەگەز یەکنین لەلایەکی تریشەوە ئەگەر جوان بێ وشەی هاوواتا بەکاربێ بۆ ئەو وشانەی مانایان یەکە هاوبێژیش جوانە بۆ ئەو وشانەی وەك یەکن لەهەموو یان لەهەندێك لەپیتەکانی .

## بەشەکانی هاوبێژی

یەکەم: هاوبێژی تەواو: ئەوەیە وشەکان وەك یەك بن لە ژمارەو جۆری پیت و ڕێزبەندی و شێوە.[3] وەك ئەم جۆرانەی خوارەوە:

١–هاوبێژی تەواوی ڕەسەن لەنێوان دوو ناودا:

---

[1] هونەری ڕەوانبێژی لەشیعری نالی دا (عبدالسلام سالار ) ل١٣٧

[2] دیوانی حاجی قادرکۆیی پێداهاتنەوە ی هیرش بێتووشی ل١٨٨

[3] البلاغة الواضحة (علی جارم ومصطفی أمین ) ل ٢٦٥

حەمدی دەڵێ:

که ڕۆیشتی بەجاریێ من دڵ و جەرگ و هەناوم کەوت
کەچویتە (تانە) تانە سەر گلێنەی هەردوو چاوم کەوت

حەمدی ئەم هۆنراوەی لەکاتێك گوتوە کە شێخ مەحمود بەبەندی ڕەوانی شاری تانە کراوە لەهیندستان.[1]

((هاوبێژی تەواو لەنێوان (تانە)ی یەکەم کەشارێکی هیندستانەو (تانەی دووەم کەپەردە سپیە وەکو نەخۆشی تووشی گلێنەی چاودە بێ))[2]

هەردوو وشەش لەجۆری پیت و ژمارە و ڕێزبەندی وشێوە وەکو یەکن .

٢– هاوبێژی تەواو لەنێوان دوو کاردا:(ألجناس التام بین الفعلین)

نالی دەڵێ :

بـــڕی پارچـــەی غـــەزەل یـــارم کـــەوای کـــرد
بـــڕی بەنـــدی دڵـــم یـــارم کـــەوای کـــرد(٣)

(کەوای کرد)لە دێڕی یەکەم واتە جلی کەوای دروست کرد(کەوای کرد)لە دێڕی دووەم واتە: بەم جۆرە مامەڵەی لەگەڵ کردم .

هەردوو دەستەواژەی(کەوای کرد)کاری ڕابردوون لەجۆری پیت و ژمارەو ڕێزبەندی و شێوە وەکو یەکن .

---

[1] دیوانی حەمدی لێکۆڵینەوەی (جمال محمد محمد أمین) ل١٨٢

[2] گوڤاری ڕامان عبالله خدر /ژمارە٥٣/سالی/٢٠٠٠/ل/٨

[3] نالی دیوان لێکۆڵینەوەی/مەلاعبد الکریی مدرس ل٧١٥

٣- هاوبێژی تەواو لەنێوان کارو ناودا :

نالی دەڵێ :

ئێمە مەردین هەموو شێری خەشین پۆشی مەصاف

کرمی قەز هەرچی تەنی بۆ تەنی نیسوانی تەنی

مەصاف:مەیدانی جەنگ .کرمی قەز: کرمی ئاوریشم

(نالی) ئەم دێرە شیعرەی پەلارە بۆمیرزا شیرازی.(( واتە:ئێمە پیاوین . شێری پەلاس لەبەر کەری مەیدانی جەنگین..لەو خاوو خلیچکانەنین کەبەرگی ئاوریشم لەبەر دەکەن، چونکە کرمی ئاوریشم هەرچی ئاوریشمی تەنیوە،بۆلاشەی ئافرەتی تەنیوە..))[١]

هەردوو وشەی( تەنی)یەکەم بەمانا چنی کاری ڕابردووە دووەم بەمانا لەشە ناوە، لە نێوان ئەم هەردوو وشە لێکچوونێکی تەواو هەیە لەجۆری پیت و ژمارەو ڕێزو شێوە دا.

٤- هاوبێژی تەواو لەنێوان ئاوەڵناو و کاردا:

نالی دەڵێ:

هەتا شققەی فەلەك نەبوە بەکافوری کفن هەستە

کەئەم شەو فرصەتە،هێشتا فەلەك ماوی ئەتۆش ماوی

مانای وشە:کافوری کفن: کفنی سپی وەك کافور. ماوی: شینی کاڵی ئاسمانی. شەققە پارچە قوماش.فەلەك:ئاسمان. ماوی دووەم واتە: هێشتاماوی نەمردووی.

---

[١] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی‌مەلاعبدالکریم مدرس ل٦٧

((واتـە: ئـاخۆ ئاسمانـەکانی وەك پارچـەخامی سـپی کفـن نەپێچـراو نەتـــەوە، ئیســـرافیل فـــووی نـــەکردووە بەصـــوراو خـــەڵك هـــەمووی نەمردووە،ڕاست بەرەوە بیریَ لـەدووا ڕۆژی خـۆت بکـەوە.. هێشتـا هـەڵ لـەدەست دەرنەچووە دەرگای تۆبە دا نـەخراوە.. هێشـتا ئاسمـان شـینی کاڵەو تویَش ماوی،ئەگینا قیامەت داهات یا کەتۆ مردی مەیدانی تۆبە

کـردن نـامینیَ و دەرگـات لـەرووودا دادەخریَ.ئـەم بەیتـە ئیشـارِتە بـۆ ئایەتی (یوم نطوی السماء کالطی السجل للکتب )[١]

هاوبێـژی تـەواو لـەنێوان هـەردوو وشـەی (مـاوی) دایـە کـە یەکـەمیان ئاوەڵناوە بەمانا شین هاتووە ئەوەی تریان کارە. هاوبێژیەکـەش لـەجۆری پیت و ڕێزو ژمارە وشێوەدایە.

٥– هاوبێژی تەواو لەنێوان ناوو ئاوەڵناو لە نوسین یەکبن :

محسن دەڵیَ :

جــــــوان وەك گـــــــوڵی جوان،بـــــــەهاری دەویَ
کـــــەی دڵـــــی تـــــۆی پـــــڕ، ئـــــازاری دەویَ
لەخەنـــــدەی دەمـــــی، دیـــــارە پێـــــت دەڵـــــی:
لـــــــە پـایــــــزی پیری،گـوڵنـــــــاری دەویَ!([٢])

واتە:یاری ناو(جوان) کـەوەك گـوڵی جوانـە لـەتۆ خوشـی وەك بـەهاری دەویَ ،چـی لـە دڵـی پـڕ لەغـەم و ئەشـکەنجەو ئـازارە!بۆیـە هـەر کاتێـك دەیبینی بەدەمی خندەوە وا مەزانە بۆخۆشی و جوانی تۆیە ئـەم خەنـدە و

---

[١] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی/مەلاعبد الکریی مدرس ل٦٧١

[٢] (محسن أحمد مصطفی) گولزاری هۆنراوە دەست نووس

پێکەنینەی، بەڵکو ئاماژە دەکات و دەڵێ: ئەم پیرە لەپایزی تەمەنی گوڵی هەناری دەوێ، پایزو گوڵی هەناریش نەوتراوە.

لەدێری یەکەمی ئەم چوارینە دوجار وشەی(جوان) هاتووە یەکەم ناوە ئەوەی تریان ئاوەڵناو(صفة)ە بۆ وشەی(گوڵ) هەردوکیان هاوبێژن لەجۆری پیت و ڕێزو ژمارە و شێوە .

٦- هاوبێژی لەنێوان دوو وشەدا یەکیان سادە ئەوەی تریان ناسادە لەنووسیندا وەکویەك نەبن :

نالی دەڵێ:

موطمە ئین خاطرو ئەیمەن مەبە هەرگیز لەشەڕی
نەفسی ئەممارە، کەئەم مارە لەگەڵ تۆ شەڕ بیە

مانای وشە:موطمە ئین خاطر: دڵنیا.ئەیمەن:ئەمین .نەفسی ئەممارە: دەروونی فەرمان دەر بەخراپە کردن . شەڕبیە: شەڕیەتی. یا شەڕا نییە.

((واتە:هەرگیز دڵنیاو بێ ترس مەبە لەنەفسی خۆت کەڕێگای خراپەت پێشان ئەدا فەرمانت ئەداتێ کەخراپە بکەی و، هەڵت ئەخەلەتێنێ ..ماری نەفس لەمێژە لەگەڵ بنیادەمدا لەشەڕایەو ئەیەوێ بەلاڕێدا بەری و، مرۆی زیرەك نابێ پشتە سووربێ و پالێ لێ بداتەوە))[1]

هاوبێژی تەواو لەنێوان (ئەممارە) و(ئەم مارە) داهەیە ئەممارە وشەیەکە سادەیە ئەم مارە ناسادەیە هەردووکیشیان هاوبێژن لەجۆری

[1] دیوانی نالی لیکۆڵینەوەی مەلاعبدالکریمی مدرس ل٥٨٦

پیت و ڕێزو ژمارەی پیت و شێوەدا لەخوێندنەوەش وەکو یەکن لە نووسینیشدا جیاوازن.

٧- ها وبێژی ئاوێتە هەردوو وشەی هاوبێژ لە خویندنەوەو نوسین وەکو یەکبن :

حەمدی دەڵێ :

ڕۆژی ئێمە هەرلە ڕێگەی ئێوەدا ئاوادە بێ
هەرلە ڕێگەی ئێوەدا ئاوا ئەبێ ڕۆژی هەلاّت

هاوبێژی تەواو لە نێوان هەردوو وشەی ئاوێتە(ئاوائەبێ) دایە کەیەکەمیان بەمانای ئاوابوون و ئەوەی تریان بەمانا ئەو هادە بێت هاتووە.[1]

هاوبێژیەکەش لە جۆری پیت وڕیزو ژمارە وشێوە وەکویەکن .

٨-هاوبێژی ئاوێتە:هەردوو وشەی هاوبێژ لەخوێندنەوە وەکو یەکبن لە نووسین جیاوازبن.

نالی دەڵێ :

وەرە نێو بەزمی گوڵزاران و گوڵ زاران، تەماشاکە:
سەراسەر پێکەنینی گوڵ،لەبالەب غونچە پشکووتن

((لەم دێڕەشیعرەدا لە نێوان هەردوو وشەی (گوڵزارن) و(گوڵ زاران)دا هاوبێژی تەواو کەوتووەتەوە لە جۆرو ڕێزو ژمارەی پیتەکاندا وەکو یەکن

[1] گۆڤاری رامان (عبدالله خدر . د) ساڵی ٢٠٠٠/ژمارە/٨

یەکەمیان بەمانا باخچەیەو دووەمیان بەواتای کچێك دەمی وەکو گوڵ بێت))[1]

دووەم: هاوبێژی ناتەواو(ألجناس الناقص): ئەوەیە وشەکانی لە یەکێ لەو چوار مەرجانەی هاوبێژی تەواو جیاواز بن لە سێ یەکەی تریش وەکو یەکبن.[2]

## جۆرەکانی هاوبێژی ناتەواو:

### یەکەم: هاوبێژی کەم وەك :

١- پیتێکی کەم بێ لەسەرەتای وشەدا:

مەحوی دەڵێ :

لەبەر زارو نەزاری بوومە وەك پووش
دە ئەمجا ڕابوێرە من بەزارا

مانای وشە: زارو نەزار: لەڕو لاواز . فارسیە. زار: دەم .

((واتە: لەبەر دوو ڕوویی تۆ لەڕوو لاواز بووم،لە لەڕو لاوازیشدا وەك پوش زەردو باریك بووم . سا جارێك بەدەمتدا بێم ناوم بهێنی))[3]

لە نێوان زارو نەزار هاو بێژی ناتەواو هەیە وشەی یەکەم پیتێکی کەمترە لە وشەی دووەم (نەزار) بە ڕێنووسی کۆن .

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی /مەلا عبد الکریمی مدرس ل ٣٢٨
[2] ألبلاغة الواضحة ( علی الحازم ومصطفی أمین) ل٢٦٥
[3] دیوان مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ل٩

یا وەك نالی دەڵێ:

ئــەمجا مەوەســـتە تادەگییــە عــەینی سەرچــنار
ئاوێـــکە پـــڕ لــەنارو چنـــارو گــوڵ و چنـــوور[1]

وشەی (نار) پیتێکی کەمترەلە(چنار)

٢– پیتێکی کەم بێ لەناوە ڕاستی وشەدا :–

نالی دەڵێ :

یــەعنی گـــوڵاوی قودســـە گڵــاوی ڕە فــع ئــەکا
ئــەو خاکــە چـاکە پاکـەوو ئـەو ئـاوە مـە ظهــە رە

(( واتە مادەم گڵی مەدینە گوڵ و ئاوی لەئاوی کەوسەر بێ دیارە گڵ و ئاوی ئەبێ گولاوی خوا بێ گڵاوی گیـانی گوناهبـارانی پـێ ئـەکرێ و ئـەو خاکە چاك و پاکەی مەدینەو ئەو ئـاوە کەوسـەریەی ئـەبن بەشـوێن و هـۆی پاك کردنەوەی گیانی گوناهباران))[2]

لەنێوان وشەی( گوڵاو) و(گلاو) داهاوبێژی ناتەواو هەیـە دووەم پیتێکـی ناوەندی لەیەکەم کەم ترە .

هەروەها لەنێوان وشـەی(ئەو) و(ئـاو) داهاوبێـژی ناتـەواو هەیـە یەکـەم بەڕێنووسی کۆن پیتێکی کەمترە .

---

[1] نالی دیوان لێکۆڵینەوەی/مەلا عبدالکریمی مدرس ل١٧٨

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی/مەلا عبدالکریمی مدرس ل٤١٨

٣- پیتێکی کەمتربێ لەکۆتایی وشەدا .

نالی دەڵێ :

ساقی وەرە ڕەنگین کە بەپەنجە لەبی ئەقداح

بەم ڕاحە لەسەر راحە دەڵێن ڕاحەتی ئەرواح

مانای وشە: ساقی: مەیگێڕ، جاران لە کۆڕی خواردنەوەدا کچانی شۆخ مەییان گێڕاوە، لەوەوە(ساقی)بووە بەکینایە لە کچی جوان. ئەقداح: جەمعی قەدەحە بەمەعنا پیاڵەی مەی خواردنەوە.(راح)ی یەکەم: پێك.(راح)ی دووەم لەپی دەست. ڕاحەتی ئەرواح: ئارامی گیان .

((واتە: ئازیزە مەیگێڕەکەم، وەرە قەراخی پیاڵەی مەی بەپەنجەکانت ڕەنگاوی کە(مەبەستی لەوەیە کەپەنجەکانی بەخوێنی دڵداران سوورن. یاڕەنگین کینایەیە لەپیرۆزی، چونکە پەنجەی یار پیرۆزە. بەم پیاڵەی مەیە کەتۆ لەسەرلەپی دەستی دا ئەنێیت ئەڵێن: ڕاحەتی گیانە.))[1]

لەم دێڕەدا هاوبێژی کەم لەنێوان هەردوو وشەی(ڕاح)و (ڕاحەت) د کەوتووەتەوە

وشەی (ڕاح) پیتێکی لەوشەی(ڕاحەت)کەمترە کەمیەکەش لەکۆتایی وشەدایە .

٤- دووپیتی کەم بێ لەسەرەتای وشەدا:

نالی دەڵێ :

ئـــەهلی تەعـــداد و مەحاســـین نووســـیان

خـــاڵ یـــەك و، زولفـــی دووان، هەردووســـیان

---

[1] هەمان سەرچاوە ل١٦٤

مانــای وشــە: تەعــداد: ژمــارەکردن. مەحاسین:چــاکەو جــوانی. سییان:سێن. سیاهن: ڕەشن .

((واتــە: ئەوانــەی بــەدوای جوانیــدا ئەگــەڕێن و ئەیــژمێرن نووســیویانە یارخاڵێکی پێوەیەو دوو زولفی هەیە کەبەهەردووکیان(واتە:بەخـاڵ و زولف) ئەبـن بەسێ، یان خال و زولـفی،یان هەر دوو زولفەکەی ڕەشـن))[1]

لــەنێوان هــەر دوو وشــەی (نووســیان) و(ســیان) داهاوبێــژی کــەم کەوتووتــەوە وشــەی دووەم :دوو پیتــی لەوشــەی یەکــەم کــەمترە کەمیەکەشی لەسەرەتای وشە هاتووە.

**دووەم: هاوبێژی جــودا:** ئـەو هاوبێژیـە لـەنێوان دوو وشـەدابێ بـەجیاوازی پیتێك لەپیتەکانیاندا[2] وەك ئەمانەی خوارەوە

١–بەجیاوازی یەکەم پیتی ئەو دوو وشەیە یان ئەو وشانەی کە هاوبێـژ دەبن .

هێمن دەڵێ :

ئێمە ئاواڵـەین لـە گـۆشەی بێ کەسـیـدا غــەم نـەبێ
چاکە ئەو لێرەش وەفای هەر ماوە چاکەی کەم نەبێ([3])

لــە نێــوان هــەردوو وشــەی غــەم و کــەم دا هاوبێــژی ناتــەواو جــودا کەوتووەتــەوە ناتــەواو یەکەشــی لەوەدایــە کــەجیاوازن لــەجۆری پیتــی یەکەمیاندا لە(غەم) دا پیتی (غ)ە لە (کەم)پیتی(ك)ە

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی/مەلا عبدالکریمی مدرس ل٣٢٣

[2] جواهر البلاغة ( احمد الهاشمی) ل ٣٩٨

[3] تاریك وروون (هێمن ) ل١٣٢

٢–بەجیاوازی پیتێی ناوەڕاستی ئەو دوو وشەیە یان ئەو وشانەی کەهاوبێژ دەبن .

مەحوی دەڵێ :

موحەققەق هەرکەسێ مەسلەکیە حقق و حەقیەمە نظور
سلوکی چوونە سەرداره طه ریقه ی پیریه مەنصور

مەسلەك: ریگای گیراوەبەر. مە نظور: مەبەست .

((واتە: بێگومان ئەوەی بەدووای حەقدا بگەڕێ حەقی مەبەستبێ. دەبێ بۆی بچێتە سەردارو لەپێناویدا خۆی بدا بەکوشت. ئەو ڕێگایەکەمەنصوری حەللاج ـ ٢٤٤هـ ـ کەسەر دەستەی حەق خوا هان بووە گرتۆیەتیە بەرو پیادا ڕۆیشتووە))[1]

لێرەدا هاوبێژی ناتەواو جودا لەنێوان هەردوو وشەی (مە نظور) و(مەنصور) کەوتووەتەوە،ناتەواویەکەش لەوەدایە کەهەردوو وشەجیاوازن لەجۆری پیتێکیاندا کە لەناوەڕاستدا هاتووە و لەوشەی یەکەمدا(ظ)ە لەوشەی دووەمدا(ص)ە .

٣– بەجیاوازی لەپیتی کۆتایی ئەو دوو وشەیە یان ئەو وشانەی کە هاوبێژ دەبن .

نالی دەڵێ :

لەگەڵ مورغی چەمەن ((نالی)) دە نالێ
کەیەعنی عاشق وهەم فەردو فەردین

---

[1] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس ل١٢٧

مورغی چەمەن: پەلەوەڕی ناو مێرغوزار. هەم فەرد: هاو سەرو هاو دەرد. فەرد: تاقانە .

(واتە: نالی لەگەڵ بولبولی ناو باخدا هەمیشەخەریكی نالآنە، جووتە دڵدارێكی ڕاستەقینەن، بەسۆز پێكەوە دەناڵێنن و بەجیهانی پێشان دەدەن كەوا هەردوكیان گرفتاری دەردی دڵن: پەلەوەری چەمەن دڵداری گوڵەو نالیش گرفتاری یار)) [1]

لەم دێرەدا هاوبێژی(ناتەواو- جودا)لەنێوان هەردوو وشەی (فەردو) و(فەردین) دا كەوتووەتەوە ناتەواویەكەش لەوەدایە كەجیاوازن لەجۆری پیتی كۆتاییدا. ئەوەی شایانی باسەلەبارەی هاوبێژی جودا ئاماژەی بۆبكەین دووشتە: -

١- هاوبێژی جودا ئەگەر پیتەكانی جیاواز یان لەیەكتر نزیك بوون دەبێ بە هاوبێژی (موضاریع) بەیەك چوو. [2]

نالی دەڵێ :

كوڕ تازەوو تەڕ مادام سادە وەك خوشكی بێ
ئەمما كەڕوا سەبزە، دیبا كوڕو،ذیبا كچ( [3])

هاوبێژی جودای موضاریع بەیەك چوو.لەنێوان(دیبا)و(ذیبا) دایەچونكە پیتی(د) لە دیبا پیتی(ذ)لەذیبا لەیەكتر نزیكن لەدەنگدا.

---

[1] دیوانی نالی لێكۆڵینەوەی مەلا عبد الكریمی مدرس ل٣٥٤

[2] علم البیان ( عبدالعزیز عتیق.د). ل١٦٠

[3] دیوانی نالی لێكۆڵینەوەی مەلا عبدالكریمی مدرس/١٦٠

٢- هاوبێژی جودا ئەگەر پیتەکانی جیاوازیان لەیەکتر دوو ڕیوو دەبێ بەهاوبێژی لاحیق:[١]

نالی دەڵێ :

ئـــەلا ئـــەی ئاســـکی ناســـک بەباســـک
شـــکاندت گـــەردەنی ســـەد شـــێری شـــەرزە ![٢]

وشەی(ئاسک) و (ناسک) و(باسک) لەم دێڕدا پیتی یەکەمیان لەیەکتر جیاوازن لەهەمان کاتیشدا لەیەکیش دوورن لەدەنگدا.

**سێیەم : هاوبێژی ئاڵۆز:** ئەوەیەلەنێوان دوو وشە یان زیاتر ڕێزی پیتەکانیان وەکویەك نەبێ:[٣]

نالی دەڵێ :

خاطرێکی(شۆخ) و(خۆش)و بێ غەم و جەمعم هەبوو
ئێستە بۆ زولفی کەسێ مەشـقی پەرێشانی دەکا([٤])

لەنێوان وشەی (شۆخ) و(خۆش) دا هاوبێژی ناتەواو- ئاڵۆز دروست بووە، ئەم دوو وشەیەش لەڕێزی پیتەکانیا جیاوازن و پێچەوانەی یەکترن بۆیە لەو کاتەکەهاوبێژی جیاوازن پێچەوانەشن

---

[١] علم البد يع/د.عبدالعزيزالعتيق/١٦٠

[٢] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مد رس/٤٤٩

[٣] جواهرالبلاغة/أحمد الهاشمي/٤٠٢

[٤] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس/١٠٤

**چوارەم : هاوبێـژی ناتـەواوی ڕەهـا**: ئەوەیـە هـەردوو وشـە یـان ئـەو وشانەی هاوبێژ دەبن پیتی سەرەتاو پیتی كۆتاییان وەكویەكبن.جیـاوازیش بن لەجۆریان ڕێزیان ژمارەی پیتەكانی ناوەوەیان.(1)

نالی دەڵێ :

دەمێكـــــە وا لەســـــــەر پێیـــــەك دەســــــووتێم

لــــە شــــەوقی تــــۆ بــــە میثلــــی مــــۆم وەهــــەرمام(2)

لەنێوان هەردوو وشەی مۆم و مام دا هاوبێـژی ناتـەواو كەوتووەتـەوە، ناتەواو یەكەش لەوەدایەكەپیتی ناوەوەیان لەیەكتر جیاوازن.

**پێنجـەم : هاوبێـژی لار( المحرف )**: ئەوەیـە وشـەكانی لەسـەرو(فتحـة) ژێرو(كسرة) بۆرو (ضمة) جیاوازبن.(3) ئەمەش تایبەتە بەوشـەكانی زمـانی عەرەبی، چونكە سەرو بۆرو ژێر(الحركـات والشـكل)لەجیاوازیاندا جـۆری لار دروسـت دەكـەن، بـەڵام لەڕێنووسـی كوردیـدا ئـەم جـۆرە بـەدی ناكرێـت، چونكە ئەو سەرو بۆرانە لەرینووسی كوردیدا بەپیت دەژمێرێن، كەبەپیتیش دانــران ئــەوا وەكــو پیتــەكانی تــری زمــانی كــوردین لەجیاوازیانــدا هاوبێـژی(جودا)دروست دەبێت .

ئەو وشەعەرەبیانەی خزاونەتە نـاو زمـانی كـوردی وەك وەشـەی كـوردی تەماشایان دەكرێ ،ڕێنوس وڕێـزمانی ئەوزمانەی بەسـەردا دەچەسپێ(4)

---

1 جواهرالبلاغة/أحمدالهاشمی/٤٠١

2 دیوانی نالی لێكۆڵینەوەی مەلا عبد الكریمی مدرس ل٢٦٣

3 علم البدیع عبد العزیز عتیق/١٦١

4 گۆڤاری كۆڕی زانیاری كو رد بەرگی /٩/٥٠٥

**شەشەم : هاوبێژی لەنێوان بەخاڵی وبێ خاڵی دا( التصحيف ) .**

بەلای من هەمان هاوبێژی جودایە کەباسمان کرد، چونکە بوونی خاڵ و نەبوونی واتە جیاوازی پیت،جیاوازی پیتیش دەبێ بەجیاوازی دەنگ.بەم شێوەیەش هاوبێژەکە دەبێ بەهاوبێژی(جودا)ئەگەر دەنگی پیتەکان لەیەکتر نزیك بوون دەبێ بەهاوبێژی جودای بەیەك چوو(موضاريع)،ئەگەر دەنگی پیتەکانیش لەیەکتر دوور بوون دەبێ بەهاوێژی(لاحق)بەخاڵی وبێ خاڵی هیچ گرنگی یەکی بەدەستەوە نادات، زۆرجار وادەبێ خاڵ هەر بوونیشی لەسەر پیتەکان نییە بەلآم لەبەر ئەوەی دەنگەکانیان لەیەکتر جیاوازە دەبێ بەهاوبێژی ناتەواوی جودا.

حەمدی دەڵێ:

بووتی چاکە دەلیلم بێ ذەلیلم دەستی پێ دەگرم
لەشاگردانی کوڕی عشقم و جێ هەر لەوێ دەگرم

((وشەی(دەلیلم)لەگەڵ (ذەلیلم) هاوبێژ_ (تصحيف)یان پێکهێناوە لەوشەی دووەم تەنیا(خاڵی) سەردەنگی (د) لەیەکەم زیاترە))[1]

بەلآم ئەوەی من بۆی دەچم هەر وەکو وتم هاوبێژی ناتەواو لەبەر بوونی بەخاڵی و بێ خاڵی نییە،بەڵکو لەبەر جیاوازی هەردوو دەنگی(د) و(ذ)ە ئەوەی لەنێوان ئەم دوو وەشەداهەیە تەنها لەشێوەی نووسین بەیەکتر دەچن.

---

[1] گۆڤاری ڕامان/ژمارە/٥٢٥/لاپەرە/٩

نالی دەڵێ:

لەدوگمـــەی ســـوخمە دوێنـــێ نوێـــژی شـــێوان
بەیـــانی دا سفیـــدەی بـــاغی سێـــوان[1]

لـەنێوان وشەی(شـێوان) و(سـێوان) هاوبێـژی جـودای لاحیـق هەیـە کەبەلای زۆران پێی دەوترێ هاوبێژی تەصحیف لەبەر بوونی خاڵ لەسـەر پیتی یەکەمی شێوان و نەبوونی لەسەرپیتی یەکەمی سێوان، بەڵام ئەوەی هاوبێژی ناتەواوی دروست کردووە بەخاڵی و بێ خالی نییـە، بـەڵکو لەبـەر جیاوازی هەردوو پیتـی (ش )و(س)ە جیـاوازی پیتـیش دەبـێ بـەجیاوازی دەنـگ بۆیـە هـەر هاوبێـژی یـەك بـەم شـێوەیەبێ دەبـێ بەهاوبێـژی جودای(لاحیق) ئەگەر پیتەکانی لەیـەکتر دووربـوون، ئەگـەر پیتەکانیشـی لەیـەکتر نزیـك بـوون دەبـێ بـە هاوبێـژی( جـودا)ی( موضـاریع) هـەروەك باسمان کرد.

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی/مەلا عبد الکریمی مدرس/٣٢٠

## ڕاهێنان

### جۆری هاوبێژی لەم دێڕە شیعرانە نە دیاری بکە

١-ڕوحـــــــم بــــەفیدات ئەی گـــــولّی گـــوزاری مەدینە
لــوفت هـــــەبێ ڕوو وابکـــــە مەقصــــــــوودی مەدینە

وەفایی

٢-ئـــەو زوولفـــە دووتایـــــە، چ تەلەسمێکـــە چ دامـــە
ســـووتاوە ئـــەوی پوختەیــــــە بـــەو عەنبـــەرە خامـــە

وەفایی

٣-بـــەس عـــــومری مـــن بەبـــــادە، رووت بێنــە زولفــت لادە
دلّ بویـــــە نـــــامرادە ، بەوشـــــــــەوە ڕۆژ گـــــێراوە

وەفایی

٤-یـــار هاتـــەوە دەســـت ودلّـــی خـــوم گـــرت وبەســـەر چـــووم
جـــان قـــابیلی جانـــا نـــەبوو، نـــەمزانی بەســـەر چـــووم

٥-بەکەسك وسوور، باغ دە روو ژوور، پڕبوو لەنوور، وەك کێـوی تـوور
لەبەر زهوور کەوتـە حـوزوور، نـەزدیك و دوور، دەشـت ودەمـەن

وەفایی

٦-تـــالّ وشـــیرین پێکـــەوە چـــابێ نەمـــدیوە چـــابێ چـــانەبێ
هـــەر کەســـێکی هەمنیشـــینی چـــانەبێ پێـــت چـــانەبێ

حەریق

٧-ئـــەی شـــــۆخ وشـــــەنگ دلّبـــــەرو نـــــو نـــــەمام
بــــەنووکی تـــــیری نەشـــــتەری برژانگـــــە مـــــن نـــــەمام

کۆشکی

## دووا بۆ سەر : رد العجز علی الصدر

دوابۆسەر: لەو هونەرە جوانکاریانەیە کە زانایانی ڕەوانبێژی لێی دوواون و پێناسەی وردیان بۆ کردووە، یەکەم کەسیش کە لەبارەی ئەم هونەرە دووابێ(عبداللەابن المعتز۲۹٦هـ) بووە بەیەکێ لەهونەرە گرنگەکانی دەست نیشان کردووە کەئەمانەن :-

۱- دوا وشەی کۆتایی دێڕی شیعر وەك وشەی نیوەی دێڕی یەکەم بێ.

۲- وشەی کۆتایی دێڕی شێعر وەك وشەی یەکەم بێ.

۳- وشەی کوتایی دیڕی شیعر وەك وشەی هەندێ شوێنی تری دێڕەکەبێ.[1]

منیش بەپێی بەدووا داچوونم بۆ پێناسەی ئەم هونەرە و ڕوانینم لەشیعری هەندێك لەشاعیرانی وەك نالی و مەحوی دەڵێم : دوابەسەر ئەوەیە نیوەی دێڕی دووەم لەگەڵ نیوەی دێڕی یەکەم و دووەم لەچەند شتێك وەکو یەك بن یان لەیەکتر بچن .

نموونە :

۱- وشەی کوتایی دێڕی دووەم یەکبێ لەگەڵ وشەی سەرەتای دێڕی یەکەم :

نالی دەڵێ :

شەوبۆیی سەری سونبولی زوڵفت لەسەری دام
ئێستەش سەرەکەم مەستە لەبەر نەشئەیی شەوبۆ! ()

---

[1] علم البدیع/د.عبدالعزیزعتیق/۱۷۵

لەم دێڕەدا وشەی (شەوبۆ) کە لەکۆتایی دێڕەکەدا هاتووە وشەیەکی تریش کە زۆر لەو دەچی لەسەرەتای دێڕەکەدا هاتووە کە(شەوبۆ) یە .

٢- وشەی کوتایی دێڕی دووەم وەك وشەی ناوەڕاستی دێڕی یەکەم بێ .

مەحوی دەڵێ :

نەبوە نابینی لەشەو مەحرەم تر تا ڕۆژی حەشر

پەردە پۆشە،هەمدەمە،هەمدەردی عوشاقانە شەو[٢]

مەحوی وشەی(شەو)ی لەم دێڕەدا دوو جاری هێناوەتەوە، لەناوەڕاستی نیوەی دێڕی یەکەم و لەکۆتایی نیوەی دێڕی دووەم .

٣- وشە کۆتاڵیی نیوەی دێڕی دووەم وەك وشەی کۆتایی نیوەی دێڕی یەکەم بێ .

مەحوی دەڵێ :

کەم بوو وەك ئەو دەمە،صیدق ئەم دەمە هەم کەم بووە قات

فەرەحی نەك بەدووابێ، غەم و هەم بووە قات[٣]

وشەی قات دووجار هاتووەجارێکیان لەکۆتایی نیوەی دێڕی یەکەم، جارێکی تریان لەکۆ تایی نیوەی دێڕی دووەم .

٤- وشەی کۆتایی نیوەی دێڕی دووەم یەك بێ لەگەڵ ناوەڕاست و کۆتایی نیوەی دێڕی یەکەم :

---

[١] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی/مەلا عبدالکریمی مدرس/٣٨٦

[٢] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی/مەلا عبدالکریمی مدرس/٢٥٨

[٣] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوی مەلاعبدالکریمی مدرس/٦١

مەحوی دەڵێ :

ڕووتی دی لەو ڕۆژەوە،گەر ڕۆژە سەر گەردانە ڕۆژ
گەییە ئێوارە وەکو من ئیشی قوڕ پێوانە ڕۆژ[1]

وشەی ڕۆژ کەبەیەك مانا بۆ سێ جار هاتووە جارێکیان لەکۆتایی نیوەی دێڕی دووەم جارێکیش لە ناوەڕاست و لەکۆتایی دێڕی یەکەم .

٥–وشەی کۆتایی نیوەی دێڕی دووەم لەگەڵ وشەی کۆتایی و سەرەتای نیوەی دێڕی یەکەم .

نالی دەڵێ:

شەوی یەلدایە،یا دەیجوورە ئەمشەو
کە دیدەم دوور لەتۆ بێ نوورە ئەم شەو؟![2]

وشەی(شەو) لەم دێڕەدا سێ جار هاتووە جارێکیان لەسەرەتاو لە کۆتایی دێڕی یەکەم جارێکی تریش لەکۆتایی دێڕی دووەم .

٦–وشەی کۆتایی نیوەی دێڕی دووەم وەك وشەی سەرە تای نیوەی دێڕی دووەم:

مەحوی دەڵێ :

کە نادا ((مەحویا))دادی بەحاڵت
بەسی بێ دادو ئاه و ناڵە، بابەس[1]

---

[1] هەمان سەرچاوە/١٣٧

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی/مەلاعبد الکریمی مدرس ل٣٨٧

وشەی(بەسی بێ) و(بابەس) دووجار هاتووە جارێکیان لەسەرەتای نیوەی دێڕی دووەم جارێکی تریش لەکۆتایی هەمان دێڕ .

٧–وشەی کۆتایی نیوەی دێڕی دووەم وەك وشەی ناوەڕاستی نیوەی دێڕی یەکەم و سەرەتای نیوەی دێڕی دووەم :

مەحوی دەڵێ[٢]:

غەنیمەتە،بەدەم دەستی بگرە دامەنی دۆست
لەدەستی خۆتی مەدە،داویە خودا تا دەست([٢])

وشەی(دەستی)(لەدەستی) (تادەست)سێ جارهاتووە جارێکیان لەکۆتایی نیوەی دێڕی دووەم و جارێکیش لەسەرەتای هەمان دێڕو لەناوەڕاستی دێڕی یەکەم .

ئەوەی پێویستە ئاماژەی بۆ کرێ جاری وا دەبێ وشە لە ڕەگەز دا لەگەڵ وشەی کۆتایی یەك دەبێ جا ئەو وشەیە لەهەر شوێنێك بێ لەو شوێنانەی کەباسمان لێوەکرد.

نالی دەڵێ :

تەشبیهی حوسنی فائیقی ئاخر، بەچی بکەم!
نووری سونووحی طه لعه تی سەد لەوحی ئەنوەرە

وشەی(ئەنوەر)کەلەکۆتایی دێڕەکەدا هاتووە وشەیەکی تریش کە لەسەرەتای نیوەی ئەم دێڕە هاتووە کە(نوور)ە ڕاستەوخۆ وەکو ئەو نییە

---

[١] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس/١٤٦

[٢] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس /٧٠

بەلاٌم لەڕەگەز لەگەڵ (ئەنوەر) یەکن،(نوور) ناوە(ئەنوەر) ناوی پەسندیدەیە (إسم التفضیل)ە[1]

ئەم هونەرە تایبەت نییە هەر بەشیعر، بەڵکو لەپەخشانیش جێگای خۆی کردووتەوە،(خطیب القزوینی ٧٣٩هـ) لە پێناسەی ئەم هونەرە لە(پەخشان) دادەڵێ:ئەوەیە یەك لەدوو وشەی دوو بارە کراوە یان هاوبێژ لەپەخشان لەپێشەوە بێ وشەکەی تریش لەدووای ئەوەوە بێ.[2]

حەسەن قزلجی دەڵێ :

((کورد هەرچەند کەجێگاکەی کوردستانە،کێوو کەژو سەخت و ساردو سڕە، دیسان لەزگ زان نەوەستاوەتەوە، وجاغ کوێر نەبووە، بارامی چوبین کەلەپێش ئیسلامدا خوسرەوی پاشای ئێرانی ڕاوناوە کردی بەماڵی قەشەدا، سەلاحەددینی ئەیوبی کە ڕۆژ هەلآتی لەدەست درێژی ئەوڕوپا ڕزگار کردو کونە مشکی لە(ڕیچا لدشێردڵ - ی پاشای بەریتانی)کردە قەیسەری، ئیبن و حەنیفەی دینەوەری ئیبن و خەلەکان لەمێژو زانیداو ،ئامیدی و شارەزووری لەڕێ و شوێنی ئیسلامدا، ئەحمەدی خانی و مەولەوی و بێسارانی لەجیهانی ئەدەبدا نموونەی بەرزو بەنرخی هەڵکەوتووەکانی کوردن))

لەم دەققە پەخشانیە وشەی کورد دووجار هاتووە یەکەم لەسەرەتای پەخشانەکە دووەم جاریش لەکۆتایی کەدەڵێ(کوردن) هەردووکیان هاوشێوەو هاو واتان.[3]

---

[1] هونەری ڕەوانبێژی/عبدالسلام سالار/١٥٧

[2] تلخیص المفتاح فی علوم البلاغة/خطیب القزوی /ضمن شرح برقوقی ٣٩٢-٣٩٣

[3] جوانکاری لەئەدەبی کوردیدا/ئیدریس عەبوللا/٣٨

## ڕاهێنان

شێوازی دووا بۆ سەرلەم دێڕە شیعرانە دیاری بکە

ئەو گەو هەرە نیکتە کەلە((نالی)) دەدزن خەلق

ئاوی نییە، وەك ئاگری بێ شەوقی دزانە

نالی

لەسایەی ڕوویی تۆوە شامی خەلقی طەلعەتی صوبحە

لەشامی زولفی تۆوە صوبحی ئێمە ظولمە تی شامە

نالی

بێ بێنە گوڵی ژاڵە هەم بێبەرە هەم تاڵە

قەد سەرو سنەوبەر کچ ،چاونێرگسی شەهلا کچ

نالی

پیری نفووزی کردە بەدەن ، بەسیە تەنبەلی

دەرچوو لەخانوێ کە خەلەل گەییە تەنبەلی

مەحوی

## سەروادار: السجع

سەروادر:گونجان و یەکبوونی دوو بڕگەیە لەپیتی کۆتایی وشە[1] چاکتریشی ئەوەیە بڕگەکانیان یەکسان بن.

## گرنگی سەروادار

ئەوەی لێرە پێویستە ئاماژە بۆکەین، شارەزایانی بواری ئەم هونەرە لەلایانی بایەخ و بەهای جوانی سەروادار، وەك هونەرێکی جوانکاری، هەندێکیان دەڵێن: لەبەرئەوەی ئەم هونەرە خۆپێوەخەریك کردن و ماندوبوونی دەویّ بۆهێنانەدیّ و دروستکرنی، بۆیە باش وایە بەدووا داچوونی بۆنەکەین، چونکەدەرکەوتنی بەشێوەیەکی ناسورشتییانە دەبێتە هۆی لەدەستدانی پلەی بەرزی ڕونبێژی و نیشاندانی ماناو مەبەست بەشێوەیەکی نارێك ، هەندێکی تریش بوونی سەرواداری بۆجوانی دەربڕین بەشێوازێکی پڕبایەخی ڕەوانبێژی دزانن دەڵێن: ئەگەر پەسندو جوان نەبوایە لە قورئانی پیرۆز بەم چڕو پڕیە نەدەهات، هەروەك دەبینین سوڕەتێك نییە سەرواداری تێدا نەبیّ لەناوسوڕە تەکانیش سوڕەتی واهەیە هەر هەمووی سەرواداره وەکو سوڕەتی (الرحمن، القمر...)هەروادەڵێن: خۆ پێوەخەریك کردن هەر لەم هونەرە دانییە،لە هونەرەکانی تریش لەڕەوانبێژی بوونی هەیە،کەم و کوڕیش کە لەمەبەست و مانا ڕوویدا لەبەر خودی سەرواداری نییە، بەڵکو لەبەر کەم شارەزایی نووسەرەکەیەتی.[2]

---

[1] بلاغة العرب/د.علی سلوم/٢٥٠

[2] هەمان سەرچاوە/٢٥١

## مەرجەکانی سەروادار

١- هەڵبژاردنی وشە دەبێ بەشێوەیەکی دروست بێ.

٢-وشە شوێنکەوتەی واتابێ

٣- هەریەکە لەڕستە سەروادارەکان واتا یەکی جیا لە ئەوەی تر بکەیێنێت.[1]

## جۆرەکانی سەروادار

**یەکەم :کێش دارو بێ سەروا :**

وەکو((گیانی بەدەنگ و باسی گەڵێ علمی بەنرخ گەشاندوۆتەوە، پاشان پێی ناوەتە مەیدانی هونەران و کەوتۆ تە ڕەوتەوە ))

(گەشاندووتەوە) و(کەوتووتە ڕەوتەوە)لە هەموو لایەکی سەروادریدا وەکو یەك نین هەرچەند لەڕووی کێش هاو شانن.[2]

دووەم : لە سەروادری وەکو یەکن بەلاَم لەکێش جیاوازن ئەمەشیان سێ جوری هەیە:

١- هاوسەر: ئەوەیە بەچەند ڕستە بەدووای یەکدابێن لەپیتی دوواییدا وەکو یەکبن، لەلایان ژمارەی پیت و کێشەوە جیاوازبن :

وەکو((پێشەنگی کاروانی دوڕناسان ، خەرقە پۆشی ئاهەنگی مەی نۆشان، شەیدا بەرێی پاکی یەزدان ، مەفتون بەناڵەی دەروێشان ))

لێرەدا لەدوو پیتی دوواییی دا وەکو یەکن کەهەموویان((ا، ن))ە بەلاَم لەکێش و ژمارەی پیتەکان جیان.[1]

---

[1] علم البديع/د.عبدالعزيزعتيق/١٦٨

[2] خوشخوانی علاء الدين سجادی ل١٤٢

٢– هاوکێش: ئەو سەروایانەن لەچەند ڕستەیەك بە دووای یەکدا دێن لەکێشدا هەرچەند وەکو یەکن،بەڵام لەبنچینەدا لەیەکتر جیان.وەکو :

((ئەو نازدارەی ئاهونیگارە، لەناو شەپۆلی شەوی بەهارا،کەگرینگی دا بەترس و لەرز، دای لەدیمەنی گوڵاڵەی گەشاو، ڕەنگ و بۆ دایگرت ئاسۆی زمناکۆ، لە هەرلایە هات دەنگی قریوە))[٢]

ئێمە لەوکاتەلەکێشی ئەم پەخشانە دەڕ وانین دەبینین هەموویان وەکویەکن بەڵام لەپیتی بنچینە لەیەکتر جیاوازن.[٣]

٣– هاو ڕوو: ئەم بەشە ئەوەیە کە سەرواکان لەدوایی ئەو ڕستانەوە دێن کە بە شوێن یەك دان، ئەمانە لە هەموو ڕوویەکەوە ڕێکن، لە کێش و ژمارەو پیت تەنانەت لە پیتی پێش پیتی بنچینەییشدا هەریەکن.

((وەکو:کانیاوی بەفراوی سەرچیاکان بەخوڕ لەکاتی بەهارا، ئەڕژێنە خوارەوە، گوڵ ئاوی شەکراوی سەر کۆنیان وەکو مرواری لەساتی نیگادا ئەکەوێتە زارەوە ))[٤]

ئەوەی ماوە لێرە ئاماژەی پێ بکەم سەروادار وەك هونەرێکی سەرنج ڕاکێش لەپەندی پێشینان و لەچیرۆکی ئەفسانەیی و زۆری تر جێگای خۆی کردووتەوە وەکو لە پەندی پێشینان هاتووە (هەر دەوەنە دەبێ بەدار،لە بنیا دادەنیشێ فەقیرو هەژار) لەچیرۆکیشا وەکو (ئەو ڕۆستەمی داستانە،ئەو پاڵەوانی زەمانە،گورزی هەڵسووڕاندو دایهێنا،لەگەڵ

---

١ هەمان سەرچاوە ل١٤٢

٢ هەمان سەرچاوە ل١٤٢

٣ هەمان سەرچاوە ل١٤٢

٤ خوشخوانی علاء الدين سجادیل١٤٢-١٤٤

ئەستێرانی جووت ئەکرد،ئاگری لێ دەباری،کەلێی دا خستی،چۆکێکی ئەوتۆی لەدەفەی سنگیدا،یەکی ئەوتۆی لێ بەردا،گاسنی تەورێزی پێ سوور بکرێتەو ە)[1]

ئەم هونەرە تایبەت نییە تەنیا بەپەخشان، بەڵکو لەهۆنراوەش جێگای خۆی کردووتەوە :

مەحوی دەڵێ:

سەر کەجۆشێکی نەبێ، من زرکە تاڵم بۆچیە !
دڵ کەهۆشێکی نەبێ، شیشەی بەتاڵم بۆچیە !([2])

[1] هەمان سەرچاوە ل١٤٤
[2] هەمان سەرچاوە ل١٤٤

## ڕاهێنان

سەرواو جۆری سەروادار لەمانەی خوارەوەدیاری بکە

١– ((کۆترە باریکە دەنگ پڕ لەیاهوو،کوڕەی ئەودەنگە گوڕتر لەئاهوو.. گوڵاڵەی باخچەی عیتلی جافەکان، گەلاڵەی بوخچەی فیکری کوردەکان ..هەڵکەوتوویێکی سەربەخۆ لەمەیدانی شیعرا ، سەرکەوتوویێکی خۆبەخۆ لەبازاری خێرا ..کەوتوو بەدوای چاوی مەستەوە تاهۆشی کردەوە، تینوو بە ڕۆژی ڕووتی کوردەوە..شۆخ و شەنگ و لاوچاك بووە،دەست بەتفەنگ و سوار چاك بووە.....)) سەججادی

٢–((ئەو نیشتمانەی سەرچاوەیێکی هەرە دەوڵەمەندی کەلەپووری میللی و فۆلکلۆرە ولاّتی چیاو شیعرو هەوێنی داهێنانە،دایکی بەوەفای باباتاهیرو جزیری و بێسارانی و ئەحمەدی خانیٚ و حاجی قادری کۆیی و نالی و مەولەوی و گۆرانە،مەڵبەندی جوانی بێگەردی سروشتی هەردەم زیندووە،گۆڕەپانی جۆرەها زوڵم و زۆرداری و ململانیٚ چینایەتی ونەتەوەیی و تواندنەوەو داپەڵۆسینە))

٣– (ئێمەی لە گوێی گادا خەوتوو،بەسەدەو ساڵ،مانگ و حەوتوو،هەرکوست کەوتوو.. سەرمان کاسە، هەرنەمانزانی : چ باسە؟ لەشوێنەکێلان وێڵین،زورگ و ڕەقەنان دەکێڵین..کێشەی کۆنمان ژیاندووتەوە،تۆی شەڕمان چاندووتەوە))

## پەیوەست بوون بە پێویست: ( لزوم مایلزم )

پەیوەست بەپێویست: واتە: پەیەست بوون بەپیتێك، یان بەزیاترلەپیتێك، لەپێش ئەوپیت و بزوێنەی کەسەروای پێکهێناوە، بۆ کاریگەری زیاتری مۆسیقا.[1]

شارەزایانی بواری ڕەوانبێژی دەڵێن:ئەدیب وشاعیران گەردەستێکی باڵایان لەم هونەرە نەبێ باخۆیان توشی ڕەخنەی ڕەخنەگران نەکەن و لێی بەدوور بکەونەوە.ئەوەی لێرە بۆمان روون دەبێتەوە خۆ خەریك کردن بەم هونەرە بۆیە بۆ هەمووشاعیرو ئەدیبێك بەباش نازانرێ،چونکە گەر لەبارەی ئەم هونەرە توانای تەواویان نەبێ مەبەست و مانا بەپێی پێویست بەدەستەوە نادات، وادەکات مانا دواکەوتەی واژەبێ،ئەمەش شتێکی نەویستراوە، بەلاَم هاتنی ئەم شێوازە لەقورئانی پیرۆز لەسەرووی ئەوشێوازەیەکەلەدەربرینی مرۆڤە، قورئان کەلەلایان خواوە دابەزیوەبەجوانترین شێوە داڕێژراوەو بەهێزترین و وردترین دەربڕاوەوە، بەرزترین پلەی باڵای ڕەوانبێژی بەخۆیەوە گرتووە[2]

ئەوەی لێرە دەردەکەوێ گرینگی ئەم هونەرە بۆجوانی و ڕێکترکردنی سەروای شیعرو سەرواداری پەخشانە،چونکە ئەم هونەرە چەند جوان بێ تام و چێژی خۆشتر دەبێ، زیاتر گوێی بۆ دەگیرێ،کاریگەری ئاوازی مۆسیقاکەی لەدلاَ جێگیر تر دەبێ، سەرەرای ئەوەش توانای شاعیر بەرجەستە دەکات لەلایان زمانەوانی وهونەری .

---

[1] علم البدیع /د/عبدالعزز عتیق/١٨١.
[2] هەمان سەرچاوە/١٨١–١٨٥

محسن دەڵێ :

ئەمـــەت لـــەکوێ بـــوو بۆچـــی ناپرســـی؟
دوێنێکـــە ڕووت بـــووی هـــەر وەهـــا برســـی
لـــەناکاو چـــۆن بـــووی بـــەخاوەن ســـامان ؟
ئـــەم پلـــەت چـــۆن بـــوو، بـــەبێ ڕاپرســـی ؟[1]

لەم چوارینە وشەی(ناپرسی، برسی، ڕاپرسی) پیتی(ی) لەم وشانە سەرڕوای هۆنراوەکەی دروستکردووە پیتی(س) و(ر) لەهەرسێ وشەکاندا پەیوەستە سەروان بۆ جوانی و ڕێکی سەرواکە هاتوون .

## جۆرەکانی پەیوەست بوون

١–بوونی پەیوەستەی یەك پیتی

محسن دەڵێ:

کوشـــندە تـــرین دەرد، ببینـــی زۆردار
خراپـــە ئەنجامـــدا، پێـــی بڵـــێن شاکـــار
چـــی لـــەدەم دەرچـــی، بیکـــەن بـــە یاســـا
بـــۆ هـــەموو کـــارێ، هـــەر ئـــەوبێ ســـالار[2]

پیتی(ر)لەهەرسێ وشەی(زۆردار) (شاکار) (سالار) سەرڕوای چوارینەکەی پێکهێناوە پیتی(ا)پێش(ر) ەکەش لە هەرسێ وشە پەیوەستن بۆ ڕێکی سەرواکە هاتوون .

---

[1] گوڵزاری هۆنراوە/محسن أحمدمصطفی/ دەستنووس

[2] گوڵزاری هۆنراوە/محسن أحمدمصطفی/ دەستنووس .

٢-بوونی پەیوەستەی دوو پیتی :

نالی دەڵێ :

عومرێکە بەمیزانی ئەدەب توحفە فرۆشم
زۆرم وت و کەس تێ نەگەیی، ئێستە خەمۆشم[1]

پیتی (م) لەهەردوو وشەی(فرۆشم) (خەمۆشم) سەروای پێکهێناوە (ش)(ۆ) تەواوکەری جوانی سەرواکەیە.

٣-بوونی پەیوەستەی سێ پیتی :

مەولەوی دەڵێ :

نازک تەدارەك فەصڵ وەهاران
شیرین ئارایش هەر دەو کۆساران
گوڵ چۆن ڕووی ئازیز نەزاکەت پۆشان
وەفراوان چۆن سەیل دیدەی من جۆشان

(واتە: وەرزی بەهار چەند ناسك و جوان خۆی ڕێخستووەو هەردوو کوێستانەکان چەند جوان خۆیان ڕازاندووتەوە،گوڵ وەك ڕووی یار بەرگی ناسکی پۆشیوەو بەفراو وەك لافاوی چاوی من هاتووەتە جۆش))[2]

پیتی(ن)لەوشەی(وەهاران)و(کۆساران)سەروای پێکهێناوە پیتەکانی (ا، ر، ا) پەیوەستن بۆجوانی سەروا هاتوون ،

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الکریمی مدرس/٢٨٠
[2] دیوا نی مەولەوی لێکۆڵینەوەی/مەلا عبد الکریمی مدرس/٤١٤

پیتی(ن) لەوشەی (پۆشان) و(جۆشان)بەهەمان شێوەی پێشووسەروای پێکهێناوە (ا،ش، ۆ )بۆجوانی سەرواهاتوون .

٤– بوونی پەیوەستەی چوارپیتی :

نالی دەڵێ :

سەری هەموو بەدەنم طەرزە تەمەننایێکە
گەردەشی نووکی سەرم دووکەڵی سەودایێکە[١]

پیتی(ە)لە هەردوو وشەی (تەمەننایێکە) و(سەودایێکە)سەروای پێکهێناوە پیتەکانی (ک،ی،ێ،ا) پەیوەستن بۆجوانی و دەرکەوتنی سەرواکە هاتوون .

٥–بوونی پەیوە ستەی پێنج پیتی :

مەحوی دەڵێ :

دڵی سووتا بەحاڵی زاری طیفلی دڵم و چاری کرد
سەری زولفی لەدەم نا، زەهری ماری پڕی زاری کرد

((واتە: یارلای خۆی بەزەیی بەدڵەی کۆرپەی گرینۆکمدا هاتەوەو ژێری کردەوە، سەری زولفی لەجیاتی گۆی مەمك نایە دەمی و لەجیاتی شیر ژاری خۆشەویستی تێ دادۆشی لەو کاتەوە تائێستا دڵم بەدەم دەردەوە دەتلێتەوە)[٢]

---

[١] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس/٤٦١

[٢] دیوانی مەحویلێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس دیوانی /١٠٨

پیتـــی(د) لەهـــەردوو وشـــەی (چـــاری کـــرد) و(مـــاری کـــرد) ســـەروای پێکهێناوە پیتەکانی(ا، ر، ی، ك، ر) بۆ جوانی سەروا هاتوون.

٦- پەیوەستەی شەش پیتی :

مەحوی دەڵێ :

لەمەیخانـــــــەخودا! گەرئێمـــــــــە دەرچـــــــین،
بـــــەکی بـــــەین ئیلتجـــــا، بۆکێهەدەرچـــــین ؟[1]

پیتی (ن) سەروایە(ی،چ، ر،ە، د، ە)پەیوەستەن بۆ پێکهێنانی جـوانی سەروان.

[1] دیوانی مەحوی‌لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس دیوانی ل ٢٤٨

## ڕاهێنان

جۆرەکانی بوونی پێویستە سەروا لەم شیعرانەی عەونی دیاری بکە

١–وەک هەڵۆ لانەم لەکێویکی بڵند هەڵبەستووە
چەندی بەردم تێبگرن، تازەبەکەس هەڵنافڕم
تێگەیشتم چەند هەڵم کردو، فریێم خواردبوو
توبە بۆ توبە ،ئیتر دەستی برای خۆم نابڕم

٢–خودایە تۆ دروستت کرد سروشتم
لەخوانی نیعمەتی تۆ پێگەیشتم
نییە چاکەم لەبۆ ڕۆژی حیسابم
کە لوتفی تۆنەبێ من بەد ڕەوشتم
بەبێ هوودە ژیانی خۆم بەسەر برد
لەبێ بەختی درەنگ من تێگەیشتم

٣–برایان،ئاشنایان،دۆست و یاران
دەناڵێنم ،وەکو هەوری بەهاران
لەسۆزی سینەو،جەرگی بڕاوم
کە خوێن سەرکا لەچاوم عەینی باران
مەکەن لۆمەم،کەبێ ئارام وصەبرم

٤–وەکوشێت گەر بکەومە کۆهساران
بەسووکی تێمەگە ئەم خاکە لاتان زۆر بەقیمەت بێ
هەمووی هەر خاکی دەست و پی و ، زارێکە

ئەگەر تۆ هەڵکەنی،سا ناودڵی خاك بۆت بەدەربێخی
چ جێگای ئاوەدانیبێ،چ جێگای شوێنەوارێکە
ئەگەربێت وبەچاوی دڵ سەرنج بگری،دەزانی تۆ
کەشار وێران بووە، وێرانەیە ئیستاکە شارێکە

٥-ئێستامن پیرم و،شوێن دڵداری لاوی ناکەوم
ڕێ سەرەو هەورازە بۆ خۆم تێ دەگەم سەرناکەوم
دوای هەمووزانست و تاقی کردنەوم،ماوەی ژیان
من بەهاندانی ئەم وئەو تازە هیچ تێناکەوم
من بەڵێنم داوە هەتا ماوم بەسەر بەرزی بژیم
گەر سەرم بڕوا لە ڕێ دا، قەت لەژێر پێ ناکەوم

## پەیوەست بوون بەنا پێویست/لزوم مالایلزم

پەیوەست بەنا پێویست: پەیوەست بوونە بەپیتێك یان چەند پیتێك لەو پیتانەی دەکەونە پێش پیتی سەرواو بەپەیوەست نەبوونیشی کەم و کوڕی ڕوونەدا.[1]

ئەوە ی لەم پیناسەیەدا دەردەکەوێ لەپەیوەست بەناپیویست خۆ بەستانەوە بە پیتی پێش سەروا مەرج نییەو بەپێویست نازانرێ . واتە پەیوەست بوون بەنا پێوێست (لزوم مایلزم) لەبەر ئەوەی ئەو پیت و بزوێنانەگەر زیادیش نەکرێن، هۆنراوە یان پەخشانەکە سەروای خۆی هەر هەیە،یاسای زانستی سەروا پێویستی پیَ نییە.

مەحوی دەڵێ :

جیهـــــانی کـــــردووە سەرخـــــۆش ومەدهـــــۆش
لـــەبی، وەك بـــادە، خـــەگی ســـەبزی وەك بـــەنگ
مەگـــــەر خـوێنـــــم سیجافـــــی بـــیَ بەریـــــدەم
کـــوا ئـــەو دامەنـــەم کەوتـــووتە بـــەر چەنـــگ

سجافی: وەك سیجاف. سیجاف: پەراوێز. دامەن: داوێن .چەنگ: چنگ،دەست .

((واتەمادەم کەدەستم لەداوێنی یار گیر بووە، نابێ بەری دەم، مەگەر گیانی تێدا نەمینێ و خوێنم وەك ڕەنگی پەراوێزی کاڵ ببێ .عادەت وایە ئەو پارچەیەی دەکرێ بە پەراوێزی کەوا سوورێکی کاڵە.[1]

---

[1] علم البدیع /دعبدالعزز عتیق/١٨١

پیتی (گ )سەروایە لە(لەنگ)و لە(چەنگ) مەحوی کە دەڵێ چەنگ خۆی پەیوەست کردووە بەپیتی دووەمی پێش سەرواکە بۆی هەبوو بڵی(چنگ )

مەحوی دەڵی :

ئەوپارە پەرستانە لەخۆیان کە دەچن زوو
دەخڵی نەپەلی دێوە، نەبای باڵی پەری بوو
عاقلن و، فقەط فیێ لەگەڵی دیتنی پارەن
ماهی نەوی ئەم قەومە هەلالی قەمەری بوو

مانای وشە: نەو: نوێ، تازە قەمەری : دراوێکی عوسمانییە وێنەی مانگی یەك شەوەی پێوەیە.(٢)

مەحوی لەم چوارینەخۆی پەیوەست نەکردووە بەپیتی پێش سەرواکان لەسەروای دێری یەکەم دەڵێ (دەچن زوو) لەدووەم دەڵێ (پەری بوو ) لەچوارەم( قەمەری بوو)

## گێڕانەوە:الترديد

گێڕانەوە: هێنانەوەی وشەیان ڕستەیە، لەدووای وشەیان ڕستەی پێش خۆی، بەڵام ئەمجارەیان بۆ ئەمەیە لەگەڵ شتێکی تر بیگونجێنی.(٣)

ئەم هونەرە وەك هونەرەکانی تری جوانکاری واژەیی دەبینین شاعیرانمان زۆر بەجوانی و بێ ماندوبوون، بەشێوەیەکی سروشتیانە ئەم

[١] دیوانی مەحوی‌لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس /١٩٩

[٢] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس/٣٥٢

[٣] جواهرالبلاغة/أحمد الهاشمی/٣٦٦

هونەرەیان بەكارهێناوە و،جێگایان بۆكردووتەو لەنێوگولزارو دیوانی شیعرەكانیان،مەبەست و هەست و سۆزی خۆیانیان پێ ڕازاندووتەوە .

جزیری دبێژی :

شەككەر دنیڤ لێڤانەوی - ریحان لدۆر سیڤانەوێ
مەشعەل دنیڤ شێڤانەوێ - تەیسیی ژرەنگێ فەنەرێ

واتە: شەكری شیرین لە نێو لێوانیەتی - مەبەستی قسەی خۆشی یارە كە لەدەمی دەردەچی - زولفی وەك رێحان لەڕەشی و بۆن خۆشیدا، پێچی خواردووتەوە لەسەر كولمی وەك سێوی سووری و لەسەر ڕووی تیشكداری،لەناو داوەمووی ڕەشی وەك شەو ئەدرەوشێتەوە، وەك چرایەكی ڕووناك تیشكی بۆ هەموو لایەك بڕوا.[1]

(وی)لەم دێرەداسێ جارهاتووە هەرجارە لەگەڵ واتایەك گونجاندوویەتی، جارەك لەگەڵ شەكەر، جارێك لەگەڵ رێحان، جارێك لەگەڵ مەشعەل لەشەوان .

وە فایی دەڵێ :

بە شیرینی كەجان بەخشی، بەمەحبووبی كەدڵكێشی
ئەتۆ هەرئابی حەیوانی، ئەتۆ هەر ماهی كەنعانی([2])

ڕاناوی (ئەتۆ) دووجار هاتووە هەرجارە گونجاندوویەتی بەشتێك جارێ بە(ئابی حەیوان) جارێكی تر بە(ماهی كەنعان)

---

[1] العقدالجواهری شرح دیوان الجزری أحمد الزفنطی ل٤٦٠

[2] دیوانی وەفایی لێكۆڵینەوەی/محمد علی قەرەداغی /٢٠٢

محسن دەڵێ:

جـــــوان وەك گــــوڵی جـــــوان،بەهاری دەوێ
کــەی دڵـــی تـــۆی پــــڕ، ئـــازاری دەوێ ؟!
لەخەنـــدەی دەمـــی، دیارە،پێـــستـ دەڵـــێ :
لەپـایـــــزی پـــــیری، گوڵنــــــاری دەوێ[1]

لەم چوارینە سێ جار وشەی (دەوێ)کاری ڕانەبردوو هاتووە هەر جارە دراوەتـە پـاڵ شـتێك، جارێـك دراوە تـەپاڵ (بـەهار)جارێك (ئـازار) جارێـك (گوڵنار)

[1] گوڵزاری هۆنراوە/محسن أحمدمصطفی/ دەستنووس

## ڕا هێنان

شێوازی گێرانەوە لەم دێڕە شیعرانەی وەفایی دیاری بکە:

١– بەشیرینی کەجان بەخشی بەمەحبووبی کەدڵکیشی
ئەتۆ هەر ئابی حەیوانی ، ئەتۆ هەر ماهی کەنعانی

وەفایی

٢– وەنەوشە و گوڵ لەباغان بوو ،لەباغان شەوچراغان بوو
مەگەر دارووی نەساغان بوو، بەڕوودا زوولفی تاتا کرد

وەفایی

٣– دڵم پڕ خوێن و خوێنبارە بەغەمزەی نازی چاو مەستان
هەتا نەمرم ڕەها نابم ،لەمەکرو سیحری چاومەستان
ئەتۆ سەروێکی نازداری، ئەتۆ شۆخیکی گوڵزاری
بەدڵ واچاکە بتگێرم لەسەرچاوان، لەسەردەستان

وەفایی

٤– نەشەیتان و نە دەوران و نەخزمانم بە من ناکەن
ئەوی نەفسی خەسیسم ((مەحویا)) کردوویە دەربارەم

مەحوی

## پاتکردنەوە /التكرار

پاتکردنەوە: ئەوەیە لەدووای دەربرینی مەبەست، وشە بۆچەند جارێك لە سنووری دێڕی شیعردا بوترێتەوە بەهەمان واتای مەبەست:[1] وەك بۆ:

١-دەربڕینی بێ هێزی بەوێنەی هەست پێ کراو :

نالی دەڵێ :

لـــــــە دووری نـــازەنیـنـــــــم ڕەنـــــــــگ زەردم
وەکــو بەی،هـــەر وەکــو بـــەی هـــەر وەکــو بـــەی([2])

٢- بۆپیاهەڵدان و سەرسوڕمان :

نالی دەڵێ :

بحمـــــد اللـــــە دوو چـــــاوی یـــــارم ئـــوّخـــــــەی
بـــەبێ مـــەی مەستـــە، بـــێ مـــەی مەستـــەبێ مـــەی!([3])

لە نیوەی دێڕی دووەم دووجار(بێ مەی مەستە) هاتووە جارێکیش (بێ مەی هاتووە مەبەست پیاهەڵدان و سەرسوڕمانە .

٣- بۆچاوەڕوانیی و مژدەپێدان :

نالی دەڵێ:

گـوتـت ((نـــــــــــــــالی)) ئـەتۆ بمـرە، ئـەمن دێـم
خـــودا کـــەی بـــێ، خوداکـــەی، بـــێ خـــوداکەی([1])

---

[1] هونەری ڕەوانبێژی/عبد السلام سالار/١٠٢
[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی /مەلا عبدالکریمی مدرس/٧١٢
[3] هەمان سەرچاوە /٧١١

لەنیوەی دووەمی ئەم دێڕدا سێ جار(خوداکەی بێ) هاتووە ئەگەر هەرسێ بەمانا خوایەکەی بێ بمرم، بێ ئەبن بەیەك واتا بۆمەبەستی چاوەڕوانی وگەیشتن بەمژدە کەیەتی.

٤- بۆبەردەوامی غەم و پەژارە:

نالی دەڵێ:

لەنـــــەهرێنی دووچـــــاوم ئەشـــــکی خـــــوێنین
پەیـــــاپەی دێ، پەیاپـــــەی دێ پەیاپـــــەی([2])

مانای وشە: نەهرێن: جووتەجۆگا. پەیاپەی :یەك لەدووای یەك.

لە نیوەی دووەمی ئەم دێردا سێ جاردەستەواژەی (پیاپەی دێ) هاتووە بۆ مەبەستی بەردەوامی غەم و پەژارە .

ئەوەی شایەنی باسەئەم هونەرە لەشیعری عەرەبیش بوونی هەیە(ابن النبیه١٢٢٢م) لە پیاهەڵدانی (علم الدین ابن الصاحب١٢٨٠م )دەڵی:[3]

إبـــــن ظـــــاهرالنســـــب ،إبـــــن ظاهرالنســـــب إب
ن ڤاهرالنســـــــــب ،إبـــــــن ظاهرالنســـــــب

یاوەکو(متنبی٢١٥-٢٦٥٢م) لەستاییشی (سیف الدولة ٩١٥-٩٦٧م) دەڵێ :

العـــــارض الهـــــتن إبـــــن العـــــارض الهـــــتن إب
ن العـــــارض الهـــــتن إبـــــن العـــــارض الهـــــتن

[1] هەمان سەرچاوە/٧١٠

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی /مەلا عبدالکریمی مدرس /٧١٢

[3] ألبدیع فی شعرابن النبیة/د.شعبان أحمد بدیر/ئەنتەرنیت

## ڕاهێنان

**شێوەی پاتکردنەوە لەم دێرە شیعرانە دیاری بکە**

١-شـەوێ لـە بـیرە خـەودا جـەمالی ویـم بـەدڵ دی
دووچـاوی مەسـت و کـاڵم وەکـو غـەزالی سـڵ دی

وەفایی

٢-ئیلاهـــی بـــێ بـــەلاّبێ نـــەخلی بـــالآت
بـــەری بـــۆمن بـــەلاّ بـــوو هەربەلاّبـــەس

مەحوی

٣-دلم دەرهـــات و تـــۆ هـــەر دەرنـــەهاتی
نـــەهاتی هـــەر نـــەهاتی هەرنـــەهاتی

مەحوی

٤-وەرە موگریـــب بـــە کـــویری چـــاوی ئـــەغیار
صـــەدای نـــەی دێ ،صـــەدای نـــەی دێ صـــەدای نـــەی

نالی

٥-شـــەوی هیجـــرو بـــەقای عـــومری ڕەقیـــبم
خـــودا طـــه ی بـــێ خـــودا طـــه ي بـــێ خـــودا طـــه ی

نالی

## کەرتکردن/ التشطیر

کەرتکردن: دابەشکردنی دێڕی شیعرە هەمووی یان نیوەی بۆچەند کەرتێکی سەروادار لەگەڵ بوونی سەروای گشتی.[1] وەك ئەمانەی خوارەوە:

١-کەرتکردنی نیوە ی دێڕی شیعر بۆ چوار کەرت، یەکەم و دووەم هاوسەروابن:

ئەدب دەڵێ :

لەلایێ شاهدوسادە، لە لایێ ساقی وبادە
لەلایێ مەی،لەلایێ نەی، وەکومەحشەر،کە بەرپابێ([2])

نیوەی دووەمی ئەم دێڕە کراوەتە چوار کەرتەوە کەرتی یەکەم ودووەم هاو سەروان .

٢- نیوەی یەکەمی دێڕی شیعربکرێت بەچوارکەرتی هاوسەروا :

نالی دەڵێ :

مل عەلەم،شیرین قەلەم، ئاهوو شکەم مەیموون قەدەم
سم خرو کلك ئێستر، مەنزل بڕۆ،عارەق نەڕێژ([3])

نیوەی یەکەمی ئەم دێڕە کراوە بەچوارکەرتی هاوسەروا .

---

[1] هونەری ڕەوانبێژی/عبدالسلام سالار/١٥٨

[2] دیوانی ئەدەب/ مصباح الدیوان/١٠٥

[3] دیوانی نالی لێکۆڵینەوی مەلاعبد الکریمی مدرس/٢٢٥

٣- کەرتکردنی دێڕی شیعر بۆچوارکەرتی هاوکێش کەرتی یەکەم و دووەم وسێیەم سەروایان وەك یەکبێ، سەروای کەرتی چوارەم گشتی بێ .

نالی دەڵێ:

سەربەردە بازی ڕێتە، تەن تەختە بەندی جێتە
دڵ مەیلی خاکی پێتە، ڕوح ماڵی خۆتە بیبە([1])

ئەم دێڕەشیعرە کراوە بەچوارکەرتی هاوکێش کەرتی یەکەم و دووەم و سێیەم یەك پەیوەستەسەروای ڕێکن،کەرتی چوارەم لەسەروای (ە)لەگەڵ گشتی سەروای کەرتەکانی تربەیەك دەگەنەوە.

٤-نیوەی دێڕی یەکەم هاوکێش و هاوسەروابن، نیوەی دووەمی دێڕکە بکرێ بەدوو کەرتی هاوکێش بەڵام سەروایان جیاوازبێ .

نالی دەڵێ :

ئەی چاوی پڕنەدامەت، دڵ پڕغەم و غەڕامەت
بگری،کەوشکە صوّفی لەم فە یضە بێ نەصیبە([2])

نیوەی یەکەمی ئەم دێڕەی کردووە بەدوو کەرتی هاوکێش و سەروادار، نیوی دێڕی دووەمیشی کردووە بەدووکەرت،کەرتی دوایی سەرواکەی گشتی یە.

---

[1] هەمان سەرچاوە /٣٩٥

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوی مەلاعبد الكريمی مدرس /٣٩٧

٥–کەتکردنی نیوەی دێڕی دووەم بۆ دووکەرتی هاوکێش و هاوسەروا :

نالی دەڵێ :

((نالی))سەرت لەگونبەتەکەی خانەقادەکا
لایێ پڕە لەمەشعلە، لایێ پڕە لەمەشغلە([1])

نیوەی ئەم دێڕەی کردووە بەدووکەرتی سەروادار،کەرتی دواییش سەرواکەی گشتییە.

٦– کەرتی یەکەمی نیوەی دێڕی یەکەم لەگەل کەرتی یەکەمی نیوەی دێڕی دووەم هاوکێش و هاوسەروابن، هەر چوار کەتەکەش هاوکێش بن :

نالی دەڵێ :

نەوالەی تۆبە دەربێنە،هەتاتەن نەبووتە سفرە
پیاڵەی شیشەبشکێنە، هەتا وەك کووپە نەشکاوی([2])

کەرتی یەکەم لەنیوەی یەکەمی ئەم دێڕەدا هەروا کەرتی یەکەم لەنیوەی دووەمی ئەم دێڕەدا هاوکێش و هاوسەروان .

٧–دابەش کردنی دێڕی شیعر بۆشەش برگەو کەرتی نیوەی دوایی و کەرتی یەکەم لەگەل نیوەی دوایی کەرتی دووەم هاوکێش و هاوسەروابن.
نالی دەڵێ :

عەزیزم ، روحی شیرینم، دوو چاوم
دەوای زامی، دڵ و جەرگی بڕاوم([1])

---

[1] هەمان سەرچاوە/٤٦٩

[2] هەمان سەچاوە/٦٨٥

لەم دێڕەدا نیوەی کەرتی دووەم لەیەکەم لەگەڵ نیوەی کەرتی دووەم لەدووەم هاوکێش وهاوسەروان.

## پاشکۆدار /المستزاد

پاشکۆدار:ئەوهۆنراوەیە هەرنیوە دێڕێکی پاشکۆیەکی هەبێ، هەردوکیشیان واتاو سەروای سەربەخۆیان هەبێ کەبەجیاواز بخوێنرێنەوە یان بوترێن.[٢]

ئەم هونەرە ئەگەربەکەمیش لەشیعری شاعیرەکانمان بکەوێتە بەرچاو، بەلأم هەندێکیش لەشاعیرەکانمان ئەم هونەرەیان زوربەجوانی بەرهەم هێناوە بۆنموونە

نالی دەڵێ:

ئەی تازە جەوان !پیرو ئوفتادەوو کەوتووم
تا مارە حەیاتم

دەستێ بدەرە دەستی شکەستم ،کەبەسەرچووم
قوربانی وەفاتم

تۆ یووسفی ئەوحوسنی لەسەر میصری جینانی
من پیرم و فانی

لەم کولبەیی ئەحزانە نە زیندوم و نە مردووم
هەروا بەتەماتم

فەرقێکی نەکرد نەفسی نەفیسم بە عینایەت
وەحشی لە ویلایەت

---

[١] دیوانی نالی لێکۆڵینەوی مەلاعبد الکریمی مدرس /٢٩٣

[٢] هونەری ڕەوانبێژی/عبدالسلام سالار/١٦٢

لـــەم گۆشـــەیی وێرانەیـــە هـــەر مامـــەوە وەك بـــووم

وەیشـــــــــــوومی ولاّتم

ئـــەی قوببـــەیی کەیبـــە کـــەدەڵێی حـــوققیی گیبـــی!

بـــــــەو بۆنەوەهـــــــاتم

هەرچـــەندە کـــە مـــن عەبـــدم و ڕوو زەردم و عاصـــیم

مـــــــــەئموولە خـــەلاصیم

قوربـــــانی بیـــــلالم کـــــــە هیـــــلالانە هەڵاتـــــووم

هـــــــــەر عەفـــوە خەڵاتم

موددەتێکـــە کـــە هـــەم گەردەشـــی دەوانـــی ســـوپیهرم

مـــــــــوغبەڕ بووە میهرم

ئاوێنـــــەیێ دڵشـــــایدە هـــــەر چـــەندە ســـــییەهـ ڕووم

مـــــیرئاتی جـــــــــەلاتم

ئـــەی مەســـجید و میحـــراب گـــەهت قیبلـــەیی حاجـــات

بـــــــۆ ئەهلی مونـــاجات !

مـــەحجوویی هـــەوام و ، ئەمەتـــە مەشـــهەدی مـــەعلووم

بـــــــۆ ڕاهی نەجـــــــاتم

ئـــــــــــەی مەکلەعی هەمـــوو قاصی یو دانـــی

شـــــــــــەمسی صـــەمەدانی

وەك زەڕرەیـــی بـــێ جیلـــوە نەمـــەوجوودم نەمەعـــدووم

جـــــــۆبایی بـــــــــەراتم

لـــەم خـــاکی ڕەحمـــەتی بـــێ زەحمەتـــە ، ((نـــالی))

فیردەســــــــــــە مەئـــالی

حاشـــا کەلەمێـــدا ببمــــە ســـائیلی مـــەحروم
هــــەرچەند لەعوصاتم([1])

لـەم هونراوەیـەدا دوای هـەرنیوە دێڕێك پاشـکویەك هـاتووە دێرەکـان ئەگەرئەوپاشکۆیەشیان نەبێ کێش وسەرواو واتای خۆیان هەرهەیـە ودێـڕی سەربەخۆ پێك دێنن بەم شێوەی خوارەوە :

ئــەی تــازە جــەوان !پــیرو ئوفتــادەوو کــەوتووم
دەســتێ بــدەرە دەســتی شکەســتم ،کەبەسەرچــووم
تــۆ یووســفی نەوحوســنی لەســەر میصــری جینــانی
لــەم کولبــەیی ئەحزانــە نــە زینــدوم و نــە مــردووم
فــەرقێکی نــەکرد نەفســی نەفیســم بــە عینایــەت
لــەم گۆشــەیی وێرانەیــە هــەر مامــەوە وەك بــووم
ئــەی قوببــەیی گەیبــە کــەدەڵێی حــوققیی کیبــی !
ئــەی قوببــەیی گەیبــە کــەدەڵێی حــوققیی کیبــی !
هەرچــەندە کــە مــن عەبــدم و ڕوو زەردم و علصــیم
هەرچــەندە کــە مــن عەبــدم و ڕوو زەردم و عاصــیم
قوربــانی بیــلالم کــــە هیــلالانە هەڵاتــــووم
موددتێکــە کــە هــەم گەردەشــی دەوانــی ســوپیهرم
ئاوێنــەیێ دڵشــایدە هــەر چــەندە ســییەه ڕووم
ئــەی مەســجید و میحــراب گــەهت قیبلــەیی حاجــات
مــەحجوویی هــەوام و ، ئەمەتــە مەشــهەدی مــەعلووم
ئــەی مەگلــەعی هــەموو قاصــی یــو دانــی

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوی مەلاعبد الکریمی مدرس ل ٢٧٠

وەك ژەررەیـــی بـــێ جیلوەنەمـــەوجوودم نەمەعـــدووم

لـــەم خـــاکی ڕەحمـــەتی بـــێ زەحمەتـــە ، ((نـــالی))

حاشـــا کەلەمێـــدا ببمـــە ســـائیلی مـــەحروم

پاشـــکۆکانیش ئەگەربخرێنـــە ســـەریەکەوە دێـــڕی شـــیعری واتادارپێـــك دەهێنن بەم شێوەی خوارەوە :

تا ماوە حەیاتم

قوربانی وەفاتم

من پیرم و فانی

هەروا بەتەماتم

وەحشی لە ویلایەت

وەیشوومی ولاّتم

بەو بۆنەوەهاتم

مەئموولە خەلاصیم

هەر عەفوە خەلاّتم

هەر عەفوە خەلاّتم

موغبەڕ بووە میهرم

میرئاتی جەلاتم

بۆ ئەهلی موناجات !

بۆ ڕاهی نەجاتم

شەمسی صەمەدانی

جۆبایی بەراتم

فیردەسە مەئالی

هەرچەند لەعوصاتم

یاوەك خادیم دەڵێ :

هەرلەحزە بەشكڵێ خۆی ئەنوێنی بتی عەییار    پەیـــداو نیهـــان بـــوو
هـەردەم بەلیباسێكی ئـەدا پـرتـەوی دیـدار    ئـەم شـۆخەعەییان بـوو
گاهێ لـەسـەری كوچـەو بـــازاری ئەبینـم    دیبـــای دوكـــان بـــوو
خۆی بوو لەهەمووجێگە بـەسـەراف لـەبـازار    نەقـدی دڵ وجـان بـوو[1]

لەم هونراوەیەداوەك هۆنراوەی پێشوو دوای هەرنیوە دێڕێك پاشكویەك هاتووە دێرەكان ئەگەرئەوپاشكۆیەشیان نەبێ كێش وسەرواو واتای خۆیان هەرهەیە ودێڕی سەربەخۆ پێك دێنن بەم شێوەی خوارەوە :

هەرلـــەحزە بەشـــكڵێ خـــۆی ئـــەنوێنی بتـــی عـــەییار
هـــــەردەم بەلیـباسێـــكی ئەداپـــرتـــــەوی دیـــدار
گـــاهی لەســـــەری كـوچـــــەو بـــــازاری ئەبیـــنم
خـــــۆی بـــــوو بەســـــەراف لـەهـەمـووبــــــازار

پاشـــكۆكانیش وەك پاشـــكۆكانی هـــۆراوەی یەكـــەم ئەگەربخرێنـــە سەریەكەوە دێڕی شیعری واتادار پێك دەهێنن بەم شێوەی خوارەوە :

پـەیـــــــــداو نیـهـــــــــان بـــــــــوو
ئـــــــــەم شـــــــــۆخەعەییان بـــــــــوو
دیبـــــــــای دوكـــــــــان بـــــــــوو
نەقـــــــــدی دڵ وجـــــــــان بـــــــــوو

---

[1] دیوانی خادیم ٢٩٢

## لێ وەرگرتن : الإقتباس

لێ وەرگرتن: هێنانی هەندێكە لەدەقێك بۆ ناو دەقێكی تر بۆ جوانی و پیرۆزی، بێ ئەوەی ناوی لێ وەرگێڕاو بێنی.[1]

ئەوەی پێویستە ئاماژە بۆكەین ئەم لێ وەرگرتنە بەزۆری لەقورئانی پیروزو لە فەرموودە وەردەگیرێ،[2] لێ وەرگرتن وەك بابەتێكی جوانكاری بەم شێوانەدەبی:-

١- لێ وەرگرتن لەقورئانی پیرۆز وەكوحەمدی دەڵێ :

توخوامەكەن مەنعی، هەرچی بكا حاجی فەرەج

چونكەخوا فەرموویە:(لیس علی الأعمی حرج) الآیة ٦١سورة النور[3]

٢-لێ وەرگرتن لەفەرموودە وەكو مەحوی دەڵێ :

سبیەینێ (یحشرالمرء)ە براگەڵ فرسەتە ئەمڕۆ

تەبەڕابن لەمن باكەس نەبێ حەشری لەگەڵ حەشرم

(یحشر المرء) بەشێكە لە فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) (یحشر المرء مع من أحبّ ) مەحوی وەری گرتووە و لەگەڵ دێڕە شیعرەكەی خۆی تێكهەڵكێشی كردووە.[4]

---

[1] الایضاح /خطیب القزوینی٥٧٥

[2] جواهرالبلاغة/أحمد/ الهاشمی أحمد الهاشمی ل ٤١٤

[3] دیوانی حەمدی/ جمال محمد محمد أمین/١٨٦

[4] دیوانی مەحوی لێكۆڵینەوەی مەلاعبد الكریمی مدرس/٢٣١

## لێ وەرگتنی ئایەت یافەرمووده بوپەخشان:

### وەرگرتنی ئایەت بۆپەخشان وەکو:

ئەوانەی کەرێگای چاکەیان گرتووە ئەوچاکە کردنە وەنەبێ هەر بۆخەلك بێ، بەلکو نەفعەکەی بۆ خۆی زیاترە ((إن أحسنتم أحسنتم لأنفسكم )) خراپەکردنیش ئەگەر بیکا بۆخۆی دەگەرێتەوە ((إن أسأتم فلها ))[1]

### وەرگتنی فەرمووده بۆپەخشان وەکو:

بەنی ئادەم نابی وابزانی گیان لەبەرێکەو هیچی تر،بەلکوگیان لەبەرێکە– جگە لە مێشکەکەی - هەموو(کان)یکیشی تێدایە (الرجال معادن))لە ئەرزا ئاسن و گوگردو خوێ و شتی تر هەیە لە میشا هەیە.[2]

## تێهەلکێش:التضمین

تێهەلکێش: ئەوەیە شاعیر شیعرێك یانیوە شیعری شاعیرێکی ناودار تێکەلێ بە شیعرەکەی خۆی بکات، ئامازە بە وەرگرەکەی بکات بەخستنەناو کەوانە ئەگەر شاعیرەکە ناسراو نەبوو لەلایان ڕەخنەگران و شارەزایان،[3] وەك ناری نیوە هۆنراوەی (تاهیربەگ)تێهەلکێش بەشیعرەکەی خۆی دەکات و دەلێ :

---

[1] خوشخوانی/علاْ الدین سجادی/١٥٤

[2] خوشخوانی/١٥٦

[3] خوشخوانی/١٥٦

له ڕووی ئەو ماهەدا وەستام بە نائومێدی وخەم باری
((شکاندی پەنجەکەم تامن نەنووسم وەسفی ڕوخساری))([1])

یاوەك مەحوی دەڵێ :

تۆمەڵێ یەك مەرتەبە سەد مەرتەبە
((دوشمن دانا بەأز نادان دۆست ))([2])

تێهەڵکێش وەك لە شیعر دەبێ لەپەندی کوردی و پەخشانیش هەیە :

محسن دەڵی :

(کۆتك باش بگرە، با لێی نەڕژێ)
لە دوا کە ڕژا، بۆچی نەپرژێ
زۆرداریت بوێ، بگری و بکوژی([3])
دەبێ بزانی، تووش دەبێ ڕۆژێ

## جیاوازی نێوان لێ وەرگرتن وتێکهەڵکێش

١- لێ وەرگرتن لەهۆنراوە و پەخشان بۆجوانی و پیرۆزیە.لێ وەرگیراویش بەزۆری لەقورئان و فەرموودە دەبێ.

٢- تیکهەڵکێش لەنیوە دێڕێکی هۆنراوە کەمترنیە، وەرگرتن تەنیا بە پارچەیەك دەبێ،بێ ئەوەی هێما بەوەرگیراو بکرێ.

---

[1] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الكريمی م
[2] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبد الكريمی مدرس ل ٣٣٠
[3] گوڵزاری هۆنراوە محسن أحمد

**لەجۆرەکانی جوانکاری واتایی :**

١- پۆشین / التورية

٢-جوانی هۆکار /حسن التعليل

٣-پێچان و کردنەوە/اللف والنشر

٤- دژیەك/الطباق

٥- جێ گۆرکی /العكس

٦- تیل نیشان/التلميح

٧-پێکەوەگونجان /مراعاة النظير

٨-کۆکردنەوە/ الجمع

٩-لێك کردنەوە/التفريق

١٠-تیل نیگا/الآلتفات

١١- ڕاڤە/التفسير

١٢-بەرامبەری /التقابل

١٣-زیادەرەوی/المبالغة

١٤-بادانەوە/الرجوع

١٥-دابەش کردن/التقسيم

١٦- بەدی کردن/الآرصاد

١٧- خۆبێ ئاگا کردن/تجاهل العا رف

١٨- بەکارهێنان/الآستخدام

١٩- جەختی ستایشی لەزەم چوو/تأكيد المدح بما يشة الذم

٢٠- جەختی زەمی لەستایش چوو/ تأكيدالذم بمايشبة المدح

٢١- جووتبوون/ ألمزاوجة

٢٢- ئاڕاستە/التوجيه

٢٣ – شیوازی دانایی /ألأسلوب الحکیم

٢٤– ڕووتەوەکردن/التجرید

## پۆشین /التوریة

پۆشـــین:یەك لـــەو هونەرانەیـــە کەلـــە جوانکـــاری واتـــایی بەکارهاتووە،شاعیرە وردبین و بەتواناکان شیعرە کانیان پێ ڕازاندوتـەوەو، زۆریشـیان بـەجوانترین شـێوەکانی هونـەری جوانکاریـان دانـاوە، شـاعیرە بەناوبانگـەکانی میسـر و شـام لەسـەدەی شەشـەم و حەوتـەم و هەشـتەمی کۆچی، ئەم هونەرەیان زیاتر بەرەو پێشەوە بردووە و ڕوبەرەکەیان فرەوان کردووە،کردویانە بەپێشانگایەکی گوڵ و گـوڵزار، یـەك لەئـەدیب و زاناکـانی شـــام (قاضـــی فاضـــل)ی وەزیـــرو نوســـەری(صـــلاح الـــدین الأیوبی)بوولە٥٩٦کۆچی دەرگای ئەم هونەرەی بۆکەسانی سەردەمی خـۆی کردەوە.[1]

ئـەدەبی زمـانی کـوردی ئێمـەش لـەم هونـەرە بـێ بـەش نـەبووە، زۆر لەپەخشـان نـووس و شـاعیرە بـە تواناکـانی وەك جزیـری ونـالی و خـانیَ و مەحوی و زۆرانی تر، دەربڕین و گوزارشتیان لەم ئاریشگایە زۆر بـەجوانی و ڕێکو پێکـی بـووە، بـێ ئـەوەی کارلـە واتـا ڕەوانبێژیەکـەی بکـات، چـونکە زیادەڕە ویی لەبـەکارهێنانی ئـەم هونـەرە لـەڕێگای خۆپێـوە مانـدوکردن و کردنی بەوەرزشێکی زیهنـی دەبێتـە هـۆی ئـەوەی کـار لـەواتاو مەبەسـت و هونرەکانی تری ڕەوانبێژی بکات، بۆیە دەبێ بەکار هێنـانی ئـەم هونـەرە و

[1] علمالبدیع/ د. عبد العزیزعتیق ل١٠٢

زۆری تر لە هونەرەکانی جوانکاری هاوسەنگی بۆ ڕابگیریێ لەبازنەی سروشتی خۆی دەرنەچی.

## پێناسەی پۆشین :

ئەم هونەرە لەلایان زانایانی ئەم بوارە پێناسەی زۆری بۆ کراوە، گەر بەپێناسەکانیشیان دابچینەوە دەبینین بەزۆری لەبازنەی واتای یەك پێناسە کۆدەبنەوە منیش لە ژێر تیشکی ئەم پیناسانە بەم شێوەیە پێناسەی دەکەم .

پۆشین: ئەو تاکە وشەیە لە ڕستەدا دوو مانا بەخۆیەوە هەڵبگری یەکیان نزیك و دیار، مەبەست نەبێ،ئەوەی تریان دوور بێ بەڵام مەبەست بێ.[1]

ئەوەی پێویستە بەپرسیارکردن ئەو وشەی دوومانا بەخۆیەوە هەڵدەگرێ هەردوو ماناکە دەبێ مانای ڕاستەقینەبن،یان دەبێ مانایەکیان ڕاستەقینەو ئەوەی تریان خوازەیی بێ ؟ زانایانی ڕەوابێژی دەڵێن: دوو مانای ڕاستەقینە، یان یەك ڕاستەقینە ئەوەی تریان خوازەبێ، ئەو دوومانایەش یەکیان نزیك بێ واژەیەك ئاماژەی پێ بکاو مەست نەبێ ئەوەی تریان دووربێ و ئاماژەی ڕوونی بەرامبەر نەبێ و مەبەست بێ.[2] بەپێی ئەم ڕایە دەشێ یەك لەماناکان خوازە بێ نموونەش بۆ ئەم ڕایە :

مەحوی دەڵێ :

وەنەوزیکم شەوێ داو گەییە سەرم و
وتی: هەستە هەتاوت وا لەسەرکەوت

---

[1] هەمان سەرچاوە ل ١٠٢

[2] عبد الرحمن حسن (حبنكة)البلاغة العربية أسسها وعلومها /ئەنترنیت

((واتە: شەوێکیان وەنەوزێکم داوخەوالوبووم، یارهاتەسەرم و هەڵی ساندم وتی: هەستەخۆر هاتەسەرت و هەتاو لێی دایت مەبەستی لەخۆرو هەتاوەکەخۆیەتی))[1]

وشەی (هەتاو) دوو مانا بەخۆیەوە هەڵدەگرێ:-

١- مانایەکی نزیك واتەتیشکی خۆر

٢- مانایەکی دووری خوازەیی چواندنـ خواستنی ئاشکرا(ألإستعارة المصرحة) واتە: یار.(هەتاو) خواستراوە(مستعار)ە(یار) بۆ خواستراوە(مستعارله)واتەناوی‌پێ چوێنراو (مشبەبە) هاتووە کە هەتاوە، ناوی چوێنراو(مشبە)نەهاتووە کەیارە،ئەمەش واتە مەبەست لە هەتاو مانا ڕاستەقینە کەنییە،کەتیشکی خۆرە،بەڵکو مەبەست یارە کەوەك تیشکی خۆر وایە لەڕووناکی و درەوشانەوە دا، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیەدەڵێ:(وەنەوزێکم شەوێ دا) وەنەوزە کە لەشەو بێ دەبێ مەبەست یاربێ ،چونکەخور هەڵاتن و هەتاو لە کاتی شەوان ڕوونادا،بەم شێوەیە دەرکەوت پۆشینەکەمان لە نێوان مانای دروست و خوازە دابوو دروستەکە،کە مانا نزیکەکەیە ( هەتاوی ڕاستەقینە) ـ واژەی بەسەرکەوت ـ ئاماژەی پێ دەکات،مەبست نییە مانا دوورەکە مەبەستە، کە (یارە) پۆشینەکەش پالآوە،چونکە وشەی شەوکەلەپێشەوە هاتووە پەیوەندی بە مانای نزیکی هەتاوەوە هەیە.

---

[1] دیوانی مەحوی لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس/٨٧

## جۆرەکانی پۆشین : ألتورية

ئێمە لەوکاتە بەشیعری شاعیرانمان دادەچینەوە دەبینین پۆشین بەم شێوانەی خوارەوە هاتووە :

١–پۆشینی دیار(التورية ألمبينة): ئەو پۆشینەیە شتێکی لەپاش یان لەپێش لێ باس کرابێ پەیوەندی بەواتا دوورەکەوە هەبێ:[١]

ئەحمەدی خانێ دەڵێ :

هەرچەندە کوزامیری هەیم ئەز
سازەندە تویی وەکی نەیم ئەز

مانای وشە: سازەندە: سازلێدەر . سازکەر. نەیم : قامووشم .نیمە .

واتە هەرچەندە من لەبەرچاوان بوونم هەیە، بەڵام تۆی سازکەرو ئامادەکەری سازی ، من نەیم ـ قامیشم ـ یان من وەکونیم و نەبم وام .

لەم دیڕەدا وشەی (نەیم) دوومانای هەیە :

أ–مانایەکی نزیك واتەوەك نیم وەك نەبم ئەومانایەمەبەست نییە .

ب– مانایەکی دوور واتە: وەك نەیم. وەك قامووشم .ئەو مانایە دوورە مەبەستە پۆشینەکەش پۆشینێکی دیارە،چونکە لەپێش (نەی) وشەی ساز هاتووە، ئەم هەردوو کەش پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە، سازلەقامیش دروست دەکرێت.[٢]

---

[١] علم البد يع/ د. عبد العزيز عتيق ل٦٨

[٢] مە م وزین ئەحمەدی خانێ/پەروێزجیهانی بەرگی٢ /١١٥٤

٢- پۆشینی ڕازاو: التورية ألموشحة - پۆشینی پالآو- التورية المرشحة: ئەوەیە لەپێش یان لەپاش شتێك هاتبێ بەپەیوەندی بەمانا نزیكەكەوە هەبێ.[1]

نالی دەڵێ :

حاضـری ئـەمرو خیطـابـە دڵ ئەگەرچـی مەنهییـە
راجیعـی تۆیـە ضـە مـیری مـن، ئەگـەر چـی غائیبـە

حاضـر: ئامـادە .لـەعیلمی نەحویشـدا جـۆرە ضـە مـیرێـك و لـەعیلمی صەرفیشـدا جۆرە فیعلێكە. ئەمر: فەرمان.لـەعیلمی صـەرفیشـدا یەكێكە لەفیعلـەكان خیطاب: فەرمـوودە.لەعیلمی نەحویش جورە ضـە میـرێـك و لـەعیلمی صەرفیشـدا جـورە فیعلێكـە. مەنهی:مـەنع كـراو. لـەعیلمی صەرفیشدا جورە فیعلیكە.راجع: گەڕاوە.لەعیـلمی نەحویشدا ضە مـیرێكە بگەرێتەوە سـەرئیسمێك . ضە میر: جـورە وشـەیەكە لەجـیاتی ئیـسمی ظاهیر بەكاردێ.غائیب: نادیـار. لـەعیلمی نەحویشـدا جـۆرە ضـە مـیرێـك و لەعیلمی صەرفیشدا جـۆرە فیعلێـكە .

((واتە: دڵی من هەرچەندە وەصلی تـۆی لێ قـەدە غـەكراوە و نـابێ نزیـك بكەوێتەوە، ئامادەیە بۆ هەرجورە فەرمانێك چی پێ بلێی جێبەجێ ئەكا. ضە میری منـیش كـە ئـەبێ هـەر بۆخـوم بگەڕێتـەوە، بۆتـۆ ئەگەڕێتـەوەو بـوونی بەسـتەیە بـەتۆوە هـەر چـەندە لـەوەش كـەوتووە كـەبۆ خـۆم بـێ و سـەر لێ

---

[1] علم البديع د. عبد العزيز عتيق٩٧

شێواوو سەر گەردان بووە.چەند جوانە ضەمیرێ کەهی(من)ی موتەکەللیم بێ بگەڕێتەوە بۆ (تۆ)ی موخاطەب و خۆشی غایب بێ ))[1]

ضەمیری (من) لەم دێڕەشیعرەدا دوو مانای هەیە:

أ/مانایەکی نزیك کە جێناوی(من)ە.

ب/مانایەکی دوور واتە(دڵی من)

چەند شتێکیش هاتوون وەك( ئەمر)و(خیطاب) و(غائیب )سەر بە مانا نزیکەکەوەن، بەڵام ئەوەی لای نالی مەبەستە لەم دێڕەدا مانا دوورە کەیە .

٣– پۆشینی ڕووت وەکراو(التورية المجردة): ئەو پۆشینەیە هیچ شتێکی وای لێ نە هاتبێ سەربە مانا نزیکەکە یان دوورەکەوە بێ، هیچ پەیوەستێکی سەر بەم دووەشی لێوەباس نەکرابێ.[2]

ئەحمەد موختار بەگی جاف دەڵێ :

(بانگی کوردستانە) وادنیای ئیحیا کردەوە
زامی قەلبی کوردی بێچارەی موداوا کردەوە([3])

لە سەرەتای دێڕی یەکەم دەستەواژەی (بانگی کوردستانە) دوو واتا هەڵدەگرێ :

یەکەم: کەنزیکە کەیە واتەبانگی کوردستان بۆ سەر بەخۆیی و ئازادی مەبەست نیە.

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلاعبدالکریمی مدرس ل٤٠٠

[2] علم البديع (د. عبد العزيز عتيق)ل٩٦

[3] ئەحمەدموختاربەگی جاف/١٤٤

دووەم : دوورە کەیەتی واتە گۆڤاری (بانگی کوردستان)ئەوەیان مەبەستە.

ئەم پۆشینە بۆیە بەرووت دادەنرێ چونکە هیچ شتێکی لێوە نەهاتووە ئاماژە بەیەك لەو هەر دوو مانایە بکات .

٤- پۆشینی ئامادەکراو(التورية المهيأة): ئەوەیە لە نێوان دوو واژە دابێ یان لە نێوان واژەیەك و پەیوەستەکەی دابێ بە لاچوون ونەمانی هەریەك لەم دووانە یان پەیوەستەکەی، پۆشینەکەنەمینێ.[1]

## جۆرەکانی پۆشینی ئامادە کراو

أ-پۆشینی ئامادەکراو:التورية المهيأة :لەنێوان دوو واژە دا وەکو مەولەوی دەڵێ:

ئەیاز هەمرازی ناڵەو ئاخ و دوود
عەرزەش هەن وەخاك ئاسانەی مەحمود

ئەمە دێڕێکە لەم هۆنراوەیەی مەولەوی کە لەوە لاّمی مەحمودپاشای جاف نووسیویەتی .

(ئەیاز) وەزیرە بەناوبانگەکەی سولتان مەحمودکوڕی سوبوکتەگینی غەزنەوییە، مەبەستی مەولەوی لە ئەیاز خۆیەتی.(دوود) دووکەل. (ئاسانە)بەر دەرگا.[2]

---

[1] علم البد يع (د. عبد العزيز عتيق)ل٩٩

[2] دیوانی مەولەوی لێکۆڵنەوەی/مەلاعبد الکریمی مدرس ل ٤٨

لێره پۆشینی ئامادەکراو له نێوان دوو وشەدا دروست بووه، یەکیان (ئەیازه) ئەوەی تریان (مەحمود)ه

١–(ئەیان) واتایەکی نزیکی هەیە واتا وەزیری سولتان مەحمود، واتایەکی دووریشی هەیه واته مەولەوی خۆی ئەوەیان لێره مەبەسته.

٢–مەحمود بەهەمان شیوەی(ئەیان) واتایەکی نزیکی هەیە واتە: سولتان مەحمود، واتایەکی دووریشی هەیه ئەویش مەحمود پاشای جافە ئەوەیان مەبەسته.

ئێمەگەر یەکی لەم هەردوو ناوە(ئەیان) یان(مەحمود) لابەرین هیچ پۆشینێك نامینێ، کەوابێ بوونی ئەم پۆشینه بەستراوەتەوه بەبوونی دوو واژه، وەك ئەم نموونەیە،بەلاّم پۆشینی دیارو پۆشینی ڕازاو_ پالأوتە_ ئەو واژەی ئاماژە بەهەر یەك لەم دووانە دەکات بۆ بەهێز کردنیانە ئەگەر باسیش نەکرێن پۆشینەکان هەرهەیە،لەم نموونەی باسمان کرد ئەگەر ئەیاز باس نەکرابا بیرمان لەمانای دووەمی مەحمود نەدەکردەوه، ئەگەر مەحمودیش باس نەکرابا بیرمان له مانای دووەمی ئەیاز نەدەکردەوه .

ب–پۆشینی ئامادەکراو(ألتورية المهياة): بەواژەیەکی بەستراو بەشتێکی پێش یان پاش خۆی ئەگەر ئەوشته نەبێ پۆشینەکه دروست نەبێ.[1]

شێخ ڕەزا دەڵێ :

گەرچی هەژار و موفلیسه شێخ مامه سالم
نەمدی کەسێکی وەکو ئەو خاوەنی کەڕەم

[1] علم البد يع(د. عبد العزيز عتيق) ل١٠٠–١٠١

میــوانی بـــووم ، نـــان و کـــەرەی نـــایە بـەرم
ئێسـتاش بـەبێ موداهەنـە مـەمنوونی ئەوکـەرەم([1])

شـێخ ڕەزا کـە لـەکۆتایی ئـەم چـوارینە دەڵێ:(مـەمنوونی ئەوکـەرەم) دوومانای هەیە:

١-مانایەکی نزیکی هەیە واتە: مـەمنوونی ئـەو کەرەیـەم کەخواردوومـە لەلایی ئەو.

٢-مانایــەکی دووریشـــی هەیــە واتە:(شــێخ ســالم)ی بەکـــەرداناوە ئێمەکەسەرەنج دەدەین دەبینین پۆشـین لە(ئەوکـەرەم)دا بـەهۆی شـتێکی پێش خۆی دروست بووە،کە کەرەیە) ئەگەر ئەو واژەیە لابەرین پۆشـینەکە نامینێ.

حاجی قادردەڵێ:

نـــــالی أستــــــادەکی گــــــەڵێ چـــــابوو
خضـــــری ئـــــابی حــــــەیاتی مــــــەعنا بــــوو

وشەی (خضر) لەنیوەی دێری دووەم (تەورییە)یەو دوو واتای هەیە: یەکێکیان دوورو ئـەوەی تریشـیان نزیکـە، نزیکەکـە بۆحەزرەتی(خـدر) دەگەرێتەوە کە ئاوی حەیات و نەمری خواردۆتەوە زینـدەگانی هەمیشـەیی دەست کەوتووە .

مانا دوورەکەشی لەگەڵ خودو کەسـیيەتی نـالی خۆیـەتی، چـونکە وەك مەعلوومە (نالی)یش ناوی (خدر)ە، واتە:گەر حەزرەتی خدر بەگەیشتنی بـە

[1] دیوانی شیخ رەزا ل ١٩٢

ئاوی حەیات و خواردنەوەی نەمری بەدەست هێنابێ، مەلا خدری نالیش بە شیعرە پتەوو پڕ ماناکانی هەمان ئەو نەمریەی دەست کەو تووە)[1]

جوری ئەم پۆشینە ئامادەکراوە(ألتورية المهيأة)یە چونکە لە وشەی (خضر) پۆشین دروست نابوو ئەگەر واژەی( ئابی حەیاتی) بە دوواوە نەهاتبایە،ئەم واژەیە ئامادەکاری کردووە بۆ ئەوەی پۆشین لە وشەی (خضر) دروست ببێ.

## ڕاهێنان

جۆری پۆشین و مانای مەبەست لەم دێڕە شیعرانە دیاری بکە

١-دەورانییە وەك هێلەكی سەودا سەری گێژم

بۆیە بەدەقیقی مەثەلە هەرچی دەبێژم

نالی

٢-بۆکەرێ ئیعلانی حەربی کرد، لەگەڵما شێخ حەسەن

سەیری کەن یاران چ گوێبەندێکی گێڕا، ئەو کەرە

شیخ رەزا

٣-بۆچیمە ماڵ و چیمە بە بەحشی ژیانەوە

وەك نەخلی بەختی کوردە کە دیومە ژیانەوە

جێی حاکمانی بەبانی بەدەرویێشی دا زەمان

ڕێوی نەخاتە لانەی شێری ژ یانەوە

حەمدی

[1] ألا أيها الساقي ١١٨(عبدالله )خدر مه ولود (.د) لێکولینەوە ی ئەدەبی هەولێر ٢٠١٢

## جوانی هۆکار :حسن التعلیل

جوانی هۆکار:گۆڕینی هۆکاری تایبەتی دیاردەیە بەهوکارێکی تری جوان و گونجاو لەگەڵ مەبەست:[1]

## گرنگی جوانی هۆکار:

جوانی هۆکارلەو هونەرەجوانکاریانەیە شاعیران بایەخی زۆریان پێ داوەو شیعرەکانیان پێ ڕازاندوەتەوە،ئێمەگەر بەشیعری شاعیرانمان دابچینەوە دەبینین هۆکاری سەیرو سەر سوڕ هێنەریان بۆ دیاردەکانی ناوەرۆکی شیعرەکانیان هێناوەتەوە کەچێژ بەخشن بۆ گوێگرو خوێنەر، بۆیە گۆڕینی هوکاری دیاردە بەهۆ کارێکی تری سەرنج ڕاکێش دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەجوانی لەشیعرەکانیا سەیر بکرێ و هەستی خوێنەر بجوولێنی و توانای بیر قووڵی شاعیریش دیاری بکات .

## جۆرەکانی جوانی هۆکار

ئێمەگەربەشیعری شاعیرانمان دابیچینەوە جوانی هۆکاربەم شێوانەی خوارەوە دەبینین :

١- گۆڕانی هۆی تایبەتی دیاردە بە هۆیەکی تر: ئەمەشیان دووجۆرە:-

أ-هۆی دیاردەکە یان سیفەتەکەلەنەرێت باو نەبێ :

ئەدەب دەڵێ :

گریانی بەیانانی منە،عیللەتی خەندەت
مەعلومە کەپشکوتنی غونچە بەشەواوە !([1])

---

[1] جواهر البلاغة أحمد الهاشمي / ٢٧١

ئەدەب لەم دێرە شیعرەیدا گریانی لەکاتی بەیانیان کردووتە هۆ بۆ ئەوەی یاری پێبکەنی،بەڵگەشی بۆ ئەمە ئەوەیە دەڵێ: مەشهورە کە غونچە بە شەو ئاودان دەپشکوێ .

ئاشکرایە یاری(ئەدەب)وەك هەر مرۆڤێك پێکەنین و خەندەی هەیە،بەلاّم عیللەت و هۆی پێکەنین و خەندەلەوانەیە لەبەر زۆر شتبێ کە لەنەریت داباوە،بەلاّم (ئەدەب) هۆی پێکەنینی یاری گێڕاوە تەوە بۆ گریانی خۆی لەکاتی بەیانیان،چونکە غونچە بەشەواو دەپشکوێ.ئەم هۆیەش هۆیەکی ڕاستی و حەقیقی نییە،بەڵکو ئەدەب هەر بۆ جوانی دروستی کردووە .

ب– هۆی دیاردەکە یان سیفەتەکە لەنەریت باوبێ:

وەفایی دەڵێ :

دەم بەدەم سەرو و سنەوبەر وا کەهەردێن و دەچن
عاشقن، سەودا سەرن، مەجزوبی گوڵ بێ ئیختیار([2])

هاتوو چوونی سەرو سنەوبەر دیاردەیەکە هۆکەی دیارە کەبایە دەیان هێنی و دەیان با ئەمەش شتێکە لەنەریت باوە، بەلاّم (وەفایی) هۆیەکی تری لە جێگای هۆی ڕاستەقینە داناوەو دەڵێ : (عاشق و سەودا سەرن مەجزوبی گوڵ بێ ئیختیار) ئەم هۆیەش هۆیەکی ڕاستەقینە نییە، وەفایی تەنیا بۆ جوانی دروستی کردووە .

---

[1] دیوانی ئەدەب سعید نەجاری ل ١٠٢

[2] د یوانی وەفایی/ لێکۆڵینەوەی/محمد علی قەرەداغ ل ٤١

٢- وەسفێك یان شتێك نەچەسپاوبێ، بی چەسپێنی وەك :

أ-وەسفەكە یان شتەكە لەوانەبێ بچەسپێ :

مە حوی دەڵێ :

بۆیە ظوڵمەت پۆشە، نوری ئەهلی جەوهەر دەركەوێ
سەیری حەققی كەن،لەسەر ئەم ماه و ئەستێرانە شەو

((واتە: بۆیەشەو بەرگی تاریكی لەبەر كردووە، تا ڕۆشنایی قابیلەت داران دەركەوێ.نابینی شەو حەققی چەند بەسەر مانگ و ئەستێرەوە هەیەو ئەگەر ئەو نەبوایە،ئەمان تیشكیان نەدەدایەوە)).[1]

مەحوی كەدەڵی: بۆیە ظولمەت پۆشە، نوری ئەهلی جەوهەر دەركەوێ) ظوڵمەت پۆشی شەو بۆ دەركەوتنی نوری ئەهلی جەوهەر. هەرچەند لەوانەیە حیكمەتێك بێ لەو حیكمەتانەی كەخوای تاك و تەنها دەیەوێ، بەلاّم لەبەر ئەوەی بوونی ئەم دیاردەیە بەم شێوەیە لەلای هەموو كەسێك چەسپاو نییە، بەڵكو دیاردەیەكی فەلەكی یە مەحوی ویستوویەتی بی چەسپینی دەڵێ: (سەیری حەققی كەن لەسەرئەم ماه و ئەستێرانە شەو) واتە هاتنی شەو بۆ دەركەوتنی مانگ و ئەستێرە شتێكە چەسپاوە لەلای هەموو كەس كەوابێ بەهەمان شێوە شەو بۆ دەركەتنی ئەهلی جەوهەرانیشە.

ب-وە سفەكە یان شتكەلەوانەنەبێ بچەسپێ:

مەحوی دەڵی:

---

[1] دیوانی مەحوی لێكۆڵینەوەی مەلاعبدالكریمی مدرس ل٣٥٧

بریقـــەی بـــەرقی جیلـــوەی تـــۆ لەچـــاوی

نـــەدابێ، بـــۆ چـــیە ئاییـنەحەیـــران؟!

واتە((ئاوێنـە بـۆ چـی حـەیران و سەرسـام بـووە ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نییەکەتیشکی دەرکەوتنی تۆ داویە لەناو چاوی))[1]

مـەحوی کەدەڵێ:(ئاییـنـە حەیران)حـەیرانی و سەرسـامی سـیفەتێکە لەوانە نییە بۆ ئاوێنە ببێ بـەڵام مـەحوی هـەر بـۆ جـوانی ئـەم هۆیـەی بـۆ هێناوەتەوە .

---

[1] هەمان سەرچاوەل٢٤١

## ڕاهێنان

جۆری جوانی هۆکار(جوانی بایس) لەم دێڕەشیعرانەدا دیاری بکە:

١-ئەگەر زولفت وەکومن عاشیقی ڕووی تۆ نیە بۆچی
سەرپا، کەوتووتە بەر پێت ، دوست و دامانە

وەفایی

٢-مەه بەشەو هەڵدێ پەنا دەگریت و دەنوێتن بەڕۆژ
دابگاتە سیڕی پەچەی پەرچەم و وەسفی بڕۆی

نالی

٣-هێندە مونتەڤیری تۆبوو هەتا چاوی سپی
نەرگس،کەلەسەر یەك قەدەم و دیدە چەقیبوو

نالی

٤-لەخەوفی طەلعەتی ،ڕۆژ هەروەکو شێ
بە ڕوو زەردی هەڵات و کەوتە کێوان

نالی

## پێچان و کردنەوە: اللف و النشر:

پێچان وکردنەوە: ئەوەیەچەند وشەیەك بێنی ولەدوایش بۆ هەریەك لەم وشانە وشەی تربێنی، پەیوەندی بەوشەکانی بەراییەوە هەبێ بەبێ دەست نیشان کردن، لەبەرئەوەی گوێگرپێی دەزانی سەربەم وشەوەیە.[1]

پێچان وکردنەوە لەهونەرە جوانەکانی ڕەوانبێژی یە، شاعیرانی کوردی ئێمەش لەم بوارە بێ بەش نەبوونە توانیویانە وەك شاعیرانی نەتەوەکانی تردەست ڕەنگینی خۆیان لەم بوارە نیشان بدە ن، وەك ئەم شێوانەی خوارەوە بەکاری بێنن :

### ١- پێچان وکردنەوەی ڕێك/اللف والنشرالمرتب:

ئەوەیە: چەند وشەیەك بێنی لەدواییش چەند وشەیەکی تر بێنی، هەریەك لەم وشانەی دوایی سەربەیەکی بێ لەو وشانەی پێش خۆی بەپێی ڕێزبەندی.[2]

نالی دەڵێ :

ئەم ئە رضە مەزرعەی عەمەلەو گوڵخەنی ئەمەل
هێندی بووە بەمەسجیدو هێندێ بەمەزبەلە

مانای وشە: مەزرعە:کێڵگە.عەمەل:کار.گولخەن:توونی حەمام. ئەمەل:هیوا. مەسجید: مزگەوت

[1] جواهرالبلاغة أحمد الهاشمي ل٣٧٦

[2] هەمان سەرچاوە ل٣٦٧

واتە: (ئەم جیهانە شوێنی کردەوەیەو بنیادەم تەنیا بەکردەوە تیاسەر ئەکەوێ و بۆ هیواو ئاواتی ڕووت وەك توونی حەمام وایە چۆن و هەرچی تێ بخەی ئەسووتێ ئەمیش هەموو ئاوات و هیوایەکی تیائەبێ بەهیچ، وەك چۆن ئەم شوێنە بەنیازی پاکەوە خواپەرستی تیابکری ئەبێ بەمزگەوت و پیرۆزو بەرێز ئەبی)[1]

لە نیوەدێڕی یەکەم دەڵێ:(ئەم ئەرضە مەزرەعەی عەمەلە و گولخەنی ئەمەل) لە نیوەی دێڕی دووەمیش دەڵێ:(هێندێ بووە بەمەسجید و هێدێ مەزبەلە) مەسجید لەگەڵ مەزرەعەی عەمەل دەگونجێ .مەزبەلەش لەگەڵ گوڵخەنی ئەمەل.

٢- پێچان و کردنەوە بەشێوەیەکی نارێك /اللف و النشر الغیر المرتب :

ئەوەیە:چەند وشەیەك بێنی و لەدواییش بۆ هەر یەك لەم وشانەوشەی تر بێنی پەیوەندی بە بەراییەوە هەبێ بەبێ دەست نیشانکردن و بەرامبەر یەکتریش نەبن لە ڕێز بەندیدا.[2]

نالی دەڵێ :

بەناری عەشق ئاوی دڵ جەسەد وەك حەزرەتی موسا
طریقی بەحری فیرعەن و ڕەفیقی ئاتەشی طوورە

بەحری فیرعەون: ئەو بەحرەی حەزرەتی موساو پەیڕەوەکانی لێ پەڕینەوە و فیرعەون و کۆمەلەکەشی تیاخنکان. ئاتەشی طور: ئاگری نوری خودا کە بۆ حەزرەتی موسا دەرکەوت دای لە کێوی طورو سوتاندی .

---

[1] دیوانی نالی لێکولینەوەی مەلاعبدالکریمی مدرس/٤٦٧

[2] جواهرالبلاغة/ أحمد الهاشمی ل١٣٧٦

واتە: (بەم ئاگری عەشقەو بەم ئاوی چاوە کەلە قولایی دڵمەوە هەڵئەقولێ، لاشەم وەك حەزرەتی موسای لێ هاتووە، ئەبێ بەسەر جۆگای فرمێسکی خۆیا بپەڕێتەوە کەوەك بەحرەکەی فیرعەون وایەو ،لەگەڵ ئاگری دەروونیا بگەڕێ کەوەك ئاگرەکەی کێوی طور وایە )[1]

لەنیوەی یەکەمی ئەم دێڕەی سەرەوەدا هەر دوو دەستە واژەی(ناری عیشق) و(ئاوی دڵ) هاتون و لەنیوەی دووەمی دێڕەکەدا، یەکەم جار دەستەواژەی (بەحری فیرعەون) هاتووە کەسەر بەدووەم دەستە واژەی نیوەی دێڕی یەکەمە کە(ئاوی دڵ)ە هەر لەنیوەی دووەمی دێڕەکەدا دەستەواژەی(ئاتەشی طور) هاتووە کەسەر بە یەکەم دەستەواژەی نیوەدێڕی یەکەمە)[2]

٣- پێچان وکردنەوەی ڕێك وناڕێك/اللف والنشرالمرتب وغير المرتب :

ئەوەیە: پێچان وکردنەوەکە یەکەم جار بەشێوەیەکی ڕێك دروست ببێ بەپێی ڕێز بەندی، بەلاَم لە دوایی وشەی تر بێ ئەم ڕێز بەندی یەی نەمێنێ .[3]

نالی دەڵێ :

غوبـاری ئـەو شـەوو ڕۆژن ڕدێنـی مـاش و بـرنج
کەتێکـەڵن، شـەبەهی صـوبح و شـام و شـیرو قـیر

مانای وشە: ماش و برنج: ڕیشی ڕەش و سپی . شام : ئێوارە.

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلاعبدالکریمی مدرس ل٤٦٧

[2] هونەری ڕەوانبێژی عبدالسلام سالار ل١٧٧

[3] علم البديع /د.عبد العزيز عتيق ل١٣٧

((واتە تۆزو گەردی ئەو شەوو ڕۆژەی ژیانمە کاری کردووە تە سەرو ریشم و،بۆزی کردووە کردوو یە بەماش و برنج، مووی ڕەش و سپی تیا تێکەڵ بووە، وەك تێکەڵی( بەیانی) و (ئێوارە) واتە: شەوو ڕۆژ،لەیەکەوە نزیکی (شیر) و (قیر) کەبەدیمەن تەنها پیتێکیان لە یەك جیایەو لەڕاستیشدا یەکێکیان سپی و ئەویان ڕەشە.))[1]

لەنیوەی دێڕی یەکەم وشەی (شەو) و وشەی (ڕۆژ) لەسەرە تاوە هاتوون، لە دوای ئەم هەردو وشەیەش(ماش)و(برنج) هاتوون ماش بەرامبەر بەشەوو برنج بەرامبەر بە ڕۆژ، پەیوەندی یان بەڕێکی هاتووە ، بەلآم لە نیوەی دێڕی دووەم ئەو ڕێکی یەنەماوە (صوبح) بەرامبەربە (ڕۆژە) (شام) بەرامبەر شەوە،بە هەمان شێوە لە(شیر) و لە(قیر) شیر بەرامبەر بە(ڕۆژ) و (قیر) بەرامبەر بە(شەو) هەرچەندە هەست بەپەیوەندی نێوانیان دەکرێ، بەلآم ڕێزبەندی لە نێوانیادا نەماوە.[2]

## دژیەك ( الطباق )

دژیەك: کوکردنەوەی دوو واژەی دژ بەیەکە لە واتادا.[3]

یەکیکی ترمان لەو هونەرانەی کە لە هونەری جوانکاری دا بەکاردێ دژ بەیەکە،وەك دەبینین ئەم هونەرە گوڕەپانێکی گەورەی لە شیعری شاعیران گرتووە و، توانای زۆری ئەو شاعیرانەی دەرخستووە لەبایەخدان بەڕوخساری شیعر،ئەگەر دوومانا دژ بەیەکەکە لەنێوان دوو واژەی ئەرێی دابوون، دەبێ بەدژبە یەکی ئەرێ (طباق الایجاب).ئەگەر هات ودوومانا دژ

---

[1] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلاعبدالکریمی مدرسل٢٠٨

[2] هونەری رە وانبێژی/ عبد السلام سالارل١٧٨

[3] بلاغة العرب /د.علی سلوم/٢٣٥

بەیەكەكەش لەدوو واژەی ئەری و نەریێ دابوون ئەواپێی دەلێن دژیەكی نەریێ(طباق السلب). ئەوەیە كە وشەیەك لە هەردو وشەكان بەهۆی ئامرازی وەك (نە)و(نا)و(مە)ببیێ بەنەریێ (نفی) .

### جۆرەكانی دژبەیەك

**یەكەم: دژبەیەكی ئەریێ ( طباق الایجاب )** وەك ئەم شێوانەی خوارەوە :

أ/ دژیەكی لەنێوان دوو ناودا :

صافی دەڵێ :

ڕۆژانە فیكری عاریضی خۆراكی من خوێنی دڵە
شەو بەیادی زولفەكانی نووستنم بیداری یە[1]

(ڕۆژ) و(شەو) هەردو كیان ناون دژە واتان .

ب/ دژ بەیەكی لە نێوان دووكار :

نالی دەڵێ:

صاف و ڕەوان و نەرمە وەكو زەمزەمزەم و فوڕات
نەك ڕەنگی نیلە كەهات و گەڕایەوە [2]

(هات ) و (گەڕا یەوە) هەردوو كیان كارن دژە واتان .

ج/ دژیەكەكان دووئاوەڵناوین :

شێخ نوری دەڵێ:

---

[1] دیوانی صافی/لێكۆڵینەوەی محمدی مەلا مصطفی هیرانی/٢٣٩

[2] دیوانی نالی لێكۆڵینەوەی مەلا عبد الكریمی مدرس/٥٥٣

بەســـــروە دڵـــــم فێنـــــك كـــــاتەوە
خـــــەمی كــــۆن و نــــوێم لەبیرباتـــــەوە([1])

(كۆن) و (نوێ) ئاوەڵناوی چۆنێن دژ یەكن .

د/ دژیەكەكان دوو چاوگ بن:

شیخ نوری دەڵێ:

لـەززەتی مـردن بەسـەد سـاڵی ژیـان نـا گۆڕمـەوە
گـەر بـزانم تـۆ لـە گـەڵما دێیتەسـەر قـەبرەكانم([2])

(مردن) و (ژیان) هەردوكیان چاوگن دژ یەكن :

هـ/ دژ یەكەكان پیتی مانایی بن:

محسن دەڵێ :

دەمـــت نوقتـــەی نیـــگاری مـــانی یـــە !
وتـــی: نـــا ئـــەم وەســـفە بـــۆم چـــانی یـــە
وتم: نوقتـــەی دەمـــت، نـــاكرێ وەســـفی،
وتـــی: ئاتـــۆ لـــە توانـــاتا نیـــیە !([3])

(نا) و (ئا) هەردوكیان پیتی مانایین دژ بەیەكن .

ز/ دژ یەك لە نێوان دوو ڕستەی واتایی دا:

نالی دەڵێ :

---

[1] دیوانی شیخ نوری شێخ صالح/١٩٥

[2] دیوانی شیخ نوری شێخ صالح/١٨١

[3] گوڵزاری هۆنراوە/محسن أحمد مصطفی/ دەستنووس

بیـــده بەدڵـــم، شیفتەبـــۆ شـــیفتە چاكـــە..
بیخـــەملم ،ئـــەو قەیـــدە بـــە دێوانـــە ڕەوایـــە..

شیفتە:شێواو.ئاڵۆ ز. قەید: كوت . ڕەوا: شایان .

واتە((ئەو زولفە شێواوەت ببەخشە بەدڵم، چونكە ئەوشێواوە و دڵی منیش شێواوە، شێواو بۆشێواو چاكە.ئەو زولفەی وەك كوت و زنجیرت بخەرە ملم، چونكەمن دێوانەو شێتی تۆم دیوانەو شێتیش شایانی ئەوەن كوت و زنجیریان لەملێ بكرێ.))

نیوەی یەكەمی ئەم دێڕە نەرمی و خۆشەویستی و بەزەیی دەگەیەنێ، نیوەی دووەم گرفتاری و ئازار دەگەیەنێ بۆیە بەدیمەن هەردوو ئەم دوو نیوەدێڕە دژ واتان.[١]

**دووەم: دژیەكی نەرێ :طباق السلب :**

بەكار هێنانی دوو واژەیە لەڕستەدا یەكێكیان ئەرێ یەكیان نەری (نفی) بێ[٢] بەهۆی ئامرزی وەك: (نە) (نا) (مە) وەك :

١–وشە دژیەكەكان ناوین :

نالی دەڵێ:

ســـەفەرمان چـــونكە ڕێـــی هـــات و نەهاتـــە
دوعامـــان بـــۆ بكـــەن ، ئێـــوەو خـــوداتان![٣]

---

[١] دیوانی نالی لێكۆڵنەوەی ملا عبد الكریمی مدرس/٥٦٤

[٢] البلاغةالواضحة على الحازم ومصطفى أمين/٢٨٠

[٣] دیوانی نالی لێكۆڵینەوەی مەلاعبدالكریمی مدرس ل ٣١٩

(هات) و نـەهات) لـەنیوەی دێـڕی یەکـەم دوو نـاوی واتـایین یەکـەمیان ئەرێ و دووەمیان نەرێ یە .

٢–وشه دژ یەكەكان كار بن :

مەحوی دەڵێ:

سەرو سامانت پرسی، مەپرسە
سەری تۆخۆش، نەسەر ماوە نەسامان([1])

(مەپرسە) دژ بە(پرسی)یە بە هوی ئامرازی (مە) هەر دوكیشیان كارن.

٣– وشه دژ یەكەكان هەردووكیان ئاوەڵناوبن :

ئەحمەدی خانیَ دەڵێ:

جیاواز دەبوو گفتی پاك و ناپاك
پڕ نرخ بەڕێز دەبوو شتی چاك([2])

(پاك ) و(ناپاك) دوو ئاوەڵناون یە كەمیان ئەریَ ئەوەی تریان نەری یە.

[1] دیوانی مەحوی/ لێكوڵینەوەی مەلا عبدالكریمی مدرس ل٢٤٣

[2] مەم و زین/و.هەژار موكریانی ل٢٥٠

## ڕاهێنان

جۆرەکانی دژیەك لەم دێڕە شیعرانە خوارەوە دەربێنە :

١-ئەوی دڵدارو دولبەرمە ئەوا دەڕوا لەبەر چاوم
بە دوویا بۆچی دڵ نەتوێتەوە نەڕوا لەبەر چاوم

مەحوی

٢-لەپاداشی قسەی سەردا هەمە ئاه و هەناسەی گەرم
کەسێ شێتانە بەردم تێ گرێ ، من بەرقی تێ دەگرم

مەحوی

٣-ڕوح لەسەر لێوم نەفەس گێڕە لەنێو خەوف و رەجا
چاوەڕێی فەرمانی تۆیە: بچێ یە دەر یابێتە ژوور

وەفایی

٤-دەردی دووریم چەشتووە ژەهری فیراقم نۆشی یە
بۆیە کەخۆشیم نەخۆشی و نەخۆشیم خۆشی یە

صافی

٥ -خەریکی شەش دەری هات و نەهاتم
خەلاصیم قەت بۆنییە لە نەردە بێ تۆ

نالی

٦-من دەڵێم شەویوو بە ڕۆژ ، نەسم دەڵێ ڕۆژ بوو بەشەو
ئەو موصیبە، چونکە چاوی پێ سپی بوو من غەڵەگ

نالی

٧-تاڵ وشیرین پێکەوە چابێ نەمدیوە چابێ چانەبێ
هەر کەسێکی هەمنیشینی چانەبێ پێت چانەبێ

حەریق

## جێ گۆڕكێ: العكس

جێ گۆڕكی: گێڕانەوەی بەشی دوایی گوزارشتەیە بۆبەرایی و بەراییش بۆ دوایی.[1]

شێوازەكانیشی لەهونەری كوردی وەك ئەم شێوانەی خوارەوە دەبی:

١–جێ گوڕدراوەكان ناوبن :

محسن دەڵێ :

دمـــــت نـــــوقتەی نیگـــــاری مـــــانی یـــــە !
وتـــی: نـــا ئـــەم وەســـفەت، بـــۆم چـــانی یـــە
وتم: نوقتـــــەی دەمـــــت ناكـــــرێ وەســـــفی
وتـــی : ئـــا تـــۆ لـــــە تـــواناتـــا نییـــــە ![2]

لەدێڕی یەكەم دەم لەپێش نوقتە هاتووە،لە دێڕی دووەم نوقتە لەپێش دەم هاتووە هەردووكیشیان ناون.

٢–جێ گۆڕین لەنێوان دوو ڕستەی تەواوبێ :

محسن دەڵێ:

گـــولّی وتم تـــــۆ ، وتـــــی گـــولّی چـــی؟!
كـــەی لەوســـــفی مـــن ســـــەرت دەردەچـــی!
بـــــەتۆ نـــــاكرێ پێنـــــاسی جوانیـــــم

---

[1] جواهرالبلاغة/احمد الهاشمي/٣٩٢

[2] گولزار هۆنراوە/محسن أحمد مصطفی / دەستنووس

هەرچەند لەدەریای خەیاڵ ڕوبچی!([1])

لەدێڕی یەکەمی ئەم چوارینە پێچوانە هەیە(گوڵی وتم تۆ، وتی گوڵی چی)؟ (جارێك گوڵ لە پیش کاری (وتم) هاتووە جارێکیش لە دوواوە هاتووە.

٣- جێ گۆڕین لەنێوان دوو ڕاناودا :

نالی دەڵێ :

لەکن تۆ خارو خەس گوڵزارە بێ من
لەکن من خەرمەنی گوڵ خارە بێ تۆ([2])

(لەنیوەی یەکەمی ئەم دیڕەدا نالی هەردوو ڕاناوی(تۆ)و(من)ی هێناوەتەوە ولە نیوەی دووەمی هەمان دێڕدا دیسان هەردوو ڕاناوەکەی هێناوەتەوە بەڵام پاش و پێشی پێ کردوون،لەنیوەی یەکەمی دیڕەکەدا ڕاناوی( تۆ)پێش(من) کەوتووە و لەنیوەی دوایی دێڕکەدا ڕاناوی (من) پێش (تۆ)کەوتووە )

٤- جێ گورین لەنێوان ناوو ڕاناودا :

نالی دەڵێ :

ئەو ڕووی لەکەعبە،کەعبە بەڕووی ئەوموشەڕفە
یەعنی جەبینی قیبلەو میحراب و مینبەرە([3])

لە نیوەی یەکەمی ئەم دێڕە ی سەرەوە دا، (نالی) ڕستەی (ئەو ڕووی لەکەعبە) هێناوەتەوە ڕاناوی(ئەو)ی پێش کەعبەخستووە و بەدووای ئەم ڕستەیەدا، رستەی (کەعبە بەڕووی ئەو موشەررەفە)ی هێناوەتەوە و

[1] گوڵزاری هونراوە/محسن أحمد مصطفی/ دەستنووس

[2] دیوانی نالی لێکۆڵینەوەی مەلاعبد الکریمی مدرس/٣٨٢

[3] هەمان سەرچاوە /٤٢٩

تێدا(کەعبـــــــە)ی پـــــــێش ڕاناوی(ئەو)خســـــــتووە،جێ گـــــــۆڕکێی لەنێوان(ڕاناو)و(ناو)داکردووە.

## ڕاهێنـان

جێگای جێ گۆڕکێ لەم شیعرانە دیاری بکە

١-بەنەشئەی سستی یو مەستی وەها مەستتور و مـەخمووره
نـزانم خـەو لـە چـاو دایـە، یـا چـاوت لـە خـەو دایـە

نالی

٢-من دلێم شەو بوو بەڕۆژ،نەفسم دەلێ ڕۆژ بووبەشـەو
ئەو موصیبە ،چونکە چاوی پـێ سپی بـوو مـن غەلـەط

نالی

٣-حـــەرەکاتم ســـەکەنات و ســـەکەناتم حـــەرەکات
چوسـتە، سسـتی قوییـە ضـعیف و ، سـەریعە کەسـەلم

نالی

٤-بچووك هەر کاری گەورە و گەورە کاری بچووکی کرد
خەریکی مەبحـە ثـی گـەورە و بچـووکی وەخـت و ئـاوانم

حەمدی

